حەکیم کاکەوەیس

# مەملەکەتی سەگەکان

چیرۆک



هەولێر ٢٠١٧

کۆچیرۆک

# مەملەکەتی سەگەکان

حەکیم کاکەوەیس

ئەم چەپکە چیرۆکە، چەپکێ ژانە و پێشکەشە
بەو کوردەی ژنە تالآنکراوەکانی هەموو
ئەنفالەکان بە شەرەفی خۆی دەزانێ.

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | : مەملەکەتی سەگەکان |
| بابەت | : چیرۆک |
| نووسەر | : حەکیم کاکەوەیس |
| پیتچینین و هەڵەچنی | : نووسەر |
| نەخشەسازی ناوەرۆک | : شاخەوان جەعفەر |
| نەخشەسازی بەرگ | : ئامانج ئەمین |
| تیراژ | : ٥٠٠ دانە |
| چاپ | : چاپی یەکەم - چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر/ ٢٠١٧ |
| نرخ | : ٤٠٠٠ دینار |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردن، (٤٧٤)ی ساڵی (٢٠١٧)ی پێدراوە

# پێشەکی

ڕەنگە من چیرۆکنووسێکی ناچاری بم. خوێندنی قوتابخانەم عارەبی بوو، بەڵام دەوروبەرم کورد و کوردی بوو. خاک کورد بوو و هەوا کورد بوو. ئەگەرچی هەموو جیهان، هەمان خۆر و مانگ و ئەستێرەی هەن، بەڵام ئەو خۆر و مانگ و ئەستێرەیەی کە لە من هەڵدەهاتن و لێم ئاوا دەبوون، کوردی گەرمیانی بوون. وەک خۆم. تەنانەت هەستم دەکرد تورکمان و عارەبی کەرکووک و ئەو دەوروبەرەش، بە خۆیان و قۆریات و عەتابەیانەوە، تورکمان و عارەبی کورد بوون. نازانم چۆن، بەڵام وام هەست دەکرد و ڕەنگە هەستکردنەکەم منداڵانە بووبێ. لە هەموو ماوەی خوێندنمدا، سێ یا چوار مانگی قوتابخانەی سەرەتاییم کوردی بووە . مامۆستاکانی ئەو ماوەیەم بیر ناچنەوە: مامۆستا ساڵح دزەیی و مامۆستا ئەحمەد ڕێداری، ڕەورەوەی خوێندن و نووسینی کوردییان دایە دەستم. «خوایە وەتەن ئاواکەی چەند دڵگیر و شیرینە» ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێتەوە و لە ناخەوە لە خودای خۆم دەپاڕێمەوە ئاوەدانی

بکا. «خوایە وەتەن ئاواکەی!»، دوایی بووە «نحن الشاباب لنا الغد» و وەک دارستانی چڕ و پڕ لە دڕندە، دەوری تەنیم و تا خۆم ڕانەپسکاند بەری نەدام. بەڵام کەی خۆم ڕاپسکاند؟. زۆر درەنگ. تازە ئێسک و خوێنم پڕ ببوون لە خەم و سەرشۆڕی. بەڵێ سەرشۆڕی. کێ تێمدەگا؟. دوایی بارودۆخ گۆڕا. ئێدی تورکمان تورکمانی کورد نەما و عارەب عارەبی کورد نەما. ئێمە، حەماڵ و بەقاڵ و گسکدەری شارەکەی خۆمان بووین و بۆ ئەوانمان خاوێن دەکردەوە. کۆڵی ئەوانمان هەڵدەگرت و پێڵاوی ئەوانمان بۆیاغ دەکرد. سووک سووک، خۆمان سووک دەکرد. بچووکی یەکەیەکەمان بوو بە بچووکی دەستەجەمعیمان و ئەمەشیان بووە بچووکی نەتەوایەتیمان. ئێمە، نەتەوەیەکی گسکدەر و بۆیاغچی بووین. ئێمە کۆیلە بووین. بەڵام شەرمەزار نیم چونکە یەک کەس نەبوو بە ئێمەی منداڵ بڵێ وا نابێ. فێرە نوێژ دەکراین. فێر دەکراین چۆن بە بیسمیللا جنۆکان بتارێنین و چۆن خۆمان لە ئەمن بپارێزین. فێر دەکراین چۆن درۆ لەگەڵ ئەمن و مامۆستا و خەڵکی نەیاردا بکەین تا پارێزراو بین. فێر دەکراین کار بکەین. فێر دەکراین ستالینمان خۆش بوێ. بەڵام قەت فێر نەدەکراین چۆن کورد بین. خوا هەقە لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا بە ناوی کوردایەتییەوە، چەند منداڵێکی شڕپۆش و چەتوون، دەچووین فنجانی دارتەلمان دەشکاند و لە نەورۆزیشدا ئاگری قاچاغمان دەکردەوە!.

دایکان و باوکان، خەنی لە خۆیان، کوڕەکانیان وەک بلبل تورکمانییان دەزانی و عارەبیش هەر مەپرسە!.

چ ڕێکەوتێک منی خستە سەر سکەی خوێندنەوە و نووسینی کوردی؟. کوردبوون بەڵا بوو بەڵام بەڵایەکی بە لەزەت. جەستەی ئازار دەدام بەڵام ڕوحی بەختەوەر دەکردم و بوونەوەرێکی بێ جەستەی مەلایەکەتانە لە ناو کەللـەسەرمدا، یا لە دڵمدا پەیدا بوو و بزەی دەهاتێ و بزەی دەخستە سەر ڕوخسارم. ئەدەبی زمانی زگماک چ جیهانێکە!. خۆ ئێستاش نازانم بە هیچ زمانێکی تر ئاخ هەڵکێشم یا ئۆخەی بکەم. بەڵێ کۆیلە بووم

بەڵام چرای سەرفرازی لە ناخمدا گەش گەش دەسووتا... وەک ئێستا. مادام هەست بە کۆیلەیەتی خۆم دەکەم بەسمە. ئێدی سەرفراز و ئازادم و ئەگەر بمرم، بە ئازادیی دەمرم. کێ لەو کۆیلانە کلۆڵترە کە هەست بە کۆیلایەتی خۆیان ناکەن؟. هەستنەکردنی کۆیلە بە کۆیلەیەتی، خۆی لە خۆیدا زنجیرێکی خۆکردی مەحکەمی کۆیلایەتییە بۆ لاق و پیل. سپارتاکۆس هەستی بە کۆیلەیی خۆی کرد بۆیە بۆ ئازادیخوازان بووە قوتابخانە.

ئەدەب گەمەیەکی سیحرییە و کەرەسەکەی زمانە و گۆڕەپانەکەی خەیاڵێکە ئاوێتەی واقیعە. من کە مەودای گەمەم بە کەرەسەی خۆم نەبووبێ، چۆن بووم بە چیرۆکنووس؟. خەڵکی کوڕی سەرکەوتنن، بەڵام من کوڕی شکستم. شکستی شۆڕشی ئەیلوول مراندمی و بە جۆرێکی تری دروستکردمەوە. وەک ئێستا، کە هەم، بەرهەمی ئەو تێکشکان و تێکشێلانەم. ئەو کارەساتە تێیگەیاندم کوردبوون یەعنی چی. زەلیلی یەعنی چی. یەخسیری یەعنی چی. خۆبەدەستەوەدان یەعنی چی. کوردبوون نوێژێکی بەژانە و دەسنوێژی بە هەمووکەس ڕاناگیرێ. خوایە چون دەسنوێژی کوردبوونی خۆمم ڕاگرت؟. چۆن توانیم، وەک کوردێک، لە هەموو تەمەنی کۆیلایەتیمدا بە یەک وشەش ناوی نەتەوەکەم و خاکەکەم نەپووشێنم؟. لە سەر بەرماڵی کوردایەتی، بە نووسین خودا دەپەرستم و دەیناسم و دەیناسێنم. تۆ بڵێی سەرکەوتوو بم؟!. تۆ بڵێی بەرهەمی شەونخوونی و شەونوێژی کوردبوونم لە ناو تەم و دووکەڵ و تەپوتۆزی جلیتبازانی سیاسەتدا کە هەر یەکە و پەلی بە دەستی نەیارێکی کوردەوەیە عیبرەت نەکرێ؟. هیوادارم چیرۆکەکانم لە قەرسیلیی دەرچووبن و هیچ (با)یەک لاریان نەکاتەوە. با بشکێن بەڵام نەچەمێن!. با نەبن بەڵام خوار نەبنەوە!. ئەم چیرۆکانەی توێی ئەم دوو بەرگە، بەرهەمی شکست و ڕەنجی زۆر ساڵانن. بەرهەمی دەربەدەری و دوورەوڵاتین. زۆریان لە گۆڤاری ڕابوون و خوێندکاری کورد و بەربانگ و گزینگدا، لە ئەورووپا بڵاو بوونەتەوە و هێندێکیان دووبارە

له کوردستان، به تایبەتی له گۆڤاری ڕامان و کاروان و ئاینده‌دا بڵاو کراونه‌ته‌وه. بڵاوبوونه‌وه‌ی به‌رهه‌م له ئه‌ورووپادا به ناچاری ده‌زانم. له لایه‌کی تریشه‌وه، نامه‌وێ چیرۆکه‌کان به په‌رته‌وازه‌یی بمێنن. پێم چاکه له توێی کتێبێکدا یه‌ک بگرن به‌ڵکو ئێهـ ، که‌سێ ویستی شتێکی چاک یا خراپیان له سه‌ر بڵێ یا بنووسێ!

با خوێنه‌ری به‌ڕێز له هه‌ڵه‌م نه‌بوورێ به‌ڵام هیوادارم ئه‌وه بزانێ که ئه‌و پشکۆیانه به پروشکی لێککه‌وتنی به‌ردی کۆیلایه‌تی و ئه‌ستێی ئه‌وینم بۆ ئازادی داگیرساون، بۆیه له خامۆشیی بێزارن و پروشکیان هه‌یه. ئێدی ئه‌وه ئێوه و ئه‌وه‌ش چیرۆکه‌کان... ئه‌وه‌ی بۆچوونه‌کانم به‌ره‌و ڕه‌گه‌زپه‌رستی و کۆنه‌خوازی و زره‌زاراوه‌ی ده‌ستی دووه‌م و سێیه‌می ئه‌ورووپا داده‌شکێنێ، دیاره له گه‌رمیانه‌وه دووره. به جه‌سته‌ش دوور نه‌بێ، ڕوحیانه‌تی لێیه‌وه دووره... دووسه‌د هه‌زار ئه‌نفالکراوی له لا سفره. ئه‌وه با بچێ وڵاتێکی تر بکاته وڵاتی خۆی و ژنێکی له دایکی خۆی جوانتر و چاکتر و شۆختر بکاته دایکی خۆی. کوردستان، ژێرده‌ست بێ یا سه‌رفراز، وڵاتی منه... دایکی منه... کیژێکی جوان و نازداری منه و عه‌سکه‌ری وڵاتان به به‌ر چاومه‌وه ئه‌تکی ده‌که‌ن. من ئاوها ده‌نووسم، چونکه هه‌موو کیژه فرۆشراوه‌کانم کردوونه‌ته کیژی خۆم... هه‌موو ژنه کوردێکی ئه‌تککراوی ده‌ستی عه‌سکه‌ری داگیرکه‌رم کردوونه‌ته خوشکی خۆم. ئه‌وه‌ی ئه‌م هه‌سته‌ی منی پێ ڕه‌گه‌زپه‌رستی و عاجباتییه، با ده‌ست بخاته ناو ده‌ستی ئه‌و عه‌سکه‌رانه‌وه... با ماچیان بکا تا له هه‌موو لایه‌ک کورسیی ده‌سه‌ڵات و پله‌وپایه‌ی بۆ واڵا بن و با به په‌له خۆی ده‌وڵه‌مه‌ند بکا... با ببێ به (وه‌فدی کوردستان)... با باڵ بگرێ و بفڕێ... مردوو نه‌بێ، کێ فڕی و نه‌نیشته‌وه؟

ح. ع. کاکه‌وه‌یس

# سێوەکە

دوای سیی ساڵ دابڕان گەڕامەوە. بە بیرەوەرییەکانمدا چوومەوە. کیژە نەشمیلانەکانی سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری و لاویێتیم بەسەرکردنەوە... هەر لە خەیاڵی خۆمدا بە سەرمکردنەوە و بە هەمان سام و شەرم و شکۆی جارانەوە بیرم لێ دەکردنەوە و زاتم نەبوو پرسیاریان بکەم: کوا سێوە؟.

سێوە؟!. سام گرتمی. ئاخر پیرەمێردێکی شەست ساڵەی کەنەفتی وەک من چۆن دەشێ لە بەردەم یادێکی وەها دێرین و بیرەوەرییەکی وەها دووردا سام بیگرێ؟. سێوە؟. یەکەم جار، دەتگوت هەر یەکەمان نیوەی سێوەکەی بەهەشتی دەرخوارد درا: لە دەم جۆگە ئاوەکەدا کایەمان دەکرد. سەرکە پیازێکمان کردبووە ڕەوڕەوە و ئاوەکە دیسووڕاندەوە. درزێ کەوتە یەخەی کراسەکەی و دیتم. سێوەکەم دەرخوارد درا و ئەویش ئەوەندەی بەس بوو هەست بە شڵەژان و داڕمان و کڵپەسەندنم بکا تا داڕمێ و کڵپە بسێنێ و بە گەڵا هەنجیری یەخەی کراسەکەی،

ئەو چووزەرە مێیاتییەی سەر سینگی خۆی داپۆشێ. سێوەش نیوەی سێوەکەی خوارد و بە جووتە لە بەهەشتی منداڵی وەدەرنراین و خۆمان لە سەرزەمینێکی قەفرای ترسهێنەری هەرزەکاریدا دیتەوە. ئای لە قەفرای جیهانی هەرزەکاری!. ئای لە ژیوانبوونەوەی سێوخواردن و بەزاندنی سنووری منداڵی و قەدرنەگرتنی بەهەشتی منداڵی!. کوا ناسکەی ناسکی مل بە خەناوکە و چاو بە کلی قیتوقۆزی دراوسێمان؟. لە کێ بپرسم؟. چۆن بوێرم ناوی بەرم؟. ناسکە؟. سام گرتمی. ڕستە زۆر کورت و بە چپەکانیم بیر کەوتنەوە: زیادەبرا ئەمشەو چاوەڕێی مەبە!... ناتوانێ!... هوائهوو! ناتوانێ و ئەهـ!... سبەی شەو بچۆرە لای کەلێنی دیوارەکە... ئا، لای تەنووربانەکە!.

کوان؟!. کوان ڕەوە کیژی بەهارانی ئاوایی، کە بە هەڵەتەکاندا پەرت دەبوون و زرینگەی بالۆرەیان بەهەشتی ساز دەکرد و گەڵای سەر عەیبی کوڕانی ڕادەماڵی؟. وەی تەمەنی لوولدراوم بەرەو کوێم دەبەی؟. وەی تەمەنی بەرەو گۆڕ داکشاوم بۆ کوێم دەگێڕیتەوە؟. ئەی تەمەنی بە ڕووی مەرگدا هەڵشاخاوم کێوە دەچیت؟. بۆ لە ئاستی ناوهێنانی کیژانی دەمی هەرزەکاریت وا سامگرتەیت؟. ئەدی ئەوانیش وەکی تۆ تەمەن لوولی نەداون؟. خۆ ناشێ ئێستاش قریوەی پێکەنین و زرینگەی بالۆرەیان بێت و داوەکانی هەناوت بپسێنن؟. بۆ ئەترەشت لێیان چووە و ترست ناڕەوێتەوە؟. هەر وا پێچی مێزەرێک بوو... یەک پێچ و ئێدی کۆتایی هات...

ـ خاڵە مێوانمان هات.

خوشکەزاکەم ئەوەی گوت. کە ڕۆیشتم، خوشکەکەم لەم کیژەی خۆی منداڵتر بوو. ئێستا پیرەژنێکی پانوپۆڕی دەمەوەرە. شەرم لە کەس ناکا. خەسووە... نەنکە... ترس دەخاتە دڵی نەوەکانی خۆیەوە. دەقیژێنێ و نێرەکەر بۆ دایکی نەوەکانی خۆی دەنێرێ و چ حسێبێ بۆ کاکی خۆی ناکا. ئای خوشکەکەم! چ قودرەت بوو لە دەرگای حەوشە دەرکەویت!.

ئێستا پەکت بەوە نەکەوتووە ئاخۆ من ڕازیم یا ڕازی نیم بچیتە بەغدا یا تاران یا پشتی حەوت دەریا.

- کێ؟.

لەگەڵ پرسیارەکەی خۆمدا خورپەم بە دڵدا هات. دڵی پیریش بەرگەی خورپە دەگرێ؟. هەر کێیەک بێ نابێ ژنییە داوەشاوەکانی دڵت ببزوێنێ. نەخێر سێوەش ناشێ لە خورپەیەکی پیرانە بەولاوە بە دڵە داتەپیوەکەت ببەخشێ.

هێشتا لە هەق و حسێبی پرسیاران نەبیبوومەوە، بەژنێکی کەتەی ڕەشپۆش دەرگای لێ تاریک کردم:

- پایزە برا!...

دەنگێکی گڕ، هەناسەی سوار و بانگێکی بێ باکانە ڕایچەناندم. ڕستەکە کورت بوو بەڵام بە چپە نەبوو... نە بە شەرم تەڕ کرابوو نە بە ترس کپ کرابوو. تەنها کورتییەکەی و کتوپڕییەکەی هی ناسکەی ناسکی مل بە خەناوکەی چاو بە کل بوو.

هەستام. وەژوور کەوت. وەک مامرە کڕی سەر بە مشکی، ڕەوێ کچی چاو بە کل و خەناوکە لە ملی بە بزەی شەرم و دوودڵییەوە بە دواوە بوو. پێکەنی. بەخێری هێنامەوە. ئەمە ناسکە بوو؟!. هەر لێگەڕێ لێ!. ئێستا نا کەمێکی تر، تلۆ تلۆ دادەڕمێ و تەنها هەیکەلەکەی بە پێوە دەمێنێ. تەمەنی خۆی پێچابۆوە. کچ و کچەزا و کوڕەزاکانی، چاویان بە کل و خەناوکەیان لە مل، هەر یەکەیان ڕۆڵی ناسکەی دەگێڕا: لێویان ئاڵ و مەمکیان قیت و کراسیان سوور و هەنگاویان ورد، بە ناو تەمی شەرم و هەزار و یەک ئارەزوودا هەوڵیان دەدا بگەنە ناسکە. ئەی خودایە!. ئەم هەوڵی پیربوونە بۆ؟. ئەم هەڵپەی بە کۆتایی گەیشتنە لە کوێوە دێ؟. بۆ هەر یەکە لە شانەکانی جەستە، لە سەردەمی سپێرمییەوە، ملی خۆی بەرەو کۆتایی دەشکێنێ؟!. ئای ناسکەی ناسک و کەوڕەوت و چاو بە کل! بووی بە حاجیش؟!.

چاوێکم بە کیژەکاندا گێڕا. خۆیان لە پەنای یەک نابوو... خۆیان بە یەکەوە نووساندبوو و پەردەی شەرم و سەرسوڕمانیان لە ئاستی پیرەمێردێکی ئەورووپانشین بە خۆدا دابوو. پڕ بوون لە پرسیاری نەگوتراو و دەرنەبڕدراوی بێ وەڵام. پڕ بوون لە حەزی قەدەغەکراو و بێ ئاکام. پڕ بوون لە تریقەی پێکەنین و بالۆرەی تاساو. هەر یەکەیان بە شێوەیەک لە شێوەکان، بە سەردەمی کچێنی ناسکە دەچوو، یەکێکیان نەبێ کە چاوە نەرمەکانی و لێوە گۆشتنەکانی، سێوەیان وەبیر دێنامەوە. بێ دەسەڵاتانە چاوم تێ بڕی. تا خوا پێی خۆش بێ یا ناخۆش، بێ شەرمانە لێی ورد بوومەوە... وردە وردە لە بەر چاوم دەبووە سێوە: سێوخواردنەکەی سێوەم تێدا دی. شەرمی ئەو و هێمنی ئەو و هەموو شتێکی ئەو، بە تامی گۆی مەمکیشیەوە، لەو جەستە منداڵەدا زندوو بوونەوە. سەرم ڕاوەشاند. دەتگوت ئەسپێکی پەککەوتەم: لای پاشەڵەوە سەگی برسی سەریان تێژەنیبووم، کەچی گوێم بۆ پاسکردنی مێش ڕادەوەشاند.

- ئەوە کیژەکەی سێوەیە.

کیژەکەی سێوە؟!. سێوە هەر بەخۆی بوو و زرپوزندوو و تەڕ و بڕ بەرانبەرم دانیشتبوو و بزەی دەکرد. ئەوەی لە سێوەدا هەبوو و لەو کیژەدا نەبوو، عەشقە ئاگرینەکەی بوو و هیچی دی. بزەم بۆی کرد. بزەی بۆ کردم. لە حاجی ناسکەم ڕوانی و بە هەزار بارە ترسەوە پرسیم:

- ئەدی دایکی؟. سێوە لە کوێیە؟.

وێرام... وێرام... وێرام وشەی «سێوە» بە زاری خۆمدا بێنم.

بەژنی باریک و مەمکی قیت و ڕوو لە ئاسۆ. نێوان هەردوو مەمکی، بە مەزەندەی من و بە پێوانە لەگەڵ سینگی ناسکەی ناسکدا کەمێ زیاد بەرین بوو. هەمیشە بە کاوە خۆ دەڕۆیی و لەنجەی دەکرد. بە پێچەوانەی ناسکەوە کە پەلەی بوو و گورج گورج هەنگاوی دەنا. تا لێویم ماچ دەکرد، دە جاران بە دەم هەناسەبڕکێوە پاڵی پێوە دەنام

ئەوجا مەودای یەک ماچی دەدا. سەد جار دەستم بۆ مەمکی دەبرد ئەوجا ڕێی دەدا دەستم بەر یەکێکیان بکەوێ. زۆری برد تا لێوارە ڕەقەکانی مەمکی لە بەر زەبری دەست و پەنجەمدا نەرم بوون. ڕام نەدەبوو و نەدەبوو. قژی خاو، بە پێچەوانەی قژە لوولەکەی ناسکەوە. کە دەستم بۆ قژی دەبرد، خاو دەبووەوە و چ بەرهەڵستیی نەدەکرد. نابەڵەد بووم و نەمدەزانی لە قژەکەیەوە دەست پێ بکەم. تەنانەت لە جێ ژوانیشدا پەلەی نەبوو. بە کاوەخۆ دەهات و بە کاوەخۆ ململانێی دەکرد و بە کاوەخۆ خۆی بە دەستەوە دەدا و بە کاوەخۆ جێی دەهێشتم. ئای سێوەی [illegible] بەر دڵان! دەبێ ئێستا ئەویش وەک ئەم حاجی ناسکەیە حاجی و داتەپیو بێ بۆیە ئەو کیژە کتومت سێوەیەی ڕەخساندووە یا هەمان سێوە[illegible] [illegible]قیت و ئارام بێ؟!. سێوە... وێرام... وێرام... وێرام. وەک ئەو [illegible] بۆ [illegible] [illegible]ماچم کرد و سەد جار لە بەر خۆمەوە گوتم: وێرام... وێرام. [illegible] [illegible]کەم ماچ. [illegible] خۆی لێ ون کردم. دە ڕۆژان، لە خەمی دۆڕاندنی ماچێک. [illegible]موقڵپ خۆی بە عەرددا دابوو. نەخۆش و پەشیمان، لە ماڵەوە دەرنەدەکەوت. ئەترەشم چوو: دڵی شکا؟!. لێم ڕەنجا؟!. هاوڕێی منداڵیم و دڵدارەکەی ئێستام ڕەنجا؟!. دوایی کە بینیم، بە کاوەخۆ بزەی کرد. هەناسەی حەوانەوەم هەواڵەی کرد... حەوانەوە و حەسانەوە. یەکەم ماچ یەکەم کارەساتی دوای سێوخواردنەکە بوو. فەلسەفەی ئیبلیس لەوێوە دەستی پێ کرد. سێو نەبوایە، دایکە حەوا و باوکە ئادەم، دەبوو ئێستاش لە دەم جۆگە شیری بەهەشتدا دانیشن و یاری بە سەرکەپیازێک بکەن و بیسووڕێنن و شوێنەواریان لە سەر گۆی زەویدا نەبێ. سوپاس بۆ سێوەکەت ئیبلیس!... سوپاس ئیبلیس!. سوپاس یەزدان کە تەکلیفی کڕنۆش بردنت لەو سەرشێتە یاخییە کرد، کە لە سەر داوای خۆشت داوای ڕەت نەکردیتەوە. قیرسیا لەم بوونەی من و با وەک ناسکە، تلۆ تلۆ هەڵوەرێم و هەر هەیکەلەکەم بمێنێ.

- ئەی نەتزانی؟!.

ئەی خودایە ئەم بۆمبایە چ بوو حاجی ناسکە لە ناو کەللـەسەریدا تەقاندمەوە؟. چم نەزانی؟!. دەبێ چ لە سێوە قەومابێ؟!. دەبێ مابێ و نەتوانێ پێ بە جەرگی خۆی و دڵە شکاوەکەیدا بنێ و بێتە بەخێرهاتنەوەم!. ناشێ یەکێ بێ لەوانەی کە دەرپێیان بە ئاریەلی تانکەکانەوە هەڵواسران و دوای ڕاپەڕین، دەرلنگیان ئەملا بردی و بە ئاریەلی جێبەوەی کرد و نافەکی ئەولا بردی و لە سەر بارەگای خۆی هەڵیواسی!. نەکا ڕاپەڕیوەکان لە ژێرزەمینە تاریکەکانەوە جلەکانی ژێرەوەیان ڕفاندبێ و دوای بێ تامبوون، دەسپەڕیان بە بۆنی شەهوەتی قەدیانەوە کردبێ!. ناکا یەکێ بێ لە زەماوەندی دەیەمی خۆیدا، لە سەر شانۆی هۆڵەکانی ئەورووپادا، بە گۆچانێکەوە لەگەڵ ئاوازی (گانەلهەوا) دا بە نیوەڕووتی بایبدا و پاشەڵی بە دامێنی هەتیوی سەرخۆشدا بسوێ و تا ناو پێڵاویان پێ تەڕ بکا و بداتە قریوەی پێکەنین!. نەڵێی یەکێکە لە فرۆشراوەکانی قوشتەپە!. ئەی خودا سێوە چی لێ هاتووە؟!. بە شێخ و میرەکانی ئەو خوارە نەفرۆشرابێ و لە هەموو سەرشۆڕییەکدا داوێناوداوێنی پێ بکرێ!. یەکێ نەبووبێ لەو گوڵانەی دەم ئاوەکەی هەڵەبجە و لە دوای هەموو کەتنێک و سەرکەوتنێکی ناوخۆییدا، بە یەخەی پەنجەبڕێکەوە هەڵراسرابێ!. نەبووبێتە دەنکە زیخێکی بیابان و تێکەڵی گەردەلوول بووبێ!. ئەی خودایە دەبێ سێوە لە ناو ئەو هەموو کارەساتانەدا تووشی کامەیان بووبێ؟!.

- چی؟!.

بە ترس و لەرزەوە ئەوەم پرسی. وێرام... وێرام... وێرام. منی ترسنۆکی بەزیو، ناوێرم پرسیاریشی بکەم. لە چارەنووسی سێوە دەترسم یا لە هی خۆم؟!. ئەگەر پرسیاری بکەم، وەک ئەو سڕنوگوم ناکرێم؟!. دەڵێی نامەوێ بزانم ئابڕووی براوە یا گیانی دەرهێندراوە. دەبێ سێوەی سینگ و مەمک پان و بەو دواییە نەرمونۆڵ چی لێ هاتبێ؟!. غیرەتم دایە بەر

خۆم و پرسیمەوە... بە دەنگێکی نووساو و ترساوەوە پرسیم:
- سێوە چی بە سەر هات؟.
بزەی سەر لێوی کیژە شەرمنەکان تارا. حاجی ناسکە خۆی بە سەر باسکێک و لایەکی سمتە پانەکەیدا دا و لە بەردەمی خۆی ڕوانی:
- ئەنفال کران.... گشتیان...
کەمێ کڕ بوو. دەستێکی بۆ ئەو کیژە درێژ کرد کە بە سێوە دەچوو:
- هەر ئەمەیان لێ مایەوە کە بۆتە کیژی من... ئیتر... گشتیان... ئەی وشە درێوەکەی توێی پیرۆزترین کتێب!. ئەی نەفرەتە هەمیشەییەکەی ئێستا و مێژووی دوور و درێژم!. ئەی تاڵانکەرەکەی ماڵ و شەرەف و ناموسم!. ئەی تەوقە ئاگرینەکەی ئەستۆم!. دەزانی چیت ڕاماڵی؟!. دەزانی کێت ڕاماڵی؟!. چووزەرەی تەمەنی منت لەگەڵ سێوەدا ڕاماڵی... چۆن توانیت ناسکترین جەستە بکەیتە قوربانیی؟! ئاخر چۆن؟!.
سێوەی دیل هاتە بەر چاووم. هەمان کیژی شەرمن و هێمن و ئارام: یەکێکی کەڵبەسوور دەمی نابووە ناو دەمی. یەکێکی شاڵ بەسەر چنگی لە ناولنگی گیر کردبوو. یەکێکی کەشیدە بەسەر هەیتا هەیتا کوتی لە لاڕانی دەدا و زەلکاوێکی سەوزی زەردباوی بە لاڕانیدا دادەچۆڕاند. سێوە، لە هەموو لاوە دەورە درابوو. تەنها چاوی هی خۆی بوون و بەملا و ئەولادا دەیگێڕان. تەماشای دەکردم. دوو چاوی زەندەقچووی تێبرپیبووم و ڕێی نەبوو تفێ ڕۆ بکا منی سیی ساڵ هەلاتووی تێدا نقوم بێ. ئای سێوە...
هەر جارە و وەجبەیەک و هەر یەکە و بە جۆرێک و لە لایەکەوە خۆی پێ دادەمرکاندەوە: مەمکەکانی وەکی جاران قیت بوون و منداڵ نەیمژیبوون. ناوقەدە باریکەکەی لۆچی منداڵبوونی تێ نەکەوتبوو. ئارام و هێمن و لە سەرخۆ. تەنها چاوی پڕ بوون لە ترس... ترسی دەسخەڕۆکراو و دەسبڕاو. ترسی کەسێ کە برا و باب و دەزگیران و دۆست و مێرد، سەریان بۆ زۆردارێک گرتبێ. شەرم بکا یا بترسێ...

پارچە پارچە جلەکانیان لە بەریدا دارنی و داما. ـ فرەیاندانە دەم
چاڵە پڕ لە جەستە ڕووتەکە. بۆ دواجار، لە هەموو لاوە پێوەی لکان.
نەوسنترین پیاوانی جیهانیان بۆ ئەو کارە هەڵبژاردبوو.. ئەوانەی کە بە
دەم سەربڕینی ئینسانەوە ڕەحەت دەبن. ئەویش هەر لە منی دەڕوانی.
ڕێی ڕۆکردنی تفی نەبوو. مەودای هێڵنجی نەدەدرا. مەودای خۆپیسکردنی
نەبوو. تەنها چاوە گۆشتنەکانی هی خۆی بوون و ئەوانەشی بۆ من
تەرخان کردبوون. دەیویست دوا سووکایەتیم پێ بکا ئەوجا ئاوابێتە ناو
چاڵەکەوە.
بە پاڵێک سێوەیان هەواڵەی ناو چاڵەکە کرد و هێشتا نەگەیشتبووە بنی
چاڵەکە، دەستڕێژ کرا. گوللە بەر مەمکە تورتەکانی و لاڕانە سفت و
تەڕەکانی دەکەوتن. جەستەی سێوە، هەر لە هەوا خەڵتانی خوێن بوو.
- ئەوە چ بوو؟.
حاجی ناسکە ئەوەی گوت.
سەرسام بووم. چ بوو؟!. ئەویش گوێی لە دەنگی تەقە بوو؟!. ئا...
ئا، لە هەمان چاوتروکاندا کە سێوە خرایە چاڵەکەوە، مەفرەزەیەکی ئاڵا
دەرلنگ و یەکێکی ئاڵانافەک پێکیاندا دا.
جووجەڵەکانی حاجی ناسکە شڵەژان و چوونە پەنای دایکیانەوە. ئەوی
مشکی بەسەریش پەنای دان و ڕایماڵینە بن باڵی خۆیەوە.
چاووم لە کنژەکەی سێوە بڕی. ئەمرۆ جەستەی بە دەستەوە دابوو چاوە
گۆشتنەکانی نەبێ کە زوو زوو تەماشای منی پێ دەکردن.

# سەرفرازیی

زەوییەکە چەمەنتۆڕێژ بوو. دیوارەکان چەمەنتۆ بوون. سەربانەکە چەمەنتۆ بوو. دەستشۆر و قەعدەی ئاودەستەکەش چەمەنتۆ بوون. دەرگاکەش، کە لای بنەوەی دەکرایەوە و دەبوو لە سەر چوارپەل پێیدا بێت و بچێ، بە ڕەنگی چەمەنتۆیی بۆیە کرابوو. هەستی دەکرد هەوای ژوورەکەش چەمەنتۆیی بوو. ئەوەی لە ژوورەکەدا چەمەنتۆ نەبوو، دوو پەتوو و شێرەی بۆڕیەکە و گڵۆپەکە و خۆی بوو. چەمەنتۆی گرنجگرنج لە هەموو لاوە دەوری تەنیبوو.

دەیزانی کەی لە دەرەوەی ئەو ژورەدا خۆر هەڵدێ، چێشتان دادێ، خۆر دەگاتە تاقی ئاسمان و بەرەو دەم کەل شۆڕ دەبێتەوە و ئاوا دەبێ. دەیزانی خۆر لە گەلێ جێدا، ئاگر بە سەر پاڵە و ڕێبوار و وردەفرۆشی دەسگێڕدا دەبارێنێ و عارەقەی ڕەشیان پێ دەردەدا. دەیزانی خۆر سەگە بەرەڵاکان بەرەو ناو قوڕاوی ڕەش و بستە سێبەرەکانی نیوەڕوان ڕاو دەنێ. سەگەکان بستێ زمانیان شۆڕ دەکەنەوە و دەهەژێن. دەیزانی

لەو دەمەدا، دەرەوە گەرمایەکە نیوەڕۆخەو بە وڵاتێک دەکا. یەک میللـەت دەخەوێنێ. لە نیوەڕۆ بەدواوە خۆر شۆڕ دەبێتەوە و سێبەرەکان زیاد دەکەن و جێی حەوانەوەی سەگەکانیش فەراح دەبێ. کە خۆر دەگاتە دەم کەل، ئیدی سێبەر نرخی خۆی لە دەست دەدا. دەیزانی لە دەرەوە، هەزاران ئامێری کاتژمێر، بە چکەچک بزاوتنی بازنەیی خۆر دەپێون. دەیزانی کە دەبێتە دووی پاش نیوەڕۆ، دەسگێڕێکی ماندوو و ڕەشهەڵگەڕاو، کە تازە تێر نان و ماستاوی خواردووە و گەرما و تێریی و جووتبوونی ناوەختی ئەو نیوەڕۆیە، فرزەیان لێ بڕیوە و کە های بابەتەکانی دەکا، ڕەگی گریان لە دەنگیدا دەبیسترێت و نەفرەت لە بوون دەکا. هاوسەرەکەشی لە ماڵەوەیە. ئەویش تێریی و جووتبوونی ناوەخت فرزەیان لێ بڕیوە و باری پێڵۆی چاویان قورس کردووە. جارێ دەخەوێ و جارێ بە دەم باوێشکەوە، بەرۆکێ دەکاتەوە و سینگ و مەمکی باوەشێن دەکا و زەنگوڵەی عارەقە بە لاملێدا دێنە خوارێ.
دەرەوەی ئەو ژوورە لەگەڵ چرکەکاندا دەگۆڕا. هەبوو یاخی دەبوو و هەبوو خۆی بە دەستەوە دەدا. هەبوو دەکوژرا و هەبوو لەدایک دەبوو. چرکەکان ئاگایان لە خشەی مار و مێروو هەبوو. ئاگاداری هەموو ڕووداوێک بوون. ئاگاداری ئەو ژنە خەواڵووە و مێردە دازایوەکەی بوون. ئاگاداری سەگە زماندرێژەکان و لیکەکەیان بوون. ئاگاداری ئەو قالۆنچانەش بوون کە بە دەم ڕاکردنەوە جووت دەبوون و چاوقایمانە پەنای سکە ئاسنەکانیان بەر نەدەدا و هەر ڕایان دەکرد. قالۆنچەی هاوین عەجایەبن. هەرچی گیاندار هەیە گەرمای هاوین خاوی دەکاتەوە کەچی قالۆنچە و خزمەکانی قالۆنچە، هەم جووت دەبن هەم ڕادەکەن و لە هەڕەتی گورجوگۆڵیدان. خۆ کەسیش نازانێ بۆ کوێ ڕادەکەن و لە دەستی چی ڕادەکەن. قالۆنچە نازانن بە کاوەخۆ بڕۆن. هەر ڕادەکەن. کەس نازانێ کەی دەخۆن و کەی دەخەون. هەر ڕادەکەن. مەگەر ئەو کاتە قالۆنچە بە بێ ڕاکردن ببینی کە مێرووله کەپرۆکەی بە سەردا دەکەن و بەرەو

شاری خۆیان ڕایدەکێشن. مێرووولەکانیش کە خزم و ڕەگەزی قالۆنچەن، هێند بە گەرموگوڕیی ڕایدەکێشن، دەڵێی بۆ مزگەوتی دەکەن. تۆ بڵێی شاری مێروولە مزگەوتی تێدا هەبێ؟

نەیدەزانی کات کەیە. لەو ماوەیەدا کە کەوتبوە ئەو ژوورەوە، بە کەرەسەکانی بەردەستی و جەستەی خۆی کاتژمێرێکی دروست کردبوو. بیستوچوار سەعاتی دەرەوەی بە پێی هەڵڕشتنی عارەقەی جەستەی خۆی دابەش کردبوو. کەی عارەقە ناکات و کەی عارەقە دەکا؟. کەی عارەقەڕشتن دەگاتە ئەوپەڕی و کەی لە کەمیی دەدا؟.

ژوورەکە دوو کونی لێ هەبوون. یەکێکیان لە سەر زەوییە چەمەنتۆڕێژەکە بوو و ئەوی تریان لە نزیکی بنمیچەکە بوو. ئەوەی بن دیوارەکە، لە دیوی ناوەوە، پەنجەیەکی پێوە دەچوو و ئەوەی بنمیچەکە، بە مەزەندە مەچەکێکی پێوە دەچوو. لە بەر ئەوەی کونەکان ڕووناکاییان نەدەدا، وای بۆ دەچوو لە دەرەوەڕا بۆڕیی چەماوەیان پێوە بێ. لە هەڕەتی عارەقە ڕشتندا، با بە کونی بن دیوارەکەدا دەچووە دەرێ و کەی عارەقەشی دەرنەدابا، با لە کونەکەوە دەهاتە ژوورێ. هەوای ئەو کونەش بۆی ببووە بەشێکی کاتژمێرەکەی و لە هەمان کاتدا تەندروستیی خۆی پێ دەپێوا. ئاخر دەترسا عارەقەی ترس دەربدا یا تای لێ بێ. گەرمای بوایە دەبوو با لە کونەکەوە بچێتە دەرێ دەنا تای لێ بوو.

ڕۆژی دوو جاران کرتە لە سەربانەکەوە دەهات. یەکێکیان لە سەرەتای عارەقەڕشتنیدا بوو و ئەوی تر لە کاتی بێ عارەقەییدا بوو. هەموو ڕۆژێ دوو جاران ئەو دەنگەی دەبیست. لە کاتی بیستنی یەکێکیاندا با لە کونەکەوە دەهات و لە کاتی بیستنی ئەوی تریاندا با بە کونەکەدا دەچووە دەرێ. مانگێ بوو دەیزانی کە ڕۆژی دوو جار ئەو دەنگە دێ. بە هەر حاڵ، لەو کاتەوە کە کەوتبووە سەر فێڵەکەی شەست جاری ژماردبوو. ئەگەر لە یەکەم ڕۆژەوە ئەوەی بزانیبا، ناوی ڕۆژەکانی دەزانی و دەیزانی چەندی مانگیشە. بیری لێ دەکردەوە: یەکێکیان دەی شەو و

ئەوی تریان دەی سەر لە بەیانی.
نەیدەتوانی ژەمە خواردنەکان بکاتە بەشی کاتژمێرەکەی، بەڵام حەفتەی پێ حسێب دەکردن. حەفتەی یەک جار شوێنەواری گۆشت لە خواردنەکەیدا دەبوو. خەمە گەورەکەی ئەوە بوو کە گەرما ڕەوایەوە چی بکاتە پێوانەی کات. ئەدی ئەگەر لەو ژوورەیان گواستەوە چی بکات؟. خۆ ئەگەر ئەو کەرەسانەیان لێ بسەنیبایەوە کە کاتژمێرەکەی لێ دروست کردبوون پەکی دەکەوت. لە هیچ کوێیەک نەیدەتوانی ئاوها بە سەر کاتدا زاڵ بێ.
کاتژمێرەکە زۆربەی کاتی لێ گرتبوو. بە بیرکردنەوە لە کات، کاتی بەڕێ دەکرد. هێندێ جار بیری دەچووە سەر قالۆنچەکان: هەر ڕادەکەن. ئامێرە سێکسییەکەی قالۆنچە نێرە، قەفقەفە و قەفەکانی، وەک ئاریەلی ڕادیۆ دەچنە ناو یەکەوە. نێرەکە لە مێیەکە گچکەترە. مێیەکە نێرەکە بە کۆڵەوە دەگرێ و ڕادەکا. نێرەکەش، بە هەر شەش قاچەکەی، مێیەکە دەگرێ و قەفەکانی لێ گیر دەکا و لە کۆڵی نابێتەوە. مێیەکە هەر ڕادەکا. مێیەکە نێر بەکۆڵەوە، پەنای سکە ئاسنەکە دەگرێ و بەری نادا. هەر ڕادەکا. ئەگەر منداڵ بە زۆر لێکیان جیا بکەنەوە و لە سەر زەوی دایاننێن، هەر یەکەیان بە لایەکدا ڕادەکا. بەرەو یەک جێ ڕاناکەن. قەت. هەر دەڵێی کەتنیان کردووە و لە سزادان دەترسێن... دەترسێن بە تۆمەتی زینا سزا بدرێن.
هێندێ جاریش دوای کرتەی نیوەشەوی سەربانەکە، خەیاڵی بۆ ئەو ڕۆژە دەچوو کە دەسگیر کرا: دە کەس بوون و یەک مەفرەزەیان لێ پێکهێندرا. دوای ڕاهێنانێکی مەیدانی لە سەر دوو ڕەهەندی و گۆشەی وەرچەرخان، کە لە لایەن کۆنەئەفسەرێکەوە پێیان کرا، پێیان ڕاگەیەندرا: «ڕێک بە پێی نەخشەکە بکەن. چۆنمان گوت و چۆنمان تۆمار کرد وا بکەن، دەنا ئیعدامی شۆڕشگێڕانە چاوەڕوانتانە».
ئیعدامی شۆڕشگێڕانە، هەم بکوژی پێ سەربەرز دەبوو هەم کوژراو. ئەوە

ئیعدامی ڕاستەقینە بوو. بەینێ بوو زاراوەی ڕاستەقینە هزر و هۆشی خەڵکی تەنی بوو: خەباتی ڕاستەقینە و شۆڕشی ڕاستەقینە و مافی ڕاستەقینە... کەوتبوونە سەر زاران. ئەوانیش کە بۆ ئەنجامدانی کارێکی شۆڕشگێڕانەی ڕاستەقینە دەچوون، یا دەبوو سەرکەوتنی ڕاستەقینە بە دەست بهێنن یا ئیعدامی ڕاستەقینە بکرێن. شێر و خەت بوو.

نەخشەکە ئاوها بوو: دەیەم کەس لێپرسراوی هەنگاونان و گۆشەپێوانی کۆمپاسەکە بوو. ئەو، پێ لە سەر بەردە قەوزاوییەکەی ناو ئاوی کانی جنۆکان دادەنێ و بەرەو بەردە سپییەکەی دەشتاییەکە ٤٢٠ هەنگاوی فراوان دەنێ. هەرچی بێتە پێشی نابێ لێی لادا نەبادا هێڵە ڕاستەکە تێک بچێ. دوای هەنگاوەکان، بە کۆمپاسەکە ٨٠ پلە بە لای چەپدا دەپێون و ١٢٠ هەنگاوی تر دەنێ. ئەو هەنگاو دەنێ و دەیانژمێرێ و ئەوانی تریش لەگەڵیدا دەژمێرن. بیری دەکردەوە و ناوچەوانی پێکدادابوو. بیری کەوتەوە: گەیشتنە کەندێک. لێپرسراو دەیوست باز بدا.

- دەبێ باز بدەم.

- باز بدەی لاقت دەشکێ و هەنگاوی ترت پێ نانرێ.

- باز نەدەم ئیعدامی شۆڕشگێڕانە دەکرێم.

- کارەکە ئەنجام نەدەی ئیعدامی شۆڕشگێڕانە دەکرێی.

پینەوپەڕۆیەکیان کرد و بەبێ بازدان هەنگاوی نا. سێیەم مەودا لە ناوەڕاستی شەقامەڕێیەک کۆتایی هات. شەقامەکە قیرتاو بوو. گۆشەیەکی نەوەت پلەییان پێوا و کەوتنەوە ژماردنی هەنگاو. شەقامەکەیان گرتە بەر و ڕۆیشتن. بە دوای یەکدا ڕیز ببوون و ئەوەی پێشەوە هەنگاوی دەژمارد. هەنگاوی بەرەو شار دەژمارد... بەرەو سەربازگەیەکی قەراغ شار. ئەوان خەریکی ڕێپێوان بوون، لە دوو لاوە ڕووی پرۆجەکتەریان تێ کرا و لە هەموو لاوە میلی چەکیان لێ ڕاکێشرا. هەنگاوپێوەکەیان بە چپە گوتی:

- ئەمە ئەنجامی فەرمانشکاندنە. بازم بدابا ئەمە نەدەقەوما.

- نەء، لە ژماردندا هەڵەمان کرد. دوا ژماردن، لە بری ئەوەی ٦٤ بژمێرین ٧٥مان ژمارد.

- نا، لە سەر نەخشەکە ٦٤ بوو.

- ٧٥ بوو...

- هەرچۆنێ بێ، هەنگاوەکان دەیانگەیاندینە ئێرە! ئەمە ئامانجەکەیە! دوای گرتن، هەر یەکەیان بە لایەکدا برا. ئەم کەوتە ئەو ژوورەوە. هەموو لایەکی چەمەنتۆی گرنجگرنج بوو. لە چەمەنتۆ و عارەقەی خۆی کاتژمێرێکی دروست کردبوو. لە ناو ئەو ژوورەدا، هەموو کاتی خۆی بە پێوانی کات بە سەر دەبرد. هەرگیز ئاوها هەستی بە بوونی کات نەکردبوو. هەرگیز ئاوها تێکەڵاوی کات نەببوو. هەستکردن بە کاتی ڕاستەقینە و تێکەڵاوبوون لەگەڵیدا، بۆ ئەو سەرفرازیی بوو. تێکۆشانیش، هەر بۆ هەندێ بوو. بیری دەکردەوە: ئەگەر کەرەسەی کاتژمێرم نەمێنێ، بێر لە کۆمپاس و گۆشە و هەنگاو و کەند و هەڵدێر دەکەمەوە... ئەوەش سەرفرازییەکی ترە.

# ئاهەنگی ئەنفال

پەڵە هەورەکان، بە بێ بەرنامە و ڕێڕەوی دیار، پێکدا دەهاتن. تێکەڵ دەبوون و لێک دادەبڕان و دیسان تێکەڵ دەبوونەوە. سێبەرەکانیشیان لە سەر تەختاییەکەی بەرماڵان هەمان کایەیان دەکرد. دەتگوت زەوی ئاوێنەیەکە و ئاسمان قژی خۆی لە بەر دادێنێ و دەیشێوێنێ و دایدێنێتەوە. دیمەن و سێبەری هەور نائاسایی بوون و لە دیمەنیشیان نائاساییتر ڕەنگیان بوو. هەور، ڕەنگی خاکی هاوینی گرتبوو و زەویش چووقەرەی بەهارێکی گەرمەسێر بوو: قەرسیلەکەی بەرماڵان، کە سێبەری هەوری لێ دەڕەوییەوە سەوزێکی کاڵ بوو و کە سێبەریش دایدەپۆشی، سەوزێکی تێری ئاماڵ ڕەش بوو.
بایەکی توند لە هەموو لاوە هەڵیکردبوو. دەشێ با لە هەموو لاوە هەڵبکا؟. ئەو دەمەو ئێوارانە با سەری لێ شێوابوو و سەری لە دارە ڕووتەکانیش شێواندبوو. دارەکان بە هەموو لادا دەشەکانەوە، هەور بە هەموو لادا دەخولانەوە و تاڵە قەرسیلەکان سەریان بە هەموو لادا بادەدا.

چ بوو؟. دیاردەی ئاخری زەمان بوو یا سەرەتای؟.
نمە بارانێک دایکرد. دڵۆپە بارانەکانیش نائاسایی بوون. هەم لە قەوارەدا نائاسایی بوون هەم لە ڕەنگدا. دڵۆپی گەورە گەورە، بە تفی برسییەک دەچوون بنێشت بجوێ و بیر لە خۆراکی بەتام بکاتەوە. ڕەنگیشیان سوور یا خاکییەکی لە بابەت ڕەنگی جلوبەرگی سەربازی بوو. چەند دڵۆپێ باران بەر سەر و نێوچەوان و ناوشانی کەوتن. شڵپەیان دەهات. دەستی بە تەوێڵی خۆیدا هێنا و تەماشای کرد. قوڕاو بوو. موچڕکێک لە تەوقی سەریەوە دایگرت تا بنی پێی. بە پەلە خۆی بە ژووریدا کرد و بارانیش دایدا... بە توندی دایدا. بەڵام قوڕاو بوو... قوڕاو دەباری. «ئاسمان قوڕ دەپێوی. ئاسمان خۆی و زەوی لە قوڕ دەنێ. دەبێ کێی لێ مردبێ وا خۆی بۆ لە قوڕ دەنێ؟. جا کێی ماوە تا خاک گوڵاوپڕژێن بکا؟. زۆری چوون و کەمی ماون... چاکەکانی چوون و خراپی ماون».
لە پەنجەرەوە دەیڕوانی. دار و بەرد قوڕاوی بوون. ئۆتۆمبیل و کەر و بەشەر و عارەبانە قوڕاوی بوون. ڕۆژەکەی بۆ بۆردومان لەبار بوو... کام فڕۆکەوان لەو قوڕستانەدا دەیتوانی شتێ لە شتێ جیا بکاتەوە؟. کێ دەیتوانی کۆنە لە تازە و چاک لە خراپ و بەرد لە بەشەر جیاکاتەوە؟.
هەمووی هەر قوڕاوی بوو و هەموو شتێ، بگرە ڕێچکەی بارانی نێوان ئاسمان و زەویش، مەچیری قوڕاوی پێکیان هێنابوو. قوڕاو جۆگەلەی دەبەست و بە خوڕ خۆی بە کۆڵانەکەدا دەکرد و لەوێوە تێکەڵاوی ئاوڕۆگەی ماڵەکانی تر دەبوو و بە هاژەهاژ، بەرەو شیوەکە دەچوو. کە خەڵکی بە کۆڵانەکەدا ڕایاندەکرد، سەرتاپا خاکییان پۆشیبوو. سەروسیماشیان خاکی بوو. بارانەکە، چۆن بەهاری و کتوپڕ دایدا، ئاوهاش کتوپڕ لێی کردەوە. بایەکە خستی و هەور ئارام بووەوە. دەتگوت ئاسمان ژنێکە و نۆبەرەی بووە. لە هەڵپە و هاوار کەوت و بزەی دەکرد... شین و ساف و خاوێن بوو. بەڵام چ چڵکاوێکی پێوە بوو، چ قوڕاوێکی تێدا بوو، هەمووی هەڵڕشتە سەر زەوی و دانیشتوانی زەوی، بە بنیادەم و ئاژەڵ و دار و

دەرەختەوە. هەرچی لە سەر زەوی بوو قوڕاوی بوو.
خەیاڵی ڕۆیبوو. دەتگوت منداڵێکە و بۆ یەکەم جار شتێ دەبینێ، بە چاو تاوتوێی دەکا و لە جیهانە بەرتەسکەکەی خۆیدا لێکی دەداتەوە: داخۆ بۆ خواردن دەشێ یا ناشێ؟. ئەدی دەشێ لە زاری نێ؟. ئەم قوڕاوە چیە؟!.
دەنگی دەرگا خەیاڵەکانی ڕەواندنەوە. بە پەلە هەستا. دەرگای کردەوە. خاکیپۆشێک کە تەنها هەردوو چاوی خاکی نەبوون، لە بەر دەرگاکە وێستابوو.
ـ خوامالّت ئاودانکا دیناریبدە!.
لە نێوان (خوا) و (مالّت)دا بۆشایی نەبوو. لە نێوان (لّ) و (ت)ی مالّتدا دزەبزوێن نەبوو. بە کورتی، ڕستەیەکی کوردی ـ ناکوردی بوو و بە ناو یەک پاخوا قوڕدا گوزەری کرد. نەخێر! پەیکەرێکی لە قوڕ دروستکراو بوو و دەدوا. دەتگوت باوکە ئادەمە و تازە فووی پێدا کراوە و خودا (هەموو ناوەکانی فێر کردووە)، بەڵام بە کوردی. بەرانبەر پەیکەرە قوڕینەکە ڕاوێستا. چاوە خڕ و بزەکانی پەیکەرەکە نهێنییان تێدا بوو. دەست و پێیان بەستەوە و لە پەلوپۆیان خست. چنگیان لە ناخی گیر کرد و هەست و خوستیان لەبەر بڕی... ئەو چاوانە چاو نەبوون. میلی ماگنەتیکێکی زەبەلاح بوون و ڕایاندەکێشا. چاوەکان سپێنەیان نەبوو... بە چاوی مشک دەچوون. ڕەش و پڕ و دەرپەڕیو.
هێشتا سێلاوی قوڕاو بە بەردەم ماڵەکەدا دەینالاند. کێ دەزانێ سێلاو چ دەڵێ و چ بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە تا ئەو بزانێ؟. بەڵام چاوە جادووییەکان دەنگی ئاویان لە دەنگی قوڕ جیا دەکردەوە. ئاو و قوڕ هەر یەکەی بەسەرهات و کارەساتێکیان بۆ یەکتر و بۆ مرۆی نەژنەو و دار و بەرد و کەری نەژنەو دەگێڕایەوە. ئاو بەسەرهاتی پەنجا ساڵەی خۆی بۆ قوڕ دەگێڕایەوە و قوڕیش چی دیتبوو بۆ ئاوی باس دەکرد. ئەمیش لە ناو جادووی بازنەئاسای چاوەکانەوە، کە هەر گەورە دەبوون و گەورە

دەبوون، بەسەرهاتەکانی دەدین و لە ئاو و قورپیشی دەبیستن:
ئاو: وای لەو ڕۆژەی بووم بە شەختە!.
قوڕ: وای لەو ڕۆژەی سەگێکی زل تەرمی کچێکی لە هەناووم هەڵتەکاند!.
ئاو: ئای لەو ڕۆژەی تنۆک تنۆک بە بنپژاندنی ڕەوێ کیژ توامەوە!.
قوڕ: وای لەو ڕۆژەی دەیان جووتە چاو وەک هەڵمات بە سەرمدا گلۆر بوونەوە!.
ئاو: دەنگت بەرز مەکە!. ئەها ئەو پەیکەرە گوێی لێمانە.
قوڕ: لە زمانی ئێمە تێناگا. تێشبگا هۆشی لە دەست دەدا. خەڵکەکە بە شێتە شێتە دووی دەکەون و بە خاکپەرستی لە قەڵەم دەدەن. وای لەو ڕۆژەی دەیان کیژیان لە سەر سینگی من پاڵخست و ڕەنگم سوور هەڵگەڕا.
ئاو: هەی مەلعوون! بۆیە ناچار بووم بتشۆمەوە و سوور هەڵگەڕێم.
قوڕ: لە باوەشی مندا کەتن دەکرێ و دواییش بە تۆ سرپۆش دەکرێ.
ئاو و قوڕ هاتنە سەر باسی ئاهەنگ. قوڕ دەدوا و ئاو گوێی گرتبوو:
(٣٠١) کیژیان بە قژ ڕاکێشایە هۆڵێکەوە. هەموویان ڕووت و نیوەڕووت بوون. سیمایان زەندەقچوونی لێ دەباری و دەتگوت بۆ سەربڕین دەبرێن. ئەفسەرێک، لەوسەری هۆڵەکە، لە پشتی مێزێک دانیشتبوو و (زەحلاوی)ی دەخواردەوە. چاوی سوور بوون. چاوی بە کیژەکاندا گێڕا. مەمکی خڕ خڕ، پێستی ئاڵ و پەمەیی، لاڕانی توندوتۆڵ، تووکەحەرامەی خوار ناوک و ساقوسمتی سفت، ئاویان زایاندە زاری. قاقا پێکەنی: (من ئەمڕۆ هاروونم... هاروونەڕەشیدم. کێ گۆرانی دەزانێ؟!. قەیدی نییە با بە کوردی بێ). کەس وەڵامی نەدایەوە. ئەفسەرەکە، تەماشایەکی سەربازەکانی کرد کە بە لای دیوارەکانەوە، چەک بە دەست ئامادە وێستابوون. ئەوانیش تێیان کەوتن... مەمکیان دگەستن، بە چەپۆک شڵپەیان لە سمتیان هەڵدەستاند، توند مەمکیان دەگوشین و دەیانگەستن. زریکەی کیژەکان هۆڵەکەی پڕ دەکرد و قاقای ئەفسەرەکە،

گڕ گڕ تێکەڵاوی زریکە کچانەکان دەبوو. ئاو: ئەرێ بۆ سەگ لێی بدرێ دەقروسکێنێ و مرۆ لێی بدرێ هاوار دەکا؟. کەچی کەر، کە لێی دەدرێ نقەی لێوە نایێ!.
قوڕ: قسەم پێ مەبڕە!. چ ئاوازێکی نەشاز بوو. کیژێکی بەژن باریکی لاڕان ڕووت، لە ئەفسەرەکە هاتە پێشێ: من گۆرانی دەزانم.
ئەفسەرەکە دەستی بۆ سەربازەکان بڵند کرد: قیف!.
هەموو سەربازەکان دەسبەردار بوون یەکێکیان نەبێ کە منداڵکارێکی ڕووتی لە ناولنگی خۆی لوول دابوو و دەیلرفاند. ئەفسەرەکە دیسان قیژاندی: قیف!.
کیژەکە دەستی پێ کرد. دیوارەکانی هۆڵەکە، ڕۆڵی شاخیان دەدی و دەنگیان دەدایەوە. سەرەتا، لاواندییە. دەتگوت دایکێکە و جواناوی ڕۆڵەیەکی دەسرێ: باوەشێنت کەم... باوەشێنت کەم... بە ڕێحانەی تەڕ.
لەگەڵ لاواندنەوەی ئەودا، سێسەدەکەی دی دایانە کاڵەی گریان. دەتگوت گریانەکان زەنگوڵەن و بە مەچیری لاواندنەوەوە جەلە کراون و هەموو وێکڕا دەلەرێنەوە و دەزرنگێنەوە. ئەفسەرەکە قیژاندی: قیف!. کیژەکان کڕ بوون.
- هەڵپەڕکێ... هەڵپەڕکێی کوردیم دەوێ... دەی ڕیز بن و هەڵپەڕن...
ئەوجا ڕووی لە کیژە باریکەلەکە کرد: تۆش گۆرانی هەڵپەڕکێ بڵێ. دەی بە قوربانی کورد بم!. ئەوەی گوت و قاقا پێکەنی. پێکەکەی هەڵقوڕاند و بە توندی بنی پەرداخەکەی بە مێزەکەدا کێشا و گوتی: ئیبدەء !.
کیژە باریکەلەکە چاوی بەوانی تردا گێڕا: هەڵپەڕن باشترە. دەی هێندێکتان دەست بگرن.
ڕیز بوون. دە دوانزە کیژ کە جلەکانیان لەوانی دی ئەهوەنتر بوون و جەستەیان کەمتر بە دەرەوە بوو، دەستیان گرت. بە دەم گریانەوە دەستیان گرت... بە دەم ترس و لەرزەوە ڕیزیان بەست. کیژە باریکەلەکەش

دەستی پێ کرد. کیژەکان، لە سەرەتاوە بە ئاستەم دەبزوان. وا دەبزوان گەردیان لە زەوی هەڵنەدەستان. ئەفسەرەکە هەستایە سەر پێ و شیراندی: قیف!. وا نابێ!. چما وا دەزانن هەڵپەڕکێی کوردیم نەدیوە؟!. کە بەڕێوەبەری ئاسایشی شاری (X) بووم هاوڕێ حیزبییە کوردەکانم، ژن و کچ و خوشکی نازداری خۆیانیان دەهێنان و هەڵپەڕکێیان بۆ دەکردم... سەمایان بۆ دەکردم... ستریپیان بۆ دەکردم. هەرجارە و یەکێکیان لایاندەدا و لە باوەشم بایان دەدا. ئەگەر ئێوەش وەک ئەوان بە دڵی من نەکەن، چۆن حوشتر فێرە سەما دەکرێ، ئاوها فێرە هەڵپەڕکێی کوردیتان دەکەم... دەزانن چۆن؟. پشکۆ لە بن پێتاندا ڕۆ دەکەم پشکۆ پشکۆ!. دەی هەڵپەڕن قەحبەگەل!... بەشی حەوت مەملەکەت دەکەن و من تێر ناکەن. ئەو نێرەکەرانەتان تێ بەردەم؟!... کە دوا ڕستەی گوت دەستی بۆ سەربازەکان درێژ کرد. سەربازەکانیش بە بزە و نەرمە پێکەنینەوە، دەمی خۆیانیان دەلستەوە و ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی. ئەفسەرەکە قیژاندی: ئیبدەء!.

دەستی پێ کرد: هۆ مینە خانم مینە... باڵاکەت بەرزە مینە.

دە دوانزە کیژەکەش وردە وردە دەستیان کرد بە هەڵپەڕین. لە ئەنجامی هەڕەشەی ئەفسەرەکەدا، کردیانە سێپێیی... دەگریان و هەڵدەپەڕین...

- قیف!.

لەگەڵ (قیف)ەکەدا مشتێکی توندیشی بە مێزەکەدا کێشا. کیژەکان لە جێی خۆیاندا بەنج بوون.

- دەی!. ئەوەی هەڵناپەڕێ با چەپڵە لێ بدا. ئیبدەء!.

خۆی لە سەرەتاوە دەستی بە چەپڵەکوتان کرد. چەپڵەکانی لەگەڵ ئاوازەکەدا ڕێک نەدەهاتن. لێرە و لەوێی هۆڵەکەوە، بە پچڕ پچڕ چەپڵە دەستی پێ کرد. هێندێکیان لەگەڵ چەپڵەی ئەفسەرەکەدا ڕێک دەهات و هێندێکیان نا. لە ئەنجامدا، دەتگوت زەماوەندی کوڕی پاشایە. هۆڵەکە نرکەی دەهات. کیژە باریکەلەکە دەیچریکاند:

عەیشۆکێ هەی شێ وەی شێ... هێ دەلالێ وەی شێ وەی شێ...
کیژەکانی دی، ٣٠٠ بە جارێ دەیانسەندەوە و چەپڵەیان دەکوتا. زرمەی پێی کیژەکان تۆزی لە زەوی هەڵدەستاند. گۆرانیبێژەکە بیری هیچی نەما گۆرانی نەبێ. ئەوانەش کە هەڵدەپەڕین، فرمێسکیان دادەباراند و پێیان بە توندی بە زەویدا دەکێشا و جاروبار پرمەی گریانیان تێکەڵاوی چەپڵەکان دەبوو.
- قیف!.
هۆڵەکە بووە گۆڕستانێکی خامۆش.
- یاڵڵا! ئەوەی جلی لە بەردایە خۆی ڕووت بکاتەوە. ڕووت (کەما خەلەقەنی ڕەببی).
بووە چپەچپ. یەکەم کەس، ئەوەی گۆرانی دەچڕی، کراسە لاهەڵدڕاوە گوڵگوڵییە چڵکنەکەی لە بەر خۆی داماڵاند. هیچی تری لە بەردا نەما. زۆر ئاسایی، بێ ئەوەی دەستێکی بخاتە سەر شوێنێکی جەستەی خۆی و بێ ئەوەی چاو لە ئەفسەرەکە بترووکێنێ، چوو کراسەکەی لە سەر مێزەکە دانا. ئەوانی تریش یەکە یەکە وەک ئەویان کرد. سەر مێز و دەوروبەری مێزی ئەفسەرەکە پڕ بوو لە جلی ژنانە. یەک خەرمانی گەورە. ئەفسەرەکە قا قا پێدەکەنی و چاوی بە هۆڵەکەدا دەگێڕا کە پڕ بوو لە کچی ڕووت.
- یاڵڵا... یاڵڵا... ئیبدەء!.
دەست پێ کرایەوە: عەیشۆکێ هەی شێ وەی شێ... هێ دەلالێ وەی شێ وەی شێ...
بە یەک دەنگ دەسەندرایەوە و بە یەک دەنگ چەپڵە لێ دەدرا و ئەشکیش بەردەوام دادەباری. کەس نەیدەزانی عەیشۆکی ئاوازی شاییە یا هی شین.
ئاو: ئەی بۆ لەرزت لێ نەهات؟!.
قوڕ: فریا نەکەوتم. من لەگەڵ زرمەی پێیاندا بەرز بوومەوە و بە زەبری

چەپڵە بە حەوادا چووم و بە کونەکانی هۆڵەکەدا وەک مار کشام. هەر کە دەرکەوتم، بایەکی هار و شێتی گەرم ڕاپێچی کردم و بەرەو ئەم ناوچەیەی هێنام. ئێدی تۆش لێم بووی بە مووی لوت و تا لێرە بە زەویتدا نەدام دەسبەردار نەبووی. من لە کونەکانەوە دەرچووم و نازانم دوای من چ قەوما... ڕەنگە ئێستاش هەڵپەڕن... ویستی بە (خوا بدا)یەک دەرگا بە ڕووی پەیکەرە قوڕەکەدا دابخا، بەڵام پەیکەرەکە لەوێ نەمابوو. دە دوانزە مێرمنداڵ، کە هەموویان قوڕاوی بوون و هەر چاو و ددانیان خاکی نەبوون، دەوریان لێ دابوو و چەپڵەیان دەکوتا و هێندێکیان قوڕاویان پێدا دەکرد: هۆۆۆی هااا... هۆۆۆی هااا... هۆۆۆی هااا...
کە ئەویش لە بەر بارانی قوڕدا بووە پەیکەرێکی خاکیپۆشی قوڕین و لە نێوان عەیشۆکێ و هۆۆی هاا دا سەری لێ تێکچووبوو و نەیدەزانی کامیان کامیانە، بە ناو کۆڵانەکان کەوت و منداڵیش دوای کەوتن:
هۆۆۆی هااا... زەمانحاڵی ئاو هات. هۆۆۆی هااا... زەمانحاڵی خاک هات...
هۆۆۆی هااا زەمانحاڵی ئەنفال هات... هۆۆۆی هااا...

# چاوی پشیله

سەعدوون، کوشتەی دەستی باوکێکی نالەبار و چرنۆک و کەڵبەی پشیلەیە.
بە منداڵی، لە سەر هیچ سزا دەدرا و بە گەورەیی لە سەر هیچ سزا نادرێ
و بە کەیفی خۆی دەڵێ و نمەکی هەر کەسێ بکا، پشیلە ئاسا، لە ئەنجامدا
نمەکحەرامیی پێ دەکا. ئەگەرچی ئێستا هەست دەکا پاوەند و زنجیری لێ
داماڵاون، بەڵام جاروبارێ هەر خەونی ئاجرۆباجر دەبینێ و بە دەم خەونەوە
دەقیژێنێ و هاوسەرەکەی، بە بیسمیلڵا بیسمیلڵا و خت خت پشیلە بۆر،
ئامێزی پێدا دەکا. ئێستا، هەوڵ دەدا توندترین تۆڵە لە زۆرترین کەس
بکاتەوە. دەیەوێ تۆڵەی خەتاکانی باوکی لە هەموو باوکێ بکاتەوە. وەک
زۆربەی ئەوانەی کە لە بەر ئاگری تۆقاندن و ئەشکەنجە و نەزانی و نەبوونی
بەزەییدا گەورە بووبن، ددانی خواروخێچن، کورتەبنە و فێڵبازە، شەڕانی
و جنێوفرۆشە. لە هەموو ئەو خەسێتانەشی دامێنتر ئەوەیە، کەس نازانێ
وەک ئەو، دەستە چەورەکەی خۆی بە سەر خەڵکی تردا بسوێ و کەس
ناتوانی وەک ئەو خلە لە بری بلە دانێ. بە منداڵی دەیزانی چۆن ـ هەر

نەبێ لە دە جاران یەک جار ـ ئەو ئاگرەی کە دەبوو بە سەر ئەودا داباریّ، بە سەر (فەقێ یا غەنی)ی برایدا داباریّنێ و ئەو بە تێهەڵدان بدا. «شەرت بێ بە تێهەڵدانت دەم!»، زاراوەیەکی باوی ناو خێزانەکەیان بوو و هەموو کەس بە هەموو کەسی دەگوت. زاراوەکەش لەگەڵ خۆیدا گەورە بوو و لە ئەنجامدا، گۆڕا و بوو بە «شەرت بێ بە گرتت بدەم!».

بەڵێ، سەعدوون کوشتەی دەستی باوکێکی نالەبارە. هەر ناوهێنانی باوکی بەس بوو بۆ ئەوەی ناوکی بکەوێ و بە خۆیدا بمیزێ. لە سەر هەموو ئەو ئەشکەنجە و ئازارانەوە کە لە دەستی باوکی دەیچەشتن، بە دەست خەونێکی ناشەرعی ناخۆشەوە دەینالاند، کە زوو زوو دەیبینی: دایکی بە بووکی دەبرا. هەر جارە و بۆ یەکێ دەگوێزرایەوە. جارێ بۆ عەبە قەساب، جارێ بۆ عەلە گاوان، جارێ بۆ بەقاڵی سەر سووچەکە و جارێ بۆ مامۆستای مێژوو. درەنگ، زۆر درەنگ لە هۆی بینینی ئەو خەونە نالەبارانە تێگەیشت و ویژدانی حەسایەوە. کاتێ سەروسەودای لەگەڵ کتێبدا پەیدا کرد و ئاشنای فرۆید بوو، ئەوجا هۆیەکەی زانی. هۆیەکەی دۆزییەوە: حەزی دەکرد یەکێ لەوانە باوکی بوایە... لە باوکی خۆی بێزار بوو. بە دوای باوکێکدا دەگەڕا، هەرچییەک بێ، ئەو باوکەی خۆی نەبێ. عەزرەتی دەخواست باوکی بەقاڵێ، حەماڵێ، فیتەرێ، سایەقی پاسێ، پینەچییەک، چەرچییەک یا هەرچییەک بوایە، بەڵام پۆلیس نەبوایە. پێی وابوو پۆلیسییەکەی هۆی ئەو دڵڕەقییەیەتی.

کە مرەخەسی باوکی تەواو دەبوو، باری سەر شانی سەعدوونش سووک دەبوو. هەر ئێوارێ کە دەیدی باوکی، وا زوو زوو گوپی پڕ دەکا لە ئاو و بە سەر پانتۆڵە پۆلیسییەکەیدا، ئەسپئاسا دەپرمێنێ و دوایی دەقی دەکا و دەیخاتە بن نوێنەکەیەوە، ئێدی مژدەی تەواوبوونی مرەخەسییەکەی بوو و پێی گەش دەبووەوە. بۆ سبەینێش، هەستی دەکرد جیهان، لەگەڵ هەنگاوەکانی باوکیدا بەرین و بەرینتر دەبێتەوە. چەند لەماڵەوە دوور دەکەوتەوە، نیوەتیرەی جیهانی ئەمیش درێژتر دەبووەوە. باوکی بە دۆڵابە

سەوزەکەیەوە، بە هەورازەکەدا هەڵدەگەڕا و ئەم لە دوایەوە تەماشای دەکرد. چەند نالەبار بوو: پووزەوانە پۆلیسییەکانی، لاقیان گەلێ درێژ دەردەخستن. قایشە ڕەشەکەی پشتی کە خۆشی نەیدەزانی چەند جار سەری شکاندووە، لێی دەبووە قامچییەکەی دەستی ئیسرافیل و ئاگری لێ دەبووەوە. باوکی، لە بەر چاوی سەگێکی دڕ بوو و ڕاوی کۆمۆنیست و قاچاخچی و نەیارانی دەوڵەتی دەکرد. ئەمیش لەخۆڕا هەستی دەکرد قاچاخچی و کۆمۆنیست و نەیاری دەوڵەتە بۆیە سزا دەدرێ... هەستی دەکرد نەیاری هەموو دەسەڵاتێکە و دەیەوێ وەک بەرزەی پایزان، لە سەرکەللـە و زنجیر ڕەها بێ. باوکی، ئەو ڕاوەی بە پارەیەکی کەم دەکرد و بە گوناح و حەرامیشی دەزانی. گوناحیش، بە خوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورعان پاک دەبووەوە و ئەویش هەر وای دەکرد. دوای هەر ڕاوێک، چەند سوورەتێکی دەخوێندەوە و گەلێ جار خەتمەشی دەکرد. دوای هەموو نوێژێکیش دەستەودوعا لە خودا دەپاڕایەوە لێی خۆش بێ. ئەگەر دڵیشی هەر پاک نەبوایەتەوە، ئەوا بە دڵنیاییەوە داخی خۆی بە سەعدوون هەڵدەڕشت. پێی وا بوو جێی لێدانی باوک، ئاگری دۆزەخ نایسووتێنێ و ئەو لێدانەش هەم وەک خوێندنی قورعان خێرە، هەم چاکەیەکیشە لەگەڵ سەعدوونیدا دەکا. ئەوجا بگرە و بکوتە کوێت دێشێ!. سەعدوون، ڕقی لە قورعانیش بوو.

کە باوکی بە مرەخەسیش دەهاتەوە، نیوەتیرەی جیهانی سەعدوون، لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاتی هاتنەوەی و دوایی لەگەڵ هەنگاوەکانیدا کورتتر و کورتتر دەبووەوە تا وای لێ دەهات هیچی ئەوتۆی نەدەما تێیدا ببزوێ. نەیدەزانی چ بڵێ و نەیدەزانی چ بکا تا ئاگری باوکی نەیسووتێنێ و لێدان نەخوا. لە سەر ئەوەشەوە منداڵانی گەڕەک، کە بە بەزمی سەعدوون و باوکیان دەزانی، ڕێیان بە باوکی دەگرت: مام مەلا مام مەلا! سەعدوونی کوڕت دارتووی مزگەوتەکەی سواخ دا!. مام مەلا مام مەلا! سەعدوونی کوڕت سێ پشیلەی کوشت!. مام مەلا مام مەلا! سەعدوونی کوڕت پەنجەرەی

مەکتەبی شکاند. مام مەلا مام مەلا! سەعدوونی کورت، لە سەر درۆ و بوختان، سێ ڕۆژ لە مەکتەب دەرکرا!. مام مەلا مام مەلا...

ئێدی مام مەلای پۆلیس دەبووە دەجاڵ و منداڵەورتکەی شارەکەی دوو دەکەوتن تا خراپەکارییەکانی سەعدوونی پێ ڕابگەیەنن و بەزمی ڕاوەپشیلەکەیان دەرچێ. ئەویش، یەکەیەکە ئیفادەی وەردەگرتن و لە ناو کەللـەی خۆیدا تۆماری دەکردن و سزاکەشی دەبڕییەوە. جاروباریش لە بەر خۆیەوە دەیبۆڵاند: مالوکوم ئەولادوکم فیتنەتون لەکوم... مالوکوم ئەولادوکم عەدو- ون لەکوم... لاحەولەوەلا... ئێ... ئێ... تێگەیشتم...

ئەو بە دۆلابەکەی دەستی و لاقە درێژەکانی و پۆستاڵە تۆقێنەرەکانییەوە دەهات و ناڵچەکانی پڕوشکیان دەهاویشت و ئاگر لە چاوە گچکەکانی دەباری، ئەمیش لە کەللـە سەرە گچکەکەی خۆیدا بە دوای درۆیەک، یا پیلانێکدا دەگەڕا (فەقێ یا غەنی)ی برای بە تێهەڵدان بدا و خۆی دەرباز بکا. دەیزانی کە باوکی دێتەوە، چاکترین کارێک بەو دەمودەستە کە دەبوو بیکات ئەوەیە، تا ماوەی دو سەعاتێک ماڵەوەی بۆ چۆڵ بکرێ. دوای ئەو دوو سەعاتە، دوور نەبوو غەزەبەکەی دامرکێتەوە. خۆ ئەگەر ماڵیشەوەی بۆ چۆڵ نەکا، باوکی فەرمانی پێ دەکا: بڕۆ پشیلەیەکم بۆ بگرە و بۆم بهێنە!.

پێنجشەممەیەکی نێرکەی بەهار، دەجاڵی باوکی بە ڕەوێ منداڵەوە کە بە دەوریدا دەخولانەوە و هەواڵی کردەوە نالەبارەکانی سەعدوونیان پێ ڕادەگەیاند، هاتەوە. پۆستاڵەکانی جیڕەیان دەهات. یەکێکیان جیڕەیەکی درێژ و ئەوی تریان کورت. ناڵچەکانی پرۆشکیان دەهاویشت. خوێن بەری چاوی گرتبوو. گلێنەی چاوی، وەک گلێنەی چاوی پشیلە، درێژۆکە بوون. دەیفیشکاند و ئاگر لە کونەلووتیەوە دەردەچوو. لەگەڵ هەنگاونانیدا، زەوی دەلەرزی و ڕەنگ لە ڕووی سەعدوونیشدا نەدەما. هەر کە خۆی بە حەوشەدا کرد، تەق، دۆلابەکەی دانا و قایشە ڕەشەکەی پشتی کردەوە و دوو سێ قایشی بە سەرە بەرەزوانەکەی، هەواڵەی سەروگوێلاکی سەعدوون کرد.

خوێن بە سەریدا فیچقەی کرد و لە دەرگای حەوشەوە دەرپەڕی. باوکی لە دوایەوە نەڕاندی:

- بڕۆ پشیلەیەکم بۆ بێنە دەی سەگە ددانگڕ!. سەعدوونش، بە دەم گریانەوە ئاوڕێکی لێ دایەوە: - ئەی بۆ غەنی ئەو پاندانەی دۆڕاندووە کە قەول بوو بۆی بهێنی کەچی لەو نادەی؟!. هەر لە من دەدەی. پاندانەکەی کردە قومار...

باوکی، لەو باوکانە نەبوو کە دیاری بۆ منداڵی خۆیان دەهێنن. هەرگیز، نە غەنی زاتی کردووە داوای پاندانی لێ بکا نە ئەو بەڵێنی داوە بۆی بهێنێ. ئێدی غەنی کامە پاندان بدۆڕێنێ؟.

- پاندانی چی هەتیو؟.

مەلا پۆلیس شارەزای خەسێتی سەعدوون بوو. بە ئارامی لێی چووە پێشێ و بە دوو پەنجە گوێچکەی گرت و بە کاوەخۆ گوتی: «ئەو پاندانەی (نە) دۆڕاندووە کە قەول (نە)بوو بۆی بهێنم و (نە)یکردۆتە قوماریش. دە بڕۆ دەی!». ئەوەی گوت و لە دڵی خۆشیدا گوتی: لێهاتووە و دەبێ بە شتێ!. سەعدوون، هەر لە سەری کۆڵانەکە هێندێ خۆڵی بە برینەکەی سەریەوە کرد. ئەوجا چووە سەر کانییەکە و کەوتە شوشتنەوەی برینەکەی و ئەو خوێنەی کە بە لامل و پشتییەوە داچۆڕابوو. منداڵانیش بە دەوریدا گرد ببوونەوە و پێدەکەنین. خوا پێی دابوون.

- چاکی لێدای، ها؟. هێ هێ هێ...

- با بچین پشیلەیەکت بۆ بگرین. هێ هێ هێ...

- بە خۆت و باوکت دوای پشیلەتان بڕییەوە. هێ هێ هێ...

- بە هۆی ڕاوە پشیلەی ئێوەوە، مشک تەراتێن دەکەن. هێ هێ هێ...

- سەعدوون سەگ نابێ؟!. هێ هێ هێ...

ڕقی لە هەموویان بوو. دەسەڵاتی هەبوایە دەیکوشتن. بەڵام ناچار بوو. گوتی: «پشیلە لە کوێ هەیە؟. بەڵام نابێ بەچکە بێ و ناشبێ بەچکەی هەبێ. باوکم دەڵێ ئەوانە گوناحن.» ئەوەی بە دەم گریانەوە گوت.

- باوکت پشیلەی باڵدار ، دەوێ. هێ هێ هێ...
- خۆت حەز لە پشیلەی تۆپیو دەکەیت. هێ هێ هێ...
- یەک پشیلە ڕوو ناکاتە گەڕەکەکەتان. هێ هێ هێ...
- لە خۆت و باوکت تۆقیون. هێ هێ هێ...
- ئەمڕۆ سبەی، شار لە دەست مشک چۆڵ دەکرێ. هێ هێ هێ...
منداڵەکان، دوو دوو و سێ سێ، بە نیازی ڕاوە پشیلە، بە ناو شاردا بڵاوەیان لێ کرد. هەموو شارەزای ئەو کارە ببوون و زوو زوو ئەو پیاوەتییەیان لەگەڵ سەعدووندا دەکرد و پشیلەیان بۆ ڕاو دەکرد. دەشیانزانی لە هەر گەڕەکێکدا ڕاوە پشیلە بکرابا، ئیدی ئەو گەڕەکە تا ماوەی چەند حەفتەیەک پشیلە ڕوویان تێ نەدەکرد. دوای ئەو چەند حەفتەیە، یەکە یەکە پشیلەکان، بە سڵەوە پەیدا دەبوونەوە و هەر کەسێکیان دەدی، بە تایبەتیی منداڵ، بە پەلە خۆیان دەرباز دەکرد و هەڵدەهاتن و خۆیان دەگەیاندە نزیکترین دیوار یا سەربان. لەبەر ئەوەی دەمێ بوو منداڵان فێری ئەو بەزمە ببوون، کەرەسەی ڕاویشیان هەبوو: داری درێژی سەر بە قوڵاب، گونییە، دەسکێش و پەت. دوو سەعاتی نەبرد، بەردەم ماڵەکەی مەلا پۆلیس بووە کەرنەڤاڵی منداڵ و پشیلە. مەلا پۆلیس یەک پشیلەی دەویست، ئەوان شەشیان هێنابوو. پشیلە ماڵییەکان بە دەستیانەوە بوون و بێخاوەنەکانیش لە گونییە نرابوون و دەمی گونییەکانیان لێ داخرابوون. مرەمڕ و میاوەمیاو و فیشکەی پشیلە، تێکەڵاوی پێکەنینی بێتامی منداڵەکان دەبوون و زووڕەزووڕ و گریانی سەعدوونش ببوونە (سووڵات)ی تیپێکی مۆسیقای کێوی. کە باوکی بە دارێکەوە دەرگاکەی کردەوە، سەعدوون هەستی کرد دڵی هەڵکەندرا و ئێستا نا نەختێکی تر لە قورگییەوە دێتە دەرێ. ناو دەمی تامی خوێنی دەدا. گریانەکەی زیادی کرد و بوو بە زووڕەزووڕ.
- سەوتی دایێ! هێ هێ هێ...
- ئەمڕۆ باوکی پیلی تازەی بۆ هێناوە!. هێ هێ هێ...
منداڵەکان پێدەکەنین. یەکێ لیکی بە دەمدا دەهاتەخوارێ و یەکێ چڵمی

هەڵدەلووشی و لووتی بە سەرقۆڵی کراسەکەی دەسڕی. هەمووشیان، بە نێچیر و کەرەسەی ڕاوە پشیلە و یەک دوو گونییەی بەتاڵەوە، چاوەڕوانی ئەشکەنجەدانی سەعدوون بوون.

باوکی بەرەو منداڵەکان چوو و گونیە پشیلەیەکی لە یەکێ لە منداڵەکان وەرگرت و شیراندی: چەندی تێدایە؟. منداڵەکە، بە دەم نەرمە پێکەنینێکەوە گوتی: یەک پشیلە نێرەی زل. ئەویش دارەکەی ڕاوەشاند و فەرمانی دا: «زۆر باشە!. بڕۆن دەی بڕۆن!. لەم ناوە نەمێنن ها! دوور نەکەونەوە، قانوون دەتانگرێ!». بە دەستەکەی تری، دەستی سەعدوونی گرت و بە زیرەزیڕ بەرەو ناو حەوشەکە ڕایماڵی. کە دەرگاکەی داخست، هەر ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو، سەعدوونی لوولدایە ناو گونییەکەوە و دەمی داخست. ئەوجا دارەکەی هەڵگرت و کەوتە لێدانی سەعدوون و پشیلەکە. سەعدوون پێی خۆش بوو پشیلەکە خۆی مات بکات. پێی خۆش بوو بە جەستەی خۆی وا پەنای لێ بکا کە داری بەر نەکەوێ. بەڵام پشیلەکە، دەیمڕاندەوە و دەیمیواند و هەر ئەوە نوبوو بێتە زمان. فیشکوهۆڕ و مرەمڕی پشیلەکە تێکەڵی هاواری سەعدوون دەبوون و مەلا پۆلیسیش هەر لێی دەدان و دەیشیراند: مالوکوم... ئەمەیەک. ئەولادوکوکم... ئەمە دوو. عەدو- ون... ئەمە سێ. لەکوم... ئەمە چوار. مالوکوم... ئەمە پێنج. ئەولادوکم... ئەمە شەش. زینەتون... ئەمە حەوت. لەکوم... ئەمە هەشت...

دەنگی مەلا پۆلیس و هەرا و بەزمی سەعدوون و پشیلەکە هەموو دراوسێکانیان ئاگادار کردنەوە و بە ژن و پیاو و منداڵەوە بە سەریاندا داباریین و لە بەر خۆیانەوە دەیانگوت: «دیسان بەزمەکەیە!». هەرچۆنێ بوو، مەلا پۆلیسیان لە گونییەکە دوور خستەوە. لە ماوەی دەستهەڵگرتنی مەلادا لە لێدان، سەعدوون ڕوانییە چاوی پشیلەکە. ئاگرەی چاوی درێژۆکە و مەیلەو سوور بوون. سپێنەشیان زەرد بوو. هەستی دەکرد پشیلەکە لێی دەپاڕێتەوە. خەڵکەکە، بە کاوەخۆ و بە سڵەوە، دەمی گونییەکەیان کردەوە. پشیلەیەکی زلی بۆر، بەر لەوەی دەربەڕێ، ماوەی یەک یا دوو

چرکە لە دەوروبەری خۆی ڕوانی. ئەوجا دەرپەڕی و بە چاوترووکانێک گەیشتە سەربانەکە و لەوێوە، ئاوڕێکی لە حەشاماتەکەی ناو حەوشەکە دایەوە. ئەوجا بە قەڵەمبازێک، چووە سەربانێکی تر و لە چاوان ون بوو. سەعدوونش، کە هەموو سەروگوێ و دەستوپلی خەڵتانی خوێن بوون و بە زەبری کەڵبە و چڕنۆکی پشیلەکە ڕێ ڕێ ببوون و هەموو سەروگوێی بە دار گرێ گرێ ببوو، سەری لە گونییەکەوە دەرهێنا و بە دوو چاوی ترساو و ددانی گڕی وەک کەڵبەی پشیلەوە، یەکە یەکە ڕوانییە ئەوانەی دەوروبەری خۆی و مته‌قی لێوە نەهات. تەماشای ئەو حەشاماتەی دەوری خۆی دەکرد کە لە چنگی پشیلە و پۆلیس ڕزگاریان کردبوو، دەروونیشی پڕ دەبوو لە ڕق و شەرم و دڵی شیشپەست دەبوو لە حەزی تۆڵەسەندنەوە لە پشیلە و پۆلیس و باوکی و لە هەموو بابەتە باوک و دەسەڵات و ڕزگارکەر و کوتەکبەدەستێک... لە هەموو کەسێک... لە خۆشی... خەڵکەکەش، لێکڕادەمان و تەماشای ئەویان دەکرد. ژنەکان بە چپە دەیانگوت: «ووی بیسمیللا! ئەوە چاوی بۆ وان؟. دە تۆ سەیری ڕەشێنەی چاوی بکە!». ئەوی تر دەیگوت: «ئاگرەی چاوی درێژە!». مێرمنداڵێکیش کە بە لای دایکییەوە وێستابوو، هەڵیدایێ: لەگەڵ پشیلەکەدا، چاویان گۆڕیونەتەوە!. سەعدوون، کوشتەی دەستی پشیلە و باوکێکی پۆلیس و پۆلیسییە!. سەعدوون دووچاری شیزۆفرێنیا هاتووە: لە لایەکەوە لە پپشیلە دەترسێ و لە لایەکی ترەوە بە گژ پڵنگدا دەچێ. لە لایەکەوە لە پۆلیس تۆقیوە و لە لایەکی ترەوە پۆلیسانە خەبەر دەدا. لێی ببوورن، کوشتەی دەستی باوکێکی نالەبار و چڕنۆک و کەڵبەی پشیلەیە و پۆلیسی و پشیلەسیفەتیی هەڵکەوتووە. ئەوێک لە نێوان ماڵێکی پۆلیسخانە و قوتابخانەیەکی ئینزیباتخانە و گونیە پشیلەدا هاتبێ و چووبێ و چ دەرەتانی تری نەبووبێ، هەر وا دەبێ، وا!.

# دووەم شەوی مالین*

کە خۆر ئاوا بوو و نۆرەی مانگ هات تیشکی خۆی پەخش بکا و گۆڕستانەکە زیوباران بکا، مالین لە گۆڕەکەیەوە هاتە دەرێ. بای باڵی دا و بە کاوەخۆ کفنەکەی بە خۆیەوە پێچا. لە ناوکی بەرەوخواری داپۆشی و لامل و سینگ مەمکی لەگەڵ تیشکی مانگدا کەوتنە چاوبرکێ و دەتگوت مانگیش تیشکی ئەو دەداتەوە. بە ناز و عیشوەوە بە سەر کێلە خواروخێچ و گۆڕە بێ نازەکان و (الفاتحە)دا هەنگاوی دەنا و لەنجەی دەکرد. خۆی با دەدا و جاروبارێ قریوەی پێکەنینی تێکەڵاوی داوە زیوینەکانی مانگ دەبوو. دەستێکی بە کەمەریوە بوو و چمکێکی کفنە بلوورینیەکەی پێ گرتبوو، کە لە بەر مانگەشەودا زیوینێکی ئاماڵ شین خۆی دەنواند، دەستەکەی تری بە قژیدا دەهێنا و قژە خاو و زەرد و درێژەکەی بە پشتدا، بەرەو باریکایی پشتی دەشکاندەوە.

- تەماشای ئەو شۆخە بکە!. شاجوانی گۆڕستانەکەمانە. تەماشای عیشوە و لەنجە و نازی بکە. چەندین سالی دنیا و هەزاران سالی قەیامەتە لێرەم و جوانی وا ڕووی لەم گۆڕستانە نەکردووە. چەندم مەراق بوو شۆخێکی

ئاوها بێته ئێره و ببێته سەرخێڵ و گەورەمان. ببێته پێشەنگی نێر و مێ و گەورە و گچکەمان. ئۆخەی ئاواتەکەم هاتە دی. ئەو ئەختەرە سەرڕشکنەی خۆمان گەورەیی لێ نایێ. ئەوەی کە ئەمەی گوت ژنێکی داڕزاو بوو. کرم لە زاری هەڵدەوەرین، جەستەی ڕزیبوو، لێرە و لەوێ لووڵاقی بە دەرەوە بوو. بزەی دەکرد و کرمی سپی لە زاری دەوەرین و بەردەبوونەوە بەر پێی و بەو ناوەدا پەرت دەبوون. کفنەکەی، ببوە چنگێ داوی ڕزیو و لە ناو دەستیدا هەڵیگرتبوو.

ژنە ڕزیوەکە لە سەر قسەی خۆی ڕۆیشت:

- گوێت لە قریوەی پێکەنینێتی؟. هەر دەڵێی زرینگەی زەنگوڵەی ملی شەکبەرانە. لەنجەولاری مراوییانە و ڕەوتی جوانووی هەیە. سەیری چۆن مانگەشەو شەق دەکا!... سەیری چەند جوانە!. دەک هەزاری وەک من بە بەلاگەردانی بێ!.

ژنە ڕزیوەکە هەر قسەی دەکرد و کرم لە زاری هەڵدەوەرین. کرمی ورد و درشت، لێرە و لەوێی جەستەیەوە سەریان دەردەهێنا و بەردەبوونەوە. ئەوەشی گوێی بۆ قسەکانی دەگرت، ژنێکی خڕکەڵە بوو. کونێکی خڕی بە قەدەر بنەپیاڵەیەک لە نێوان هەردوو مەمکیدا بوو. لای باریکایی پشتی هەڵتەکابوو. گوێی دەگرت و بە کاوە خۆ دەستی بە برینەکەی سەر سینگیدا دەهێنا. برینەکەی، هێشتا کەمێ خوێنی لە بەر دەڕۆیشت و ڕێچکەیەکی بەرەو خواری پێکهێنابوو. گوێی لە ژنە ڕزیوەکە دەگرت و هیچی نەدەگوت.

مالین گەیشتە لایان:

- شەو باش!.

- شەوت باش جوانی جوانان. شەوت باش گەورە و نازداری گۆڕستانەکەمان. خێر و خۆشیت لەگەڵ خۆتدا بۆ هێناین. ئەمشەوت لە دوێشەوت خۆشتر و سبەینێت لەمشەوت خۆشتر. گەورەیی هەر لە خۆت دێ. ئێمەی سەگی بەر قاپی ئەم و ئەو، ئێدی لە بەر گۆڕی تۆ وەردەکەوین.

ژنە ڕزیوەکە ئەوانەی دەگوت و بە لێشاو کرم لە زاری هەڵدەوەرین. لەگەڵ هەر وشەیەکدا، دەیان و سەدان کرم بەردەبوونەوە و بەو ناوەدا پەرت

دەبوون و بەرەو گۆڕەکانی تر دەکشان.
- شەوت باش خانمی جوان.
ئەمە وەڵامی ئەو ژنە بوو کە کونێ کەوتبووە نێوان هەردوو مەمکی. ئەوەی گوت و بە کاوەخۆ دەستی بە برینەکەیدا هێنا. کە تەماشای دەستی خۆی کرد، کرمێکی سپی بە نوکی پەنجەیەوە بوو. هاواری لێ هەستا: - ئەمە چییە؟. ئەمە یەکەم جارە کرمم هەبێ!.
مالین بە بزەیەکی مەغزادارەوە لێی ڕوانی. ئەوجا تەماشایەکی ژنە ڕزیوەکەی کرد و پرسی:
- ئەوە بۆ وا ڕزیویت؟.
- گەورە و سەروەری گۆڕستانەکەمان!. لە جیهانی زندوواندا ناوی قاچاغ و نهێنیم ئاشکرا دەکردن. ئێستا هەر ناوێک لەو ناوانە، بۆتە هەزاران کرمی نێر و مێ. لەشم خستبێتە خزمەتی هەر غەوارەیەک، هەر دڵۆپە شەهوەتێکی بۆتە هەزاران کرم. کرم لێی داوم. نە لە ژیاندا بە بێ کرم هەڵمدەکرد نە لێرە هەڵدەکەم. من لەزەت لەم کرمانە دەبینم. بە بێ کرم هەڵناکەم.
مالین قریوەی پێکەنینی بەرز بووەوە. بە نیازی ڕۆیشتن پشتی تێکردن و دوو هەنگاوی نا. کتوپڕ، وەک ئەوەی شتێکی بیر کەوتبێتەوە، لە جێی خۆیدا وێستا و ئاوڕی دایەوە. پرسی:
- ئەرێ ئەوە دوو شەوە لێرەم و چ پیاووم بەر چاو نەکەوتن. ئێرەش وەک قوتابخانەی زیندووەکان نێر بە جیان و مێ بە جیا؟.
- نا خانم. تا لە ژیاندا بووین، ژن بە ڕۆژ دەردەکەوتن و پیاو بە شەو. ئاخر شەو قەڵایان بوو. لێرەش، شەو قەڵای ئێمەیە. ئەوان بە ڕۆژ دەردەکەون ئێمەش بە شەو.
- ئەدی قەت یەکتر نابینن؟.
- با. کە ئێواران دێینە دەرێ، ئەوان لە گەڕانەوەدا دەبینین. لاقیان شۆڕ دەکەنەوە ناو گۆڕەکانیان و سەرنجێکمان دەدەن. بەیانیانیش کە ئێمە لاقمان شۆڕ دەکەینەوە ناو گۆڕی خۆمان، ئەوان سەر دەردێنن و سەرنجمان دەدەن. هەر ئەوەندە. ڕۆژی دوو جار. ڕۆژی ئێرە بۆ من ساڵە... ساڵی دوو جار.

مالین لە بەردەمی خۆی ڕاما و بە دەم سەرڕاوەشاندنەوە بزەیەکی کرد.
- خانم چۆن بوو ڕێت کەوتە ئێرە؟. ئەدی چۆن بوویتە فەرمانڕەوای گۆڕستانەکەمان؟.
- دوێنێ شەو شێرزاد منی هێنایە ئێرە و ناوی لێ نام شازادەی جوانان و نازداری نازداران. ئەو منی کردە گەورەتان، چونکە هەم ژنم و هەم جوانم و هەم ناکوردم و هەم ناموسوڵمان. ئەوانە مەرجی گەورەیی ئەم گۆڕستانەن و هەر من بە تەنێ ئەو مەرجانەم تێدا هەن. تێگەیشتی؟.
مالین، بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی پرسیارەکەی خۆی بێ، وەرچەرخا و بە دەم لەنجەوە ڕۆیشت. دەڕۆیشت و تیشکی هەڵرژاوی مانگی شەق دەکرد و داوە زیوینەکانی مانگ، خۆیان بە داوە زێڕینەکانی پرچیەوە دەئاڵاند. هێشتا زۆر نەڕۆیشتبوو، کیژێکی منداڵکاری باریکەلەی دی، کە ڕووەو مانگ لە سەر چنچکان دانیشتبوو. لە بەردەمی خۆی ورد دەبووەوە و چاوی دەگێڕا.
- ئەوە خەریکی چیت کیژی جوان؟.
- دەبێ خەریکی چی بم!. نابینی ملوانکەکەم پساوەتەوە و بە دوای مورووەکانیدا دەگەڕێم؟. جووتێ کوژەکەی دیار نین. لە دوێنێوە بۆیان دەگەڕێم.
- کچی جوان، لە کەیەوە لێرەیت وا سپوساغیت؟.
- دوێنێ. دوێنێ هاتم. دوێنێ لە ئاتەشکەدەیان دەرهێنام. شپوشۆڕێک گوتی: «تۆ سەبیەی منیت». وای گوت و دەستی بۆ سینگم هێنا. منیش دەستیم گەست و پڕ بە دەمم پچڕیم. ئەویش شیرەکەی بە ملمدا هێنا و ملوانکەکەی پچڕاندم. ئەوەتا لەوساوە خەریکم ئەو دوو کوژەکەیەش بدۆزمەوە ئەوسا بیانهۆنمەوە.
- بۆتیان بدۆزمەوە کچی جوان؟.
کیژەکە سەری هەڵبڕی. بە سەرسوڕمانەوە لە مالینی ڕوانی و وردە وردە هەستایە سەر پێ. بە سەریدا قیژاندی: - ئەوە تۆ کوژەکەکانمت دزیون؟. ئەوەتان لە جێی چاوی خۆتت داناون. بێنە کوژەکەکانم وێدەوە دەڵە سەگ!.

- کوژەکەی تۆ نین. چاوم بۆ خۆیان شینن. بۆتیان بدۆزمەوە؟.
کیژەکە بە دوودڵییەوە، جارێ لە بەر پێی خۆی ورد دەبووەوە، جارێ لە چاوی مالینی دەڕوانی. بە کاوە خۆ گوتی: - نەخێر مەیاندۆزەوە. ئەگەر ئەوانەی چاڵی چاوت هەو نەبن، دەتەوێ بیاندۆزیتەوە و بۆ خۆتیان ببەی. نەیخۆی تاڵە!. بە هەرچی پیر و موغان هەیە بزانم ئەوانەی جێی چاوت هەون، دەریاندەهێنم.
- کیژی جوان!. من بە فەرمانی شێرزاد، خاوەنی خۆت و ملوانکەکەتم.
- حەددت چییە؟.
مالین پێکەنی. بە دەم پێکەنین و ڕۆیشتنەوە گوتی:
- من دەچمە پەنای ئەو گۆڕە مەرمەڕییە و لە ناو تیشکی مانگدا مەلە دەکەم. ئەگەر یارمەتیت لێم ویست، بێ بە دوامدا.
- نامەوێ. چ یارمەتی تۆم ناوێ. ئێستا ئەختەر دێت و یارمەتیم دەدا.
مالین بە دەم لەنجەوە ڕۆیشت. دەڕۆیشت و سمتی بەرز و نەوی دەبوون. ژنێکی جوانکیلەی باڵابەرزی تووش بوو. ناوچەوانی پێکدادابوو. بە خێرایی تیشکی مانگی شەق دەکرد. مالین پێشی پێ گرت:
- ژنە نازدارەکە بۆ کوێ وا بە پەلە؟.
- هەقت چییە؟. بیستم هاتوویتە ئێرە و کراویتە گەورەی گۆڕستانەکە. نە هەقی هاتنت هەیە نە گەورەیی.
- بۆ ژنە نازدارەکە؟. خۆ ئێوە مێواننەوازن.
- نە نازدارم نە مێواننەواز. بە دەستی تۆوە ماندووی هەردو دنیام.
- تۆ کێی وا ئاوها قسان دەکەی؟.
- ئەختەر. ئەو ئەختەرەی بە فەرمانی باوکت کوژرا.
- ئەختەر؟ ئەختەر خەتەرە. بەڵام ئەختەر خۆت مەشێوێنە. نە من لە خۆڕا هاتووم و بوومەتە پێشەواتان نە باوکم. چاوساغێک منی لێرە دامەزراندووە و باپیری ئەو چاوساغەش باوکمی هێنایە ئێرە و دایمەزراند. ئێوە خۆتان دەمانهێنن، خۆتان.
مالین ئەختەری جێهێشت. بە دەم قریوەی پێکەنینەوە ڕۆیشت. ئەختەریش

له دواوه به ڕقەوه سەیری دەکرد. مالین گەیشتە گۆڕه گەوره مەڕمەڕییەکە. کفنەکەی لە خۆی کردەوه و بە درێژایی گۆڕەکە ڕایخست و بە کاوەخۆ لە سەری پاڵ کەوت. هێشتا بە تەواوی جێی خۆی خۆش نەکردبوو، دەستێکی گەرم و پەنجە ئەستوور مەچەکی گرت. لەگەڵ گرتنیدا دەنگێکی گڕ لە گۆڕەکەوه هات:

- مالینە جاسووس ئەوە لێرە چ دەکەی؟.

مالین بە دەم قاقای پێکەنینەوه گوتی:

- یاشێخ! شێرزاد منی ناردووە. ئەو منی بە گەورەتان داناوە. دەستم بەردە یاشێخ. لێرە گەورەم و لەوێ پەیکەرم بۆ دەتاشن. ناووم دەنێن «دایکی کورد». یاشێخ دەڵێن پەیکەرەکەی تۆش لادەبەن و پەیکەری ئەفسەرێکی دۆڕاوی ئەو خوارانە لە جێی دادەنێن. پەیکەری شاعیرێکی سەرزلی خۆتان لادەبەن و هی سەعدی لحیللی لە جێدا دادەنێن، یاشێخ!. ئەوەش خەتای منە یاشێخ؟. چاوساغی زندووەکان بڕیار دەدا کێ گەورەی ئێرە بێ و پەیکەر بۆ کێ بکرێ. دەستم بەردە یاشێخ!.

- نا مالینە جاسووس. گەورەی ژنانی گۆڕستان ئەختەرە. ئەو گەورەی پیاوەکانیشە. با پەیکەریشی نەبێ، ئەو گەورەی زندووەکانیشە.

- مەچەکم بەردە یاشێخ. چۆن بە بێ فەقیانە مەچەکم دەگریت؟. چما نازانی من هەم ژنم هەم غەیرەدین؟.

مالین ئەوەی گوت و پێکەنی. لەگەڵ پێکەنینەکەیدا مەمکەکانی دەلەرانەوە. ئەوجا لە سەری ڕۆیی:

- بۆخۆت لە ناو میللەتێکی دواکەوتوودا بە کۆنەپەرست ناودەبرێی. کە دواکەوتوو بە کۆنەپەرست ناوت بەرن دەبێ چی بیت؟!. من دۆستم گەلێ زۆرن و زۆر بەهێزن. دارودەستەی تۆش، یەک مەنجەڵ یاپراغیان بەسە. من پشتم قایمە یاشێخ. مەچەکم بەردە یاشێخ. بەرمدە با موویەک بۆ شێرزاد هەڵنەکورووزێنم. ئەو بێ، بە لەشکرێک ئاسکەکچەوە دێت و لە گۆڕت دەردێنێ. هەڵەبجەییەکی داڕزاو لە جێیەکەتدا دەشارێتەوە. گەرمیانییەکی گێل لە جێتدا سرنوگوم دەکا، تا من بە کەیفی خۆم، خۆم بە تیشکی مانگ

بشۆم و بێزار نەکرێم. ڕووخان لە دوای ڕووخانی تۆ، بۆ من سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنە یاشێخ. بەرمدە با باوکمت بۆ بانگ نەکەم. باوکم پێتان فێرە یاشێخ.

- باوکت؟. چما تۆ باوکی خۆت دەناسیت مالیە جاسووس؟.

مالین بە دەم قریوەی پێکەنینەوە گوتی:

- چما مێجەر ناناسیت؟. بیرت چۆتەوە یاشێخ؟. ئێستا من گەورەتانم، من. بۆ ئەوەی ژنان فێر نەبن خۆری زێڕین لە سەر شان و ناوچەوانیان دانێن، فێریان دەکەم عەڵقە بە ناوکیانەوە بکەن. ئاوها، لە لاوە وەک باوکم خزمەتی زمانەکەشتان دەکەم. وشەی لێ زیاد دەکەم.

- وشەی چی؟.

- ناوکەوانە، برۆوانە، بەرەوانە، ...

- ئێ؟.

- نەرم بووی یاشێخ؟. برۆیان کون دەکەن و عەڵقەی پێوە دەکەن. بەینی خۆمان بێ، ئەڵقە نیشانەی نەبڕانەوەیە... کۆیلایەتی بێ بڕانەوە. کە ئەڵقە بە هەموو جێیانەوە دەکەن، دەبنە ئەڵقەلەگوێ، ئەڵقەلەلووت، ئەڵقەلەبەر و ئەڵقەلە هەمووشت. ئەڵقەکان دەبنە زنجیر و ئێدی بە ویستی خۆم دەیانهێنم و دەیانبەم. نا، بە ویستی خۆیان دەبنە کۆیلەم. مەچەکم بەردە یاشێخ. سبەینێ مانگ دەبێتە چواردە شەوە. لە ئێستاوە جێی ددانم دەخورێ. سبەینێ دەبمە دراکولا و گۆڕستانەکە چۆڕبڕ دەکەم.

- نا، مالین لێت نابمەوە. تا خۆر لێت نەدا بەرت نادەم. تۆ برگەی خۆر ناگری. لەگەڵ گزنگی خۆردا لەناو دەچیت. ئاشکرا دەبیت و گۆڕستانبەدەر دەکرێی مالین. ئەوجا ئەختەر دەبێتەوە پێشەنگی ژنانی گۆڕستانەکە.

- دەستم بەردە یاشێخ، خەریکە بەیان دەدا.

- با بەیان بدا. چاوەڕوانم خۆر لێت بدا. چاوەڕوانی خۆرم خۆر.

- بەرمدە یاشێخ. خۆریش هەڵبێ هەر دەمێنم. کە خۆر هەڵبێ و هەر لێرە بم، کوڕەکانی خۆت دێن و جووتێ باڵی ڕەشی زەبەلاحی شەمشەمەکوێرە لە دیار سەرم ڕادەگرن و لە خۆرم دەشارنەوە.

ـ تیشکی خۆر، باڵی شەمشەمەکوێرە دەسمێ و دەتکاتە چنگێ خۆڵەمێش.

ـ لە هەموو جێیەک دەیسمێ، بەڵام لێرە قەت نایسمێ، قەت.

ـ با، دەیسمێ. لێناگەڕێین لێرەش کەڵەگامان بیت.

ـ نایسمێ.

ـ با، دەیسمێ. سبەینێش نەیسمێ دووسبەی دەیسمێ.

ـ بەرمدە یاشێخ. با داوە موویەک بۆ باوکم و شێرزاد هەڵنەکورووزێنم. دێن و دنیا تێدەگەیەنن: شێخ بە بێ فەقیانە مەچەکی ژنێکی غەیرەدینی گرتووە. ئەوجا دەتکەنە شێخێکی بێ دەسنوێژ و گڵاو. ئێدی مەنجەڵە یاپراغیشت فت یاشێخ.

ـ لێت نابمەوە مالین. لێناگەڕێم یەک دڵۆپە خوێنی تر بمژیت. لێت نابمەوە. شێخ مەچەکی مالینی بەرنەدەدا. خۆر خەریک بوو گزنگ بدا و شێوەی مالین وردە وردە دەگۆڕا. لۆچ دەکەوتە ڕوخساری. درز و تلۆق دەکەوتنە پێستی جەستەی. لە پێکەنین کەوت و هێواش هێواش دەپەشۆکا. دەورووبەری گۆڕستانەکەش پڕ ببوو لە حەشامات. جووتێ باڵی ڕەش و زەبەلاح بە ناو حەشاماتەکەدا ئەم دەست و ئەو دەستیان دەکرد. خەڵکەکە هاواریان دەکرد. دەستەیەک دەیانگوت:

ـ دەبێ داپۆشرێ و بۆ سەرگەورەییمان بمێنێ.

دەستەیەکی تر هاواریان دەکرد:

ـ نابێ داپۆشرێ. با خۆر لێی بدا و ڕسوا بێ. با لە کۆڵمان بێتەوە.

ـ دەبێ...

ـ نابێ...

ـ دەبێ...

ـ نابێ...

* بنەمای ئەم چیرۆکە، چیرۆکێکی (شێرزاد حەسەن)ی چیرۆکنووسە. کات و شوێن هەمان کات و شوێنی چیرۆکەکەی ئەون: (شەو و گۆڕستان).

# پانتۆڵی جینس

هەردوو دەستی لە تەختەیەکی کەمێ کەوانەیی گیر کردبوون و بە کاوەخۆ لاقی دەبزواندن. وەها دەستی لێ گیر کردبوو، وەک ئەوەی جگەرگۆشەی بێ. شەپۆلەکان دەهاتن و بە سەر سەریەوە دەنیشتنەوە و ئەویش، تەختە کەوانەییەکەی بەر نەدەدا. شەپۆلەکان یەک بە دوای یەکدا و بە نۆرە دەهاتن. چنگی لە تەختەکە بەرنەدەدا. نوقم دەبوو و دەردەکەوتەوە. بێ ئەوەی پێوەی دیار بێ بزەی دەکرد: «کێ لە ڕۆژێکی وادا ئەمەی دەست دەکەوێ؟ چەندین کەس پەلاماریان دا و ئەم لەوی دەفڕان ئەویش لەم! لە ئەنجامدا، بۆ من مایەوە. بە دوو باسکە مەلە پێی گەیشتم. تەواو! نە کەس ماوە لێمی بفڕێنێ نە شەپۆل لە دەستمی دەردێنێ. من و ئەم تەختەیە هاودڵی یەکین. ئەو بڕوا، منیش دەڕۆم! چارەنووسمان بە یەکەوە گرێ دراوە. ئەو نقوم بێ منیش نقوم دەبم. چ قودرەتێک ئەمەی گەیاندە دەستی من؟ لە ساتی مان و نەماندا کەس ناپەرژێتە سەر کەس. هەر کەسنە و دەڵێ ڕۆحی خۆم! منیش دەستم لێی گیر بوو و گوتم: ڕۆحی خۆم!»

شەپۆلێکی سەر بە کەف بە سەریدا شۆڕ بووەوە. نەیدەزانی ئەوە چەندەم جار بوو شەپۆلی وا پەلاماری بدا. شەپۆلەکە، ویستی تەختە کەوانەییەکەی لە دەست بفڕێنێ. ئەو جارەش نەیهێشت. توند توند گرتبووی و بەری نەدەدا. خەریک بوو پەنجەکانی ماندوو دەبوون و تەختەکەش وەک ئەوەی لە هەڵپەی دەربازبووندا بێ، بەتینتر خۆی رادەپسکاند. تەختەکە هاوکاری شەپۆلەکانی دەکرد. لە ئەنجامدا، هەر جارە و بە دەستێکی دەیگرت تا ئەوی دی پشوو بدا. بەڵام ماندووبوونی تاکە دەستەکە لە دوو بەرابەر زیاتر دەبوو. ئەو، هەوڵی دا بیخاتە بن باڵی. شەپۆلێکی گەورە هات و چمکێکی بە سەریدا دا و تەختە کەوانەییەکە لە دەستی پەڕی. هەوڵی دا بیگرێتەوە، بەڵام شەپۆلەکە، بە یەک قەڵەمباز دووری خستەوە. لایە سپییەکەی لێوە دیار بوو و بستێ نێزیک دەبووەوە و دە بست دوور دەکەوتەوە. چاوی تێ بڕیبوو و بە کاوەخۆ مەلەی دەکرد. هەوڵی دەدا ماندوو نەبێ و دەستیشی لە تەختەکە گیر بێتەوە... چاوی هەر بە دوای تەختە کەوانەییەکەوە بوو تا لە نێوان شەپۆلەکاندا لێی بزر بوو.

«من لە کوێ و تۆ لە کوێ ئەی زەریای بێ سنوور؟ تۆ بۆ گەرمیان هاتیتە لای من یا من هاتم؟ چۆن و بەچی گەیشتیتە دەڤەری من؟ یا من چۆن گەیشتمە ناو سنووری تۆقێنەری تۆ؟ چۆن هاتم و بە چی هاتم؟ ئەو تەختە کەوانەییەت بۆ چی بوو وا لێت فڕاندم؟ من دەمویست پێی دەرباز بم. ئەدی تۆ بۆ چیت بوو؟ کەمت تەختە هەیە؟ هەر ئێستا بەلەمێکی وات لووشدا هەزاران تەختەی وەک ئەوەی پێوە بوون، کەچی چاووت هەر لەمەیان بوو و وازت نەهێنا تا لێت فڕاندم! چۆن زەریا بەو هەموو سامانەوە کە هەیەتی، ئاوها چاوچنۆک دەبێ؟»

بیابانێکی ساردوسڕی ئاو! شەپۆڵە ورد و درشتە سەر بە کەفەکان، جێی پنچکە حوشترخۆرەکانیان گرتبۆوە. ئەوان خۆڵ و تۆزیان لێ نیشتبوون و ئەمانە کەف! لە بیابان لم و لە زەریا ئاو! لە بیابان گەرمای سووتێنەر

و له زەریادا سەرمای ئێسکتەزێن. لەوێ گورگ، لێرە قرش و نەهەنگ. لەوێ عارەب، لێرە قاچاخچی. لەوێ گۆڕی بەکۆمەڵ و لێرە کۆمەڵی بێ گۆڕ. لێرە تەقەتەقی بەلەمی شرۆشەق، لەوێ هاڕە و جیڕەجیڕی دەمی شۆفڵ. لێرە: فریام کەون خنکام، لەوێ: فریای کەون بیکوژن... نەهێڵن دەرچێ! لێرە ئاو تەختەت لە دەست دەڕفێنێ و لەوێ مینت پێوە دەلکێنن!

«من لە کوێ و تۆ لە کوێ ئەی زەریای بێ سنوور؟ من هاتمە ژوانی تۆ یا تۆ هاتیت؟ خوایە وەک مەشکە پفم بدە! لەم ساتەوەختەدا زگم با ناکا. لە بیابان، زگم ببوو بە مەشکەی پفدراو. هێندەم با کردبوو، چوارپەلم ببوون بە چوارپەلی کیسەڵ. ئێستا کە پێویستێم بە باکردنە، با ناکەم. وەک شەشپەلی جۆلاییکەرە چوارپەلم درێژن. چوارپەلم بوونەتە سەوڵ بۆ جەستەم بەڵام هێواش هێواش بەرەو سڕبوون دەچن. ئەی خوایە کۆتەرەیەک، بنەدارێک یا تەپەدوورێک! خوایە دوورگەیەک هەر جێی هەردوو دەستمی لێ ببێتەوە. توخوا شەپۆلەکان! ببنە سەهۆڵ و ڕەق بن تا خۆم لە سەرتان بگرمەوە! شەپۆلەکان! لێمگەڕێن سواری کۆڵتان بم و بمبەن... بەرەو کەنار، هەر کەنارێک... کەناری یۆنان... کەناری تورک یا کەناری گورگ. خەریکم سڕ دەبم. نا، هیچی لێ نییە، تەنها بیابانێکی ئاوە و تەراویلکەی خەیاڵە. بیابانی ئاو، تا چاو بڕ دەکا دەکشێ. لێرەوە تا ئەو شەپۆلە زلەی کە ئێستا نیشتەوە چەند هەنگاوە... هەنگاوی چی؟ بە باسکەمەلە چەند باسکە؟ پێوانەی هەردوو بیابان، چ لم بێ چ ئاو، ڕاست دەرناچێ. مەزەندە لە هەردووکیاندا دەستەوەستانە. هەردووکیان مرۆ خەواڵو دەکەن. خەویش لە ئامێزی هەردووکیاندا مەرگە و بەئاگاهاتنەوەی بە دوادا نایێ! من چی گەیاندمیە ئەم بیابانە ئاوییە؟ بۆچی و لە دەستی چی هەڵاتم و هاتم؟ کێ کەڵکەڵەی ئەم سەفەرە تەڕ و ساردەی خستە کەللەمەوە؟ ژیانی شاهانەی کوڕە بەگزادەکانی هەموو سەردەمەکان یا ژیانی کولەمەرگی ئۆردوگاکە و خەلقەندە بنکڕەکانی بەشەر؟

ئەی خوایە پفم دە! شەپۆلەکان! تەختە کەوانەییەکەم وێدەنەوە! من لە کوێ و تۆ لە کوێ ئەی زەریای بێ سنوور و بێ دوورگە و بێ کەنار و تەپەدوور؟ چی منی گەیاندە ناوەندی ئەم بیابانە ئاوییە؟ بەلەمە شرێک؟ ئەدی چی منی گەیاندە بەلەمە شڕ؟ قاچاخچییەک؟ ئەدی چی منی گەیاندە دەستی قاچاخچی؟... ئەوە دەڵێی چی؟! چما بەوەی نازانی؟! ئێستاش هەر نەتزانیوە؟! ئەوەی کاتی خۆی منی گەیاندە بیابانی لم، هەر خۆی گەیاندمیە بیابانی ئاو. ئەوسا وەک پەز پێشیان کەوتم... بێ ئەوەی نارەزایی دەربڕم بەرەو بیابانی لم سوار بووم. میزم بە خۆمدا دەکرد. میز بە شەڵتە بە ناو لۆرییە داخراوەکەدا ڕژابوو و پەرت ببوو. میزی هەمووان، هەمووانی تەڕ کردبوو. بردیانم. وەک پەز دەمباراند! من دەمباڕاند و لم نە دەیبیستم نە دەنگمی دەدایەوە. هەموو دەنگێک لە بیاباندا دەخنکێ. هاوارم دەکرد: «خوااااا...» لمی زاڵم و زندەوەرەکانی بیابان و وشتر و عارەب و ئەستێرە و مانگ، نە دەیانبیستم نە دەنگمیان دەدایەوە. ئا، دەنگ لە بیاباندا دەمرێ... دەبێ تا هێزت تێدایە بشیرێنی تا دەنگت بگاتە دوو هەنگاو ئەولاتر. هەر خۆم و دەمی شۆقڵ دەنگی یەکترمان دەبیست و دەدایەوە و بەرەو ڕووی یەک ببووینەوە. ئەو بۆ کوشتنم، من بۆ پاراستنی ژیانی خۆم. دەمویست قەپ بە دەمی شۆقڵەکەدا بکەم و وەک کولێرە بیقرتێنم. ئێستاش ئەم بیابانە ئاوییە هەر لرفەی دێ... دەڵێ: پفففف.. کششش.. شڵپ... پفففف... فففووو! دەبێ کەس هەبێ لە زمانی ئەم بیابانە ئاوییە ساردوسرە تێبگا؟ ئا، من لە ترسی بیابانی لم خۆم گەیاندە ئەم بیابانە ئاوییە! زمانی ئەم لرفەلرف و زمانی ئەو گڤەگڤ! نە لەمیان تێدەگەم نە لەویان تێگەیشتم! خوایە ساتر نەدەی! ئا، ئا! ئەگەر قرشێک بێت و لاقێکم فت بکا! قرشی ئەم بیابەنە ئاوییە، وەک شۆقڵی بیابانی لم، نە بەزەیی دەزانێ نە خوا دەناسێ! قرش، ئەگەر لاقێکم بەرێ، سەوڵێکم کەم دەبێ. خوێن لە جەستەمدا نامێنێ و ڕەق دەبمەوە. ئەوجا، هێواش

هێواش بەرەو بنی ئەم بیابانە ئاوییە قرش و قاچاخچی و قاچاخنشینە شۆڕ دەبمەوە و بە ئەسپایی، بێ ئەوەی هیچ کوێم بشکێ لە سەر بنە مەرجانێکی لیچ دەنێشمەوە. لە بەر دەرکی کونی بنە عەگولێکی ئاویی یا لە سەر پشتی ئەستێرەیەکی زەریا دەنیشمەوە. دەرزیئاژنم دەکەن و تەڕایی جەستەم دەمژن. چاو دەگێڕم: چ بەهەشتێکە! ئەو ڕەنگانە لەو بن ئاوە چ دەکەن؟! خوا فرسەت بدا، هەناسەی ئاو هەڵدەمژم. وەک ماسی و قرش. لەو بن ئاوە دەبمە پەنابەر و دەژیم.
شەپۆلەکان تەختە کەوانەییەکەم وێدەنەوە! ئەی خوای گەورە پفم دە! وەک هەمبانە پفم دە با سەر ئاو بکەوم! دوورگەیەکی یەک بستیی بڕەخسێنە! ئاراستەی کەشتییەک یا بەلەمێکی شڕ بەرەو ئێرە بگۆڕە! چۆن لە بیابانی لم فریام کەوتی و لە بیابانی ئاو فریام ناکەوی؟ دەمی شۆفلەکە، خۆڵ و کەستەکی هێنا و من دەپاڕامەوە: خوایە بەرەو ئەولاتر! کەچی هێنای... لوولی دا و هێنای و بە سەرمدا هەڵیڕشت. دوو کەستەک، یەکێکیان کەوتە ئەملای سەرم و ئەوی دی کەوتە ئەولای. باش بوو خوا بە قسەی نەکردم! بە قسەی کردبام دەفەوتام! کەستەکەکان، سەریان لە هەموو قورساییەک پاراستم و کونێکیش لە نێوانیاندا، ڕووەو دەموچاووم کرایەوە و هەناسەم دەدا. لە بن ئەو خۆڵەوە کەس نەیدەبینیم. من زندەبەچاڵ کرابووم. من پێش خۆمم دەدی. شۆفلەکان ڕۆیشتن. گرمەگرمیان، زۆری نەمابوو هەرەس بە کەستەکەکان بێنێ و هەناسەم ببڕێ. چەکدارەکانیش ڕۆیشتن. کەس لەوهەتەر و دەوروبەرەدا نەما. من مامەوە و ژمارەیەک... تەرمی بەشەر، کە پێشتر ژن و پیاو و کچ و کوڕ بوون و میزی هەموویان بەر هەموویان کەوتبوو. هەموویان، بە درێژایی ئەو ڕێیە وەکو من باراندبوویان. هەموویان، ببوونە گۆشتی هەنجراو و ئێسکی تێکشکاو. ئەوەی لەو بن خۆڵەوە بێزاری دەکردم، گەرمایی کەستەکەکان بوو. وەکی دی، لە هیچم کەم نەبوو. دڵم لێی دەدا و هەناسەی پاکم هەڵدەمژی و پێش خۆمم بە ڕوونیی دەبینی و زمانم

بە لێومدا دەهێنا. خەیاڵیشم، جوان کاری خۆی دەکرد و چاک دەمزانی دەبوو چ بکەم! لە چیم کەم بوو و چی ترم بویستبا؟ لە هیچم کەم نەبوو. لە هەموو ئەوانە باشتر بووم کە کەوتبوونە تەپان بنی چاڵەکەوە و یەک مەتر خۆڵیان بە سەردا درابوو. کچی جوان و کوڕی ئازاشیان لەگەڵدابوون، بەڵام جوانی و ئازایەتی بە کەڵکی چی دەهاتن؟ یەکێ لە کیژەکان یەکجار جوان بوو، بەڵام ترس، کەمێ جوانییەکەی شێواندبوو. لە ناو هەموویاندا من براوە بووم. من، بێ ئەوەی سەر شۆڕ بکەم و داوای لێبوردن لە کەس بکەم، ژیانم بردبۆوە!
خوایە پفم دە! نیوەم بکە بە هەمبانە و نیوەکەی ترمی پێ دەرباز بکە! چۆن لە ناو بیستوپێنج کەسدا بە تەنها من نقوم نەبووم، ئاوهاش بمگەیەنە وشکان! وشکانی گورگیش بێ ڕازیم! بە وشکانی دڕندەکان ڕازیم... دڕندە قسەیان لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام ئاو هیچ نازانێ لرفەلرف و لووشدان نەبێ. نقومبوون لە ئاودا ئیعدامکردنێکی بێ پەتە. من چیم کردووە تا ئیعدام بکرێم؟ خوایە پفم دە با سەرئاو بکەووم. خوایە جێی هەناسەم لە ناو ئەم بیابانەش بۆ بهێڵەوە! خوایە سەرمامە!...
بە شەپۆلەکان بڵێ تەختە کەوانەییەکەم وێدەنەوە! ئەوان تەختەیان بۆ چییە؟ خوایە پفم دە!
لە بیابانی لمدا، نەفەرێک ویستی ڕابکا و گرتیانەوە. مینێکیان بۆ دانا و لە سەری دایاننیشاند. گوتیان: «ئەگەر هەستیت مینەکە دەتەقێ و پارچەپارچە دەبیت! بۆ خۆت دانیشە و چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوا بە!»
ئاوها، لەو بیابانە گەرمەدا کە هەناسەی سوار دەکرد، لە سەر مینەکە جێیانهێشت. مینەکەش داغ ببوو. وەک ئاسنی قەد لۆرییەکە داغ ببوو. لە لمەکە گەرمتر بوو. دڵنیام ئاواتەخواز بووە مێنەکە پلاستیک بوایە.
تا لە چاومان بزر بوو، من هەر تەماشام دەکرد. بیرم لێی دەکردەوە:
تا شەو دادێ لە جێی خۆی دادەنیشێ. شەو، کاتێ مینەکە سارد دەبێتەوە و هەناسەیەکی حەوانەوە هەڵدەمژێ، یەک دوو گورگ بۆی

دێن. بنی مین و دەوری گورگ! گورگەکان، هەر بە بۆن بۆی دێن. هەر هەڵناسێ. گورگەکان پەلاماری دەدەن و لە جێی خۆی دەیبزوێنن و مینەکە دەتەقێ. دوای ئەوە، لاشەی لەتوپەتکراوی دوو گورگ و کوردێک تێکەڵ دەبن و کەس نازانێ کامەیان پارچەی کوردە و کامەیان پارچەی گورگە. تۆ بڵێی مینەکە کوێرەک بووبێ؟ کێ گوێی لە تەقینەوەی بوو؟ کەس! بەڵام ئەگەر وا بوایە، ئێستا لە ناو ئەم بیابانە ئاوییەدا تووشی دەبوومەوە. ئەویش دەچووە هەندەران! وەک من، بە پانتۆڵی جینسەوە دەکەوتە ڕێ... کێ دەڵێ دەربازیش نەدەبوو؟!

خوایە پفم دە! ئەی بیابانی بێ سنووری ئاو، من لە کوێ و تۆ لە کوێ؟! چی تۆی گەیاندە من؟ ئەو هەموو ڕێیە بۆ چی هاتی و چۆن هاتی؟ بە بەلەمێکی شرۆشەق؟ یا من بۆ لای تۆ هاتم؟ ئەی زەریای بێ سنوور و کەنار و دوورگە! ئەم لرفەلرفەت هەراسانم دەکا. هەر دەڵێی لەگەڵ بیابانێکی وەک خۆتدا لە حاڵەتی جووتبووندایت و خەریکە ڕەحەت دەبیت! ئەم لرفەلرفە بەردەوامە چۆن ناتکوژێ و کێ بەرگەی ڕەحەتبوونێک دەگرێ بیست چرکە بخایەنێ؟ تۆ چەند سەدەیە لە باری ڕەحەتبووندای! تۆ خەریکی لرفەلرفی هەوەسیت و منیش وا ڕەق دەبمەوە. مەرگی من، بۆچی ڕەحەتت دەکا و چت لە مەرگی من دەست دەکەوێ؟ ئەی شەپۆلە چاوچنۆکەکان! تەختە کەوانەییەکەم وێدەنەوە! وێمدەنەوە با کەمێ پشوو بە باسکم بدەم! وێمدەنەوە بە هیوای مانەوە بۆم ببێتە کەشتییەکی بەتین و دەربازم بکا!

ئەگەر ئێستا دەستم لەو مینە گیر بێ کە بۆ ئەو کوڕە گەرمیانییە دایاننا، ئامێزی پێدا دەکەم چونکە لە خنکان دەربازم دەکا. دڵنیام ئامێزی پێدا دەکەم! تۆ بڵێی دەربازم نەکا؟! ئەگەر ئێستا ئەو دوو کەستەکەی ئەملا و ئەولای سەرم بە وشکی چنگ بکەون، بە هەموو سامانی دنیا دەیانکرم. ئامادەم لە سەر ئەو مینە دانیشم کە بۆ ئەو کوڕەیان دانا، بە مەرجێ لە ناو ئەم هەموو دڵۆپە ئاوە یەکگرتووانە نەبێ... بە مەرجێ لە وشکان

بێ!... ئاخ وشکانی هەوا خۆش و بۆن خۆش و بەتین و مسۆگەر لە کوێی؟»

خەو سواری سەری ببوو. سەری دەسوورِا. دەوروپشتی ببوو بە چراخان و چاوی لە ئاستیاندا هەڵنەدەهات... خەو دایگرت و بەرەو بوورانەوە بردی... هەستی دەکرد دەوروپشتی ڕووناکە، بەڵام بەردەمی تاریکە و ئاوە قەترانییەکەی بەر لووتی خۆی نەدەی. شەپۆلەکان، یەک بە دوای یەکدا دەهاتن و دایاندەپۆشی. تەختەدارێکی کەوانەیی، یەک دوو جار بەر سەری کەوت. وەک ئەوە بوو دەستی ئازیزێک بیەوێ لە خەو هەڵیسێنێ. هۆشی لە کار کەوت، بەڵام دەمارەکانی جەستەی دەفرِین! لە ئەنجامدا، دەموقلّپ لە سەر ئاوەکە ڕاکشا. وشەی (جینس) کە لە سەر گیرفانی ڕاستی پانتۆڵەکەی نووسرابوو، جارێ بن ئاو دەکەوت جارێ سەرئاو دەکەوت... جارێ بە ڕوونیی دەبیندرا و جارێ بە ئاستەم، دەخوێندرایەوە و نەدەخوێندرایەوە. دەبووە جنس... دەبووە جسن... دەبووە وێنەی دراو... گێرفانەکەی تری، وێنەی شووشەی کۆکاکۆلای لە سەر بوو: نەیخۆیتەوە ناحەسێیتەوە!. شان بە شانی تەختە دارێکی کەوانەیی، شەپۆلەکان دەیانبرد و دەیانهێنا و جارێ بەرزیان دەکردەوە و جارێ دەیانخستە بن خۆیانەوە و زەریاکەش هەر لرفەی دەهات...

# سەبیە شێت

کچێکی منداڵکاری ڕووتوقووت، منداڵە کۆرپەیەکی وەک خۆی ڕووتی لە کۆڵ نابوو و ڕایدەکرد. مەمکە تازە بناغەکردووەکانی، وەک دوو فەریکە گوێز بە سینگیەوە لکابوون، و هێشتا گەندەمووی پێناسەی ڕەخسینی لێ نەڕوابوو. پرچە درێژ و پڕەکەی، جارێ دەکەوتە سەر ڕوخسار و سینگی، جارێ دەکەوتە پشتییەوە و بایەکە دەیشەکاندەوە. بە دەم ڕادکردنەوە، دەمێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە، جارێ تەماشای پێش خۆی دەکرد. تاوێ بە لای ڕاستیدا دەڕوانی، تاوێ بە لای چەپدا. دەوروبەری، دەریایەکی تەزاویلکە و بیابانی گەرم و تۆقێنەر بوو. ناو دەمی، وەک بیابانەکە وشک و هەناسەی وەک گڕەی بایەکە گەرم بوو. خۆر بەرەو نیوەڕۆ دەکشا و سێبەری خۆی و کۆرپەکەی کۆڵی، بستێ لە بەرپێی دوور کەوتبۆوە. گەرما و گڕە هێڵەیان دەکرد. تا چاو بڕ دەکا زیندەوەر دیار نەبوو ئەو جەستە هێشتا منداڵە نەڕەخسیوە ڕووتە و کۆرپەکەی کۆڵی نەبێ. وا ڕایدەکرد کە دەمی تیغێکی بە دواوە بێ و هەرچی بکا،

نابێ بیگاتێ. لەو ساتەدا، ئەوەی دەبوو لە دەستی هەڵبێ، مەرگ بوو نەک گەرما و تینوێتی و ماندوێتی و ڕووتی... ئەوەی بە بیریدا نەدەهات، پەککەوتن بوو. دەبوو هەر ڕا بکا تا لە سنووری مەرگ، کە نەیدەزانی لەکوێ کۆتایی دێ، دەردەچێ. پشتی نەبێ، کە منداڵەکە خۆی پێوە نووساندبوو عارەقەی دەردابوو، ئیدی هەموو لەشی وشک هەڵگەڕابوو و وێ نەدەچوو تەڕایی تێدا بێ. لەگەڵ هەر هەنگاوێکیدا، تەپوتۆز لە بەر پێی هەڵدەستا و شانبەشانی قەڵناشکە و کەرخۆرە و پنچکی وشکی تری ئەملاو وئەولای، کە بە تیژیی غل دەبوونەوە، دەڕۆیی. گڤەگڤی بایەکە بەردەوام دەهات و جاروباریش نووزەیەکی بە ئاستەمی منداڵەکەی کۆڵی تێکەڵ دەبوو.

نەیدەزانی لە کەیەوە ڕادەکا. وێدەچوو، هەموو تەمەنی، هەر ڕایکردبێ و وەک کار ئاسکێک کە دایکی لە دەست ڕاوچی ڕابکا و بە دەم ڕاکردنەوە بزێ، ئەویش بە دەم ڕاکردنی دایکییەوە لەدایک بووبێ. نەشیدەزانی بۆ ڕادەکا. کەتنێکی کردووە و هەموو کەس و هەموو زیندەوەرێکی ڕووی زەوی تاقیبی خوێنی دەکەن؟. چ کەتنێ؟!. ئەوەی دەیزانی هەر ئەوە بوو کە لوولەی تفەنگێکی بە دواوەیە و ئێستا نا نەختێکی تر دەپێکرێ. سونگی تفەنگەکە، بەر لە هەموو جێیەکی، بەر ناولنگی دەکەوێ. ئەوجا هەموو جەستەی: سەری، سینگی، زگی، ڕانی، پووزی، پاژنەی پێی... هەموو لەتوپەت دەکرێن.

قژ و برۆ و برژانگی، لەگەڵ شوێنەکانی تری جەستەیدا، لێک جودا نەدەکرانەوە و هەموویان، وەک قمقمۆک، ڕەنگی لمی بیابانیان گرتبوو. ڕاکردنەکەشی، بە غلبوونەوەی قەڵناشکە وشکە بۆرەکان دەچوو کە لەملا و لەولایەوە، بە تیژیی دەهاتن و بە لایدا ڕەت دەبوون، و هێندێ جاریش بەر پاشەلی دەکەوتن.

منداڵەکەی کۆڵی جیقەیەکی لێوە هات. ئەویش هەر هێندە ڕەوتی خۆی گۆڕی کە نیوە ئاوڕێکی لای شانی چەپی بداتەوە کە سەری منداڵەکە

له سەری، لەگەڵ هەنگاوەکانیدا دەلەرایەوە. نەیدی. پێ نەدەچوو بزانێ چی بە کۆڵەوەیە. ئەو شتە خڕەش یەکێک بوو لە ئەندامەکانی لەشی و پێوەی نوسابوو. خۆ ئەو کە ڕایدەکرد، بیری لەوە نەدەکردەوە قاچی چ ئەرکێک دەبینن و سەری بە کەڵکی چی دێ. هەموو ئەندامەکانی جەستەی بۆ ڕاکردن لە کاردابوون و ئەو شتە خڕەی سەر شانیشی هەمان ئەرکی دەدی. منداڵەکە، جیقەیەکی تری لێوە هات. دەنگی بە دەنگی بەچکە پەڕێسێلکەیەک دەچوو کە دایکی لە هێلانەوەی هەڵدابێ و ئێستا نا نەختێکی تر منداڵ، ملە باریکەکەی بپچڕێ.
سەری منداڵەکە، لە سەر شانی ئۆقرەی نەدەگرت: ئەملا و ئەو لای دەکرد و هێندێ جار بەرەو خوار، بۆ لای باریکایی پشتی دادەتەکا. ئەویش، هەر بە دەم ڕاکردنەوە تەکانێکی بە خۆی دەدا و دەیهێنایەوە جێی خۆی.

* * *

دەنگەدەنگێ لە گوێی دەهات کە بە وژەوەژی با و خشەی قەڵناشکە دەچوو. دەتگوت لە قوڕگێکی یەکجار گەورەی بە قەدەر بیرێکەوە، کە ژێیەکانی هێندەی خرێنەیەک ئەستوور بن، دەنگ دێ: کووووو... مااا... کاااا... نێێێێێ... چششش... لێێێ... ئووو... ئممم...
چاوی کردنەوە. دەوری بە سەر گیرابوو. هێندێ لە سەرەکان پێچرابوونەوە. هەر سەرە و دوو چاوی پێوە بوون و لێی ورد دەبوونەوە. سەرەکان، لێوی خۆیان دەلستەوە. بزەیان دەکرد. لیک بە زاری هێندێکیاندا دادەچۆڕا. لە پشت ڕیزە سەرەکانەوە، دوو سێ تۆپەڵە پەڕۆی ڕەش بە یەکدا دەهاتن: پچ... شچش... چپ.. بە پەلە هەستا. هەردوو دەستی خستنە پشتەوە و کەمێ خۆی بە پێشدا شکاندەوە. تەماشای لای شانی چەپی خۆی کرد. سەری هەڵبڕی و لە سەرەکانی دەوری خۆی ڕوانی: بزەیان دەکرد. لێوی خۆیان دەلستەوە و تەماشای یەکتریان دەکرد. یەکێ لە سەرەکان کە ڕیشی، لای چەنەگەوە پاک سپیی بوو، لەگەڵ بزەکەیدا ناو دەمی

دەرکەوت: دوو سێ ددانی پێشەوەی کەوتبوون و ئەوانەی کە مابوونەوە، قاوەییەکی تۆخ و ژەنگاوی بوون و سنووری نێوان ددانەکانی و پووکی، بە چینێکی وەک هەویر درزبڕ ببوو. سەرەکە دەنگی لێوە هات: ئممم... ئیییی... ئووو...

تەماشایەکی بەردەمی خۆی کرد. کراسێکی هاودامانی ڕەشی لە بەر بوو. هیچ شتێکی لە بیر نەبوو. تەنانەت ناوی خۆشی نەدەزانی. دەتگوت هەروا بە گەورەیی، ئێستا لە دایک بووە و هێشتا فێری قسان نەبووە. جگە لەوەی کە لەوانەی دەوروبەری حاڵی نەدەبوو، دەنگیشیان لە گوێیدا، لە بنی بیرەوە دەهات. نە دەیزانی خۆی کێیە، نە دەیزانی ئەوانەی دەوروبەری کێن یا چین. کۆمەڵە پەڕۆ ڕەشەکان بردیانە لای خۆیان: شش.. چچ... مااا... ووو

بێ سوود بوو. نە هیچ تێدەگەیی نە هێچی دەگوت. هەر وا لە بۆشایی دەڕوانی و هەردوو دەستی لە پشتەوە تێکپەڕاندبوون. کۆمەڵە پەڕۆ ڕەشەکان هیچیان لێ هەڵنەکڕاند. دوای تاوێ، لەگەڵ هاواری سەرە پیرەکەدا، لە ژوورەکە دەرکەوتن. لەو ساتەوە کە بە بێهۆشی بردبوویانە ئەو گوندە و لەو ماڵەیان دانابوو، ئیدی ئەو ماڵە ببوە مەکۆی پیاوان. دوو دەهاتن و یەک دەڕۆیی. چی لێ بکەن؟. ئەمە کێیە و لە کوێوە هاتووە؟!. لە ئەنجامدا هەر هێندەیان پێ گرینگ بوو کە کچێک، ڕەنگە لە کوردە خائینەکان بێ، خوا لە ئاسمانەوە بۆی ناردوون. ئەوانیش، شەرع چ دەڵێ وای لێ دەکەن:

- ژنی کافران، بە پێی شەرع، گاینیان حەڵاڵە.

- کوڕە منداڵە... ئەوە کوا بەرگە دەگرێ؟!.

- بەرگە ناگرێ چش!.

- پیاوی چاک بن، خودا هەڵناگرێ. منداڵ و لێقەوماوە. جگە لەوەش، کێ دەڵێ کوردە؟. چی کورد دەگەیەنێتە ئێرە؟!.

یەکێکی باریکەلەی لە چاو ئەوانی ترەوە خاوێن، وای گوت. دوای قسەکەی

ئەو، بوو بە غەڵبەغەڵبێکی بە چپە: بۆ وا دەڵێ؟!. بەزەیی بە دوژمندا دێ؟!. ئەدی بڕیاری حکومەت وا نییە؟. ئەدی ژنیشیان حەلاڵمان نییە؟!
هەموو بە گومانەوە لێی ڕامان. ئەویش ملی مات کرد. پاش چەند چرکەیەکی بێدەنگی، بە دەنگێکی کزۆڵەوە گوتی:
- با پرس بە مەلا بکەین. بزانین کافرە یا کافر نییە.
- پرسی ناوێ. من دەزانم کافرە. ئەنفال بۆ کافر نییە؟. حکومەت سەر و ماڵ و ژنیانی بۆمان حەلاڵ نەکردووە؟. جا هەر لە دایک دەبن، بە حوکمی شەرع و کتێب مارەیان لە ئێمە بڕاوە و بڕاوەتەوە. هەر بێ شەرعییەکیش ئەگەر هەبێ - ئەستەغفیروڵڵا یا ڕەبی - لە ملی حکومەتە. ئەمە، (سەبیە)یە و وەک بیابان و باران هی هەموانە. جا کێ کەیفی لێیە با لێی کەوێ. ئەوەی ئەمانەی گوت، پیاوە پیرەکە بوو. قسەی ئەو، وا دیار بوو، بۆ ئەوانی دی فەتوا بێ. کە ئەو لەو قسانە بووەوە، ئەوانی دی ماوەیەک تەماشای یەکتریان کرد. یەکێکیان کە دیار بوو خۆی بە خاوەنی مافی لێکەوتن دەزانی، بە شەرمەوە گوتی
- من... من لە هەموو کەس ...
پیاوە پیرەکە قسەی پێ بڕی: دەزانم، دەزانم. بڕۆ تۆ سەردەق بشکێنە. بزانە ئەگەر بێبن بوو، خوینیشی حەلاڵتە.
سەردەق شکێن، ئاوڕێکی لای سەبیەکەی دایەوە. لەوێ نەمابوو. ئەمیش کە خۆی بە خاوەنی دەزانی، بە دەنگێکیی نێر و بڵند کەوتە هاوار: کوا؟!... کێ بردی؟!.
هێشتا بە تەواوی لە باسی دیارنەمانی نەببوونەوە، زەلامێکی خودی ئەو ماڵەی کە سەبیەکەی لێ بوو، بە بزەوە لە بەر دەرگاکە دەرکەوت. بێ ئەوەی وەژوور کەوێ، بە دڵی خۆشەوە و بە دەم نەرمە پێکەنینەوە گوتی: گام!... بە ویژدانم سەرمۆر و بێ عەیب بوو... عەیب لەو چاوانەمدا هەبێ، لەودا نەبوو. هەناری سوور بوو و بە گونمدا تەقییەوە. ئەوەی گوت و تەماشای دەستی خۆی کرد و لە سەری ڕۆیی: دەڵەسەگە گازیش دەگرێ.

خاوەن مافەکە خەم دایگرت و سەری مات کرد... ئەوانی دی پاش تاویَ، بە دەم پێکەنینەوە لێک ڕامان. یەکێکیان گوتی: بارەکەڵڵا... یەکێکی تر گوتی: لە گیانت خۆش!. پیرەکە، سەرکەوتووانە پێکەنی.
هێشتا پێکەنینیان نەڕەویبۆوە، سەبیە لە بەر دەرگاکە پەیدا بوو: هەردوو چاوی تا دەکرا کرابوونەوە. هەردوو پێی کە بە خۆڵ و تۆز داپۆشرابوون، بە خوێنێکی گەش ڕێڕیَ ببوون... بە سەرسوڕمانەوە دەیڕوانی... وێنەدەچوو بزانیَ چ باسە.

❊ ❊ ❊

بەینیَ بوو، کچێکی باریکەلەی منداڵکاری ڕەنگ زەرد، کەوتبووە سەر شەقامەکانی بەغدا. هەردوو دەستی لە پشتەوە تێکدەپەڕاند و کەمیَ خۆی بە پێشدا دەچەماندەوە. هەر جارە و شەقامێکی دەگرت: لەمسەرەوە پێدا دەهات تا ئەوسەر. خۆی بە هەموو دوکان و بازاڕێکدا دەکرد. لە هێندیَ دوکان وەدەریان دەنا و لە هێندێکی تر ڕایاندەماڵییە ژووریَ و لە هێندێکی تریش، شتیَ پارە یا خواردنیان دەدایێ و بەڕێیان دەکر. هەرزەکارەکانی بەغدا، ناوی (سەبیە شێت)یان لیَ نابوو. هەر بۆیان ڕێککەوتبا، بانگیان دەکردە لای خۆیان و وشەیەکیان پیَ دەگوت. ئیدی ئەویش ئەو وشەیەی دەگوت و دەگوتەوە. هەتا وشەیەکی تریَ پیَ نەگوترابا، دەسبەرداری ئەوەیان نەدەبوو. بۆ ئەوەی وشەیەکیش بخەنە سەر زاری، دەبوو بۆ ساتێکی کەمیش بیَ، سەرنجی بۆ لای خۆیان ڕاکێشن دەنا وەرینەدەگرت. ماوەیەک بوو، چەند چوختیەکی لیَ پەیدا ببوون و وشەی بڤەیان فێر دەکرد. ڕۆژیَ دەیگوت: «بترەیس»، ڕۆژێکی تر دەیگوت: «مەرتلکرد» و ڕۆژێکی تر دەیگوت: «خومەینی».
بەیانیانیەکی زوو بە یەکیَ لە شەقامەکاندا بە پەلە دەڕۆیشت و هاواری دەکرد: «بترەیس». زۆری نەبرد، هەموو سەروگوێیان شکاند و وشەکەیان لە بیر بردەوە. ئیدی لە بری گوتنی وشە، بە سەروگوێی خوێناوییەوە، ڕایدەکرد و دەیباڕاند.

سەبیە، ئەوەی لێ دەرچێ کە هێندێ جار دەیانبردە دەوروبەری گەڕەکە هەژارەکانی قەراغ شار و ماوەی یەک حەفتە یا دە ڕۆژان لە کەلاوە و چۆڵاییدا دەیانبەستەوە و بزریان دەکرد، ببوە بەشێکی دانەبڕاو لە شەقامە جەنجاڵەکانی بەغدا. هەمیشە هەردوو دەستی لە پشتەوە تێکدەپەڕاند و بە پەلە دەڕۆیی و ئەو وشە یا ڕستە کورتانەی دووبارە دەکردنەوە کە دەخرانە سەر زاری.

پاش ماوەیەک سەبیە، ڕستەی مەیلەو درێژی دەگوت. جاری وا هەبوو، ڕستەی سێ و چوار وشەییشی دەگوت. لەوەش دەرچووبوو بە زەحمەت وەریبگرێ. ئەگەر قۆشمەکان زوو فریای کەوتبان، لە ماوەی پێنج دەقیقەدا، قسەیان پێ دەگۆڕی. زۆربەی زۆری ئەو وشە و ڕستانەی فێریان دەبوو، جنسی و باسی ناولنگی خۆی و خەڵک بوون. گەلێ جاریش ڕستەی سیاسییان فێر دەکرد.

کەس نەیزانی ئەو بەیانییە، کێ ئەو قسانەی دەخستە سەر زاری. وەک پیشەی خۆی، بە پەلە لەم دوکانەوە دەردەچوو و خۆی دەکرد بەو دوکانەدا. جاروبار، هەرزەکارێک یا تەنانەت پیاوی بە تەمەنیش، دەستیان بە ناولنگیدا دەکرد. ئەویش بێ ئەوەی خۆی بە خاونی ناولنگی خۆی بکا، بێ باکانە دەڕۆیی و هاواری دەکرد: «کچی یەئجووجم».

بە شەقامەکەدا، لە ئوتێلی (وەفد)ەوە، بەرەو لای (برایەتیی)، بە پەلە دەڕۆیی و ئەوەی دەگوت. هەمووی دە خولەکی نەبرد، لە (برایەتیی)یەوە، بەرەو لای ئوتێلەکە گەڕایەوە و هاواری دەکرد: «کچی مەئجووجم». دیسان، بەرەو هەمان جێی پێشوو دەڕۆیی و دەیگوت: «خوشکی یەئجورجم». ئەوجا بەرەودوا بۆوە و هاواری دەکرد: «خوشکی مەئجووجم».

دیار بوو دوو چاودێر بوون. یەکێکیان لەمسەری شەقامەکە، لە بەردەم ئوتێلی (وەفد) وێستابوو، ئەوی تریان لەوسەرەوە، لای (برایەتیی)\ بوو. ئەویان شتێکی فێر دەکرد، ئەمیان پێی دەگۆڕی.

ڕۆژی دوایی، دوای ئەوەی سەبیە لە جامخانەیەکەوە دیمەنی دوو پیاوی بەدفەسالّی لە سەر شاشەی ڕەنگاوڕەنگی تەلەڤزیۆنەکە دی، کە دەمیان نابووە ناو دەمی یەک و هێندێکیش لە سەرەدا، بۆ دەممژین وێستابوون، شێوە و سیما و ڕەفتاری گۆڕان. دەتگوت هەموو شتێکی بیر کەوتۆتەوە:
لە ناو کەللـەسەریدا، دەنگی شۆڤلّ دەهات و بە سەر هاوار و زریکەی ژن و منداڵدا زاڵ دەبوو. دەسرێژ دەکران... جنێو دەدرا و قاقای پێکەنینی پیاو دەهات. لە بن پێیدا، هەستی بە نەرمیی و گەرمیی جەستە و تەڕیی خوێن دەکرد. پەلی براکۆرپەکەی گرت و بە سەر تەرمەکاندا پەلەکێشی کرد. نە خۆی دەگریا نە براکەی. ترس، لە سنوری ترس دەرچوبوو. خۆی لە تیشکی گلۆپەکان دزییەوە و بە زگەخشکێ، بە سەر تەرمە ڕووتەکاندا دزەی کرد. پێش بانگی موحەممەد و چاوهەڵێنانی خۆری خودا، لە سنووری چاڵەکە دەرچوو و برا کۆرپەکەی بە کۆڵدادا و کەوتە ڕاکردن... هەر ڕایدەکرد... هەر ڕایدەکرد... لە گوندێک گیرسایەوە. لەوێ چی پێ نەکرا؟. پیاوانی گوندەکە، بە هەرزەکار و پیرەوە، بە نۆرە لێی دەکەوتن و ئازاریان بە ڕوحی دەگەیاند.
بە دەم گریانەوە، کەوتە سەر شەقامەکان: دەستێکی لە باریکایی پشتی نابوو و کۆڵە نادیارەکەی پێ گرتبوو، دەستەکەی تری ڕادەوەشاند و هەڵدەبەزایەوە و بە تووڕەییەوە دەیقیژاند: «کچیانم، خوشکیانم... ژنیانم دایکیانم... « بێ ئەوەی لاداتە هیچ دوکانێک یا پشوو بە خۆی بدا، لە نێوان ئوتێلی (وەفد) و (برایەتی)دا، دەهات و دەچوو و ئەوەی دەگوت و دەگوتەوە...
خەڵکی بەغدا دەیانگوت: «سەبیە شێت، شێت بووە!». دەیانگوت: «دوێنێ ناوی جنۆکانی دەگوت، بەڵام ئەمڕۆ شەکلی کردووە و شتی نوێ وەرناگرێ». دەیانگوت: «سێ مەوج بوو و خودا دووی لێ سەندنەوە».

دەیانگوت: «تازە سەبیە شێت هۆشی وەبەردا هاتۆتەوە... ئەمڕۆ سبەی دەکوژرێ». دەیانگوت و...

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، سەبیە شێت لەو پەنادیوارە لاچەپەی لای ئوتێلی «وەفد» کەوتبوو کە دەیڕوانییە (برایەتیی) و بە خەتێکی ڕەش و گەورە، ساڵەهای ساڵ بوو لە قەدی نووسرابوو: «خەرمیز» و کەس نەیدەکوژاندەوە. خوێنێکی گەش، کە بە ئاوی هەناری سوور دەچوو، لە سەریەوە، لە سینگیەوە، لە زگیەوە، لە ڕانیەوە، لە پووزیەوە و لە پاژنەی پێەوە دەڕۆیشت و لە خوار «خەرمیز»ە ڕەشەکەوە، تێکەڵاوی میزی تەڕ و وشکەوەبووی چەندین ساڵی بن دیوارەکە دەبوو.

# باوكم دزرا

نیگاری ژنێکی چاو مات و لەش تورت، کە بە توولێکی تەنکی پەمەیی خۆی پێچابۆوە و گۆی مەمکی چەپی بە ئاستەم وەک لە ناو تەمداپێ دیاربوو، بە دیواری لای مەتبەخەکەوە هەڵواسرابوو. ئەو قوژبنەی کە کرابوو بە مەتبەخ بە دیوی ناوەوەی میحراب دەچوو. تەباخێکی دوو چاوە و یاخچاڵێکی تێدا بوون و هێندێ قاپوقاچاخ لە سەر ڕەفتێکی پلاستیک ، لە سەرلاّ و بە لای یەکەوە دانرابوون.

نەخشەیەکی کوردستان و ئالایەک و وێنەیەکی بە بزەی ستالینیش بە دیوارەکەی ئەمبەرەوە هەڵواسرابوون. لێواری پەنجەرەکەش پەیکەری سەرە لینینێکی ڕەش و چەنەگە دەرپەڕیوی هێندەی هێلکەیەکی لێ دانرابوو.

لە خوار نەخشە و ئالاکە بە خەتی (نوسخ) ناوی خودا و پێغەمبەر و عەلی، لە سەر پەڕۆیەکی قەرسیلیی نووسرابوون.

ژوورەکە، بە نقەنق جێی ئەو شتانەی تێدا دەبوو کە تێیدا بوون. قەنەفەیەکی دوو نەفەری سەوز کە بنەکەی تەختی نووستن بوو بەرانبەر

ژنە ڕووتەکە و لە خوار نەخشە و ئاڵاکە جێی بۆ کرابۆوە. مێزێکی گچکەشی لەبەر دەم بوو کە دوو کوپی چای پڕ لە قونکە جگەرەی لە سەر بوون و هێندێ گۆڤار و ڕۆژنامەش بە لای کوپەکانەوە بە بێ مباڵاتی کەوتبوون.

ڕەزا، قرتەی لە دەرگاکە هەستان و کردیەوە. بە سەر ئەو قاقەز و ڕۆژنامانەدا بازی دا کە بەرید لە کونی دەرگەوە ئاودیویان کردبوون. پێڵاوەکانی داکەندن و بە لای جزمە فیچاوەکانیەوە دانان و چووە حەمامەکەوە. شێرەی بەلووعەکەی بادا و دەتگوت دەرگای کارگە کرایەوە، هەموو ژوورەکە هەژی.

ئەوەی بەرید بۆی هێنابوو، لە سەر مێزەکەی دانان و لە سەر قەنەفەکە پان بووەوە و قاچێکی خستە لای کوپە چایەکان. یەک یەک ڕوانییە قاقەزەکان. لە یەکێکیاندا کرێکاریان دەویست بەلوعە پاک کاتەوە و دەبێ لە سەعات شەشی بەیانییەوە کار بکا تا سێی ئێوارێ. شارەزایی ناوێ بەڵام ڕوخسەتی شوفێری گەرەکە. کەنناسی نەخۆشخانە لە چواری ئێوارەوە تا یەکی شەو... شارەزایی دەوێ.

«قسەی حیز!... جا بۆ چاو بەمانەدا بگێڕم؟!. لە دوو کار بەولاوە چی بکەم؟!. بەڵام ئەگەر کارێک لە پێنجی بەیانییەوە تا حەوت هەبێ زۆر باشە. دوو سەعات کار مەسرەفی خواردنەکەمە». چاوی بە شتێ کەوت: پێویستمان بە (ژن/پیاو)ێکی ڕووخۆش و ئارام هەیە دڵی جۆنیمان بۆ خۆش بکا لە پێنجی بەیانی هەموو ڕۆژێکی حەفتەوە تا شەش و نیو. جۆنی، ئەگەرچی گەماڵێکی ڕەش و زلە بەڵام لەگەڵ خەڵکی قسەخۆشدا میهرەبانە.

«ها؟!... کورە دە لای بە!. ئەوجا نۆرەی سەگەوانییە بیکەم!. بەڵام بۆ نەیکەم؟!. لە کارەکەی حەمە چاکتر نییە؟!. من پارەم پێویستە و لە بەر خاتری بابم هەرچی بکرێ دەیکەم». چاوی بڕییە ژنە نیوەڕووتەکەی بەرانبەری. وردە وردە سەری قورس بوو و پێڵوکانی لێک نیشتن:

«قەڵەنگێکی بە دەستەوە بوو و ڕانەمەڕێکی ڕادەدا. ڕانەمەڕ، نە سەری

هەبوو نە بن... جمەی دەهات. لە مێرگێکی بەرەڵا کردن و لە سەر تاشە بەردێکی ڕەش دانیشت. لە پڕ مەڕەکان، یەک یەک ڕوویان بەلایدا وەرچەرخاند و بەرەو لای هاتن. چاویان زیت بوو، ددانیان لێ گڕ دەکردەوە و لیکاویان بە لالغاوەدا دەهاتە خوارێ. مەڕ بوون بە گورگ و سەگ و بۆی هاتن. بە قەڵەنگەوە، شەلم، کوێرم تێیان کەوت. دەرەقەتی سەگەلەکە نەدەهات. هەموو شالاویان بۆ دەهێنا و پێی دەوەڕین و دەیانمڕاندەوە... هاواری لێ هەستا... ڕاچەنی».

شایەدیمانێکی هێنا، سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و بە پەلە بۆی دەرچوو.

* * *

«دەوری دوو سەعات سەگەوانی، حەوت سەعات ئاودەست پاککردنەوە و دەسشۆر سڕین، ئەمە نۆ. هەشت سەعاتیش... ئاخ! وەرە پاکیان کەرەوە کەچی بە چاوی سووک سەیرت کەن!... دەی! ئەمە چەند؟!. ئەمە حەڤدە سەعات. وەڵڵاهی کەمە!».

- وەرە ڕەزا!،

- بەڵێ خانم!.

- ها ئەوە پەتەکەیەتی، بیبەرە دەرێ. ئەورۆ چارەکی زووتر بیهێنەوە و قاوەیەکم لەگەڵدا بخۆوە. کیسەت لە بیر نەچێ.

ڕەزا، جۆنی ڕست کرد و پێنج کیسە نایلۆنی لە ناو یەکی خستنە بەرکی و چووە دەرێ. جۆنی، بە هەرچییەکدا دەگەیشت، دار بوایە، دارتەل بوایە، قوڕنەی دیوار بوایە، پێیدا دەمیزی و ئەمیش بە دیاریەوە ڕادەوەستا.

- دە برۆ جۆنی حیزا!.

- مڕ ڕڕڕ ...!

- دە برۆ جۆنۆ مەرد!

- مڕڕ... ڕڕڕ... حەپ حەۆ!

- تڕحێو!.

جۆنی کەڵبەی لێ دەرهێنان و بە هەڕەشەوە لێی مڕاندەوە.

- کەمۆن جۆنی!
بەو ڕستە ئەوروپاییە، جۆنی هێور بووەوە.
- هەڵاو جۆنی!
نەخێر، جۆنی ڕەشی قەترانی کەوتە کلکەلەقێ و نووزەنووز.
«ئێ ئێ... جۆنیش لە کوردی بێزارە و پێی قەڵس دەبێ. داروین ڕەگەزی من و ئەم سەگە پێکەوە گرێ دەدا. نا بەخوا ڕەگەزم ناچێتەوە سەر هی خاوەنیشی...»
ڕەزا، دەستی بە یەکێ لە کیسەکاندا کرد و پیساییەکەی (جۆنی)ی لە سەر قەراغی شۆستەکە هەڵگرت و کردیە کیسەکەی ترەوە.
ژنێکی قەیرە، پەلی کیژۆڵەیەکی جوانکیلەی گرتبوو و بەرەو ڕووی ڕەزا و جۆنی دەهاتن. منداڵەکە، ویستی بەرەو لای جۆنی بێ، خۆی لە دەستی دایکی ڕاپسکاند و گوتی: «بەڵێنت دەدەمێ سەیری سەگەکە دەکەم نەک ئەو دەرەکییە سەر ڕەشە!»
سەیری سەعاتەکەی کرد. کاتی گەڕانەوەی هاتبوو. بەرەو ماڵی جۆنی و پیرەژن گەڕایەوە بێ ئەوەی بزەیەک بۆ ئەو منداڵە جوانکیلەیە بکا کە قەت تەماشای نەکرد.

*** 

بە بێتاقەتی، بە پلیکانەکاندا هەڵگەڕا. سێ نهۆمی بڕی و بە لای دەستەڕاستدا و چووە بەردەم ژووری ژمارە (١٣). بە نووکی پەنجەی لە دەرگەی دا و بەژوور کەوت. قەرەوێڵەکەی بابی بەتاڵ بوو و تازە بالیف و چەرچەفی گۆڕدرابوون. هاتە دەرێ و هەر لە بەر دەرگە، لووتی بە لووتی ئەو سستەرەدا تەقی کە هەموو جارێ، بە بێ پێچوپەنا، حاڵ و وەزعی بابی پێ دەگوت و وردە وردە لەگەڵ مردنی باوکیدا ڕایدەهێنا:
«شیرپەنجەی لە جەرگدایە. دوو حەوتوو.. بیست ڕۆژی دی ناژێ».
«بابت دەمرێ... ناژێ... کوشندەیە... دەمرێ...»
- کوا باوکم؟!.
دەستی خستە سەر شانی ڕەزا و لە دەرگەکەی دوور خستەوە:

- بەداخەوە. بابت مرد. دەبێ قایم و خۆڕاگر بیت.
ڕەزا گێژ بوو. بەر چاوی تاریک بوو و لە جێی خۆی ڕۆنیشت.
- وەرە ژوورەکەی ئێمە دانیشە.
ڕەزا جگەرەیەکی پێ کرد.
- ببوورە لێرە جگەرە ناکێشرێ.
- ببوورە بیرم نەبوو. کوا تەرمەکەی؟. ها؟. بابم کەی مرد؟!.
- وا لە ژێرزەمینی ژمارە (٢٠)ە. دوانزە و چل و پێنج دەقیقە مرد. وا لە یاخچاڵدایە. مردنێکی هێمن و بێ ئازاری کرد. مۆرفین ڕێی ئازاری لێ گرت.

* * *

«براکەم! ئەوەی دەیدەیە تابووت کەسوکارت لە نەبوونی دەرباز دەکا. هەرچیت هەیە یەک تابووتی پێ نایا. لە گۆڕستانی کوردەکان بینێژە و زوو زوو بچۆرە سەر گۆڕی و ...»
«چەپکە گوڵێکی لە سەر دانێ و...»
«لێرە بینێژە و پەنا بەخوا. گریمان تابووتیش پەیدا بوو. ئەدی پارەی فڕۆکە و پیتاقەی چوون و هاتنەوەی خۆت؟!. نا برا!. لێرە دەینێژین».
ئەمانە هەر قسان بوون. ڕەزا بڕیاری خۆی دابوو!.
مارسدیسە کۆنە خەنەییەکە، لە پێچەکان ڕەت بوو و گەیشتە خوارێ. هەردوو دیوی جادەکە دار و شینایی بوون و پڕ بوون لە سەیرانکەران. ژن و پیاو و منداڵ، خۆیان ڕووت کردبۆوە و خۆیان دابووە بەر تیشکی هەتاو. ئەو دەشتە شینە، بە لەشی سپی و پەمەیی و هێندێ جار بە بۆر و ڕەش بەڵەک ببوو. لەولاترەوە، دەریا بە ئارامی شەپۆلی دەدا. ڕەزا، دەستی لە فەرمان هەڵنەدەگرت: «وەرە نرخی یەک تابووت پارەی شانزە ئۆتۆمبیلی وا بێ!. ئاخر ئەمە کەی ڕەوایە؟!. وا باشترە. چاکم کرد. ئەوەی دەمدا بە تابووت و پلیتی فڕۆکە، دەیدەم بە دایکم و خوشک و براکانم. لە جۆنی و قۆڵگە لنگ بۆگەنیش دەرباز بووم. چی دی ئاودەست و دەسشۆری مەیخانان پاک ناکەمەوە. دەسا خوای

دەکرد لەوێ هەڵمدەواسن. تەرمی باوکمە و دەیبەمەوە. حەی!. ئای بابە گیان!. لە سەرەمەرگتدا لە دیارت نەبووم و ئێستاش ناکرێ لای خۆمەوەت دانێم...»

ڕێیەکە، کەمێ سەرەوژوور بوو و ئۆتۆمبیلەکە قورس دەڕۆیی. تاکوتەرای بولگاری کە خەریکی کێڵگە و ئاژەڵ و کاری خۆیان بوون، بە جۆرە سەرسامییەکەوە سەیری ئۆتۆمبیلەکەیان دەکرد: مارسیدسێکی خەنەیی کۆن، تەلەڤزیۆنێک لە سەر چەنچەکەی قایم کرابوو. بولگاریا و دیمەنی وا!. سۆفیا (٣٠کم)... سۆفیا (٢٠کم)... سۆفیا (١٠کم)... سۆفیا.

* * *

لە قاوەخانەیەکی فێنک و خۆشدا، قاوەیەکی بەشیری خواردەوە و جگەرەیەکی بەلەزەتی بە سەردا کێشا. «بگەیشتمایە وڵات... سەرم بە سینگی دایکمەوە بنابا ئیدی دەحەسامەوە. چم هەیە، دەیدەم بە چێشتخانەیەک و لەگەڵ براکانمدا بەڕێوەی دەبەین...»

جگەرەیەکی تری پێ کرد و بەرەو لای ئۆتۆمبیلەکە ڕۆیی. کارتۆنی سەر چەنچەکە نەمابوو. دەمی بەش کردەوە!. چاوی بەملا و ئەولادا گێڕا و هیچی نەدی... دەستی کرد بە گریان و بە ڕاکردن ئەو دەورانە گەڕا. خەڵکی بە سەرسامییەوە لێی ڕادەمان. بەرەو ڕووی پۆلیسێکی دار بەدەست چوو:

- کوا باوکم؟!.

- باوکی چی؟!.

- دزییان.

قاقای پۆلیسەکە بەرز بووەوە. هەر بە دەم قاقاوە گوتی: چییە باوکت زێڕ دەڕێ تا بیدزن؟!. بابی تۆیان بۆ چییە؟!.

- ڕەنگە بە تەلەڤزیۆنیان زانیبێ.

- چیی؟!. کابرا شێت بویی؟!. خەڵک چۆن پیاویان لێ دەبێتە تەلڤزیۆن؟!.

- نا نا. لە کارتۆنێکی تەلەڤزیۆندا بوو... مردبوو... تەرمەکەیم لە ناو

کارتۆنێکدا دانابوو... دزیویانه... به تەلڤزیۆنی (٢٨) گرێیان زانیوه.

*** 

ڕەزا، تا شل و شەکەت بوو گەڕا. کوچه و کۆلانی سۆفیا نەما سەری پێدا نەکا. نه شوێنەواری بابی هەبوو نه هی کارتۆنەکه. له ناو مارسیدسه بۆر لێی دانیشت و به دەم جگەره کێشانەوه، شریتێکی خسته سەر تەسجیلەکەی. عەلی مەردا فووی پێدا کرد:

خۆم و عودەکەم شەو هەتا بەیان...

لەگەڵ پۆلیسێک و یەک دوو هەرزەکاری دەسبەتاڵدا تاوێکی دی گەڕان. له گەڕەکێکی پۆخڵدا، ده دوازده کەسیان دی له شتێ گرد ببوونەوه. خورپه به دڵی ڕەزادا هات. به پەله دڕی پێ دان و گەیشته دیار بەرمیلێکی زڕوزبڵ. خۆی بوو... باوکی به خۆی و کفنەکەیەوه، له ناو بەرمیله زبڵێکدا گرمۆڵه ببوو: ئای باوه!. ـ ئەمجارەیان بیخەره ناو موقەبای پسکیتەوه. پۆلیسەکه ئەوەی گوت و لێیدا ڕۆیی. پاشان به دەم ڕێوه، ئاوڕێکی دایەوه و به قاقای پێکەنینەوه گوتی: نا، نا... نەکەی!. دەنا به پسکیتی دەزانن و دەیخۆن. بیخەره موقەبای بزمارەوه.

ڕەزا، بابی له ئامێز گرت و بۆنساردییەکی سووک خۆی به کەپوویدا کرد. به یارمەتی هێندێ لەو هەرزەکارانەی دەورووبەری، تەرمەکەی خسته سەر کوشنی دواوەی ئۆتۆمبیلەکەی.

ـ لەوێی دامەنێ نەبادا داوای پەساپۆرت و پێناسەی لێ بکەن.

ـ له سەر چەنچەکه، له سەر کورسییەکی شەتەک ده و بازۆ.

ـ بیبەره لای قەسابێک و ...

ـ بۆ له سنوقەکەی دانانێی؟!. بیخەره جانتایەکەوه و لەوێی دانێ.

ڕەزای نەژنەو، هەر به گوێی خۆی کرد. تەرمەکەی له سەر کوشنەکه شەتەک دا و وەڕێ کەوت.

«ـ ئای باوه گیان!. ئێستا بۆ خۆت چۆلەکەیەکی باڵسووکی بەهەشتیت و لەم چڵەدارەوه بۆ ئەو چڵەدار دەفرێیت!. بەو خودایه لەوێش منداڵه تورکێکت لێ پەیدا دەبێ و فاقێکی زیتکه بۆرت بۆ دادەنێ و تەق

دەتگرێ!. تۆ بڵێی ئەو بەهەشتە پان و بەرینە یەک منداڵە تورکی لێ نەبێ؟!. ئەتاتورک غەزای بە باپیرم کرد و هێندەی غەیرەدین پێ بە کوشت دا تا بەهەشتی لە سەر تاپۆ کرد!. تۆش... تا هۆشت هەبوو بەو غەزایانەوە دەنازیت... ئەوەندەی یۆنانی تۆپاند و هێندە و هێندەی ئەرمەنی گۆشاوگۆش سەربڕی!!. وەڵڵاهی وە بیللاهی دەڵێم تەسلیمی یۆنانیانت بکەم و بڵێم ئەمە کوڕی ئەو کابرایەیە!. باوە!... ئیستا بەهەشت پڕە لە کورد. لێیدەن لە حەوشی گەورە!. باشە تۆ چت بۆ من بەجێ هێشتووە تا ئەوەندەم ئازار بدەی؟!. ئالای وڵاتەکەم دەشەکێتەوە؟!. میللەتەکەم ژێردەستە نییە؟!. ئێ ئاخر بۆ یەکێکتان نەبوونە ئەتاکورد؟!... بۆ؟!. هەرچیتان کرد بۆ بەهەشتتان کرد و گووتان کردە دنیا. تۆ بڵێی ڕۆژێک منداڵی منیش ئەم قسانەم لەگەڵدا نەکەن و نەڵێن: هەرچتان کرد بۆ کرێکارانی دنیاتان کرد و گووتان کردە کورد؟!. نا... نا. وەڵڵاهی باوکە گیان چۆن لەم دنیای ڕۆشنە چەند جارێ لە ماڵی خۆت وەدەرنرای، لەو بەهەشتەش خوا بیانویەکت بۆ دەدۆزێتەوە و وەدەرت دەنێ!. هیچ نەبێ دەڵێ سێوی حەرامت خواردووە!».

وردە وردە بۆنی مردوو ناو ئۆتۆمبیلەکەی دەتەنی. سۆزی ڕەزا، بوو بە بێزاری و هەڵپەی جودابوونەوە لەو تەرمە: «تۆ باوکم نیت!. تۆ شوێنەواری باوکمی. تۆ تەرمی کابرایەکی کە بە زیندویی باوکم بوو. تۆ تەرمی!. هەرچت کرد بۆ ئەمڕۆت کرد کەچی ئەمەش حاڵتە. تەماشای خۆت کردووە؟!. بۆنی خۆت دەکەی؟!. باوکی ڕەحمەتیت عەقڵی بەوەدا نەشکاوە ئەگەر موسوڵمانێ غەیرەدین ناچاری هەستان بکا لە کاتی تێپەڕبوونی موسوڵماناندا، ڕۆژێ دێ دەڵێ ئەوەی دەیەوێ بە شەرەف بێ دەبێ تورک بێ. تۆش بە ڕێی ئەودا ڕۆیشتی بەڵام شوکر هیچت پێ نەکرا. منیش بە هۆی کاردانەوەی هەڵەی ئێوەوە، ناوی برای دینیم لێ سەندوونەتەوە، بەڵام ناوی برای چینیم پێ داون. زنجیرەیەکی بێ برانەوەی هەڵە. نازانم چ چاکەیەکی تۆم لە سەرە تا بەم دەردە بچم و ئەم بۆنە کەسکوونە هەڵمژم؟!. شەوێکی ساردوسڕ، خۆت خزاندۆتە

ناو پێخەفە شڕەکەی دایکمەوە و بە هەردوکتان منتان بنیات ناوە. کە ژەهری منت لێ بۆتەوە وەک ئێستا مات بویی. تا سمێلیشم لێ ڕوا، هەر نانم بە شەقی مزری تۆوە دەخوارد. ئیدی منەتی چیم بە سەردا دەکەی؟!. ئای کە بابێکی موزیڕ بوویت!. چاک بوویتایە پێم نەدەگوترا پێناسەسز و بێ وڵات. چاک بوویتایە، ئێستا کوێخای ماڵ و وڵاتی خۆم دەبووم و تۆش بە حورمەتەوە دەنێژرایت و بۆگەن نەدەبوویت. ئەو میراتییانەی کە بۆ منت جێ هێشتوون ـ وڵاتێکی وێران و داگیرکراو و دە پانزە خوشک و برای برسی و هێندەی ئەوانیش خوشکەزا و برازای بێ سەرەوبەرە، کە کوردبوونی خۆیان پێ شەرمە. . بەرماڵێکیشت لە پاش جێ ماوە کە جێی ناوچەوانت کون بووە. ئۆف لەم بۆنە!. چاووم دەتۆرزێتەوە!. چت بۆ جێ هێشتم دڵم پێی خۆش بێ؟!. ها؟!. دڵت هەر بەوە خۆش دەکردم کە ئازاین. یەک جار نەبوو بڵێی ژیرین. هەر ئازا و ئازا... وەک شێر و پلنگ کە هەرگیز بە مرۆ نابن. شەرت بێ هەرچی لە کوردەواریدا باو بێ من نەیکەم. من نە برای دینیم هەیە نە برای چینی... وەڵڵاهی نەتگەیەنمە ئەو گۆڕستانەی کە باوکتی لێ نێژراوە... خۆ بۆنت کوشتمی...»

ئۆتۆمبیلەکەی خاو کردەوە و بە دەستەڕاستدا، بەرەو چاڵاییەک لای دا. کەمێ لە جادەکە دوور کەوتەوە و بە دیار کەندێکەوە وێستا. هێندەی بڵێی یەکودوو، چاڵێکی درێژۆکەی هەڵکەند و تەرمەکەی بابی تێدا درێژ کرد و لایەکی کەندەکەی بە سەردا ڕماند:» ئیدی ئەوە دواقۆناغتە و لێی بنوو. ترسی دەڵەک و چەقەڵیشت نەبێ... ناتخۆن... تازە ناخورێی... بۆنیشت کەس گێژ ناکا... بە دوعا باوکە غەریبەکەم...»

بەرەو سۆفیا بای دایەوە و ئاژاوتی...

# خۆڵەمێش

## پێشکەشە بە گیانی (م ک)

«هەوڵی لەناوبردنی مەترسی، هەر لە مار و دووپشک و حەزیا و دوژمنی حیزبییەوە بگرە تا دەگاتە پەرژینکردنی دەوری گۆمێکی قووڵ، خۆی لە خۆیدا، وەک ترسی مردن و لەناوچوون و هەوڵی خۆبواردن لە مەترسی، هەڵپەی مانەوە و بەردەوامبوونی ژیان و ئارەزووی مەحفکردنەوەی ئەو هەڕەشانەیە کە لە ژیان دەکرێن. لابردن یا لاکەوتنی یەک مەترسی لە سەر ژیان، ئاسوودەیی و تەزووی جووتبوونی تێدان... ئەویان بۆ مانەوە و ئەمیان بۆ بەردەوامبوون. دەڵێن ئەوەی هەوڵی لابردنی مەترسی دەدا ئازایە... ئەوەی خۆی لێ لادەدا ترسنۆکە. شای ئازایان ئەوەیە لە کاتی هەوڵی لابردنی مەترسیدا بکوژرێ. ئێ خۆ هەردوو کارەکە بۆ یەک مەبەستن... من ترسی مردنم هەیە بۆیە دەمەوێ هیچ هەڕەشەیەک لە سەر ژیانی خۆم نەهێڵم. نامەوێ کەسە نزیکەکانیشم هەڕەشەی مردنیان لێ بکرێ. دەزانم بە هۆی ئەو هەوڵەمەوە دەکوژرێم. ئەمڕۆ دەکوژرێم.

بەردێ لەو عاسمانەوە دێ و بەر کەللـەی سەرم دەکەوێ... گوللـەیەکی شێت و هێڕ و کۆنەپەرست و نەخـوێـندەوار و دز دێ و بـەنـاوی هۆش و ژیریی و پێشکەوتنخوازی و ڕوناکبیری و دەسپاکییەوە نووکی دڵم دەسمێ... ئەمڕۆ پێم لە کەللـەسەرێکی (باج)ی ١٩٦٤ هەڵدەکەوێ و بە هەڵدێرێکی هەزاربەهەزاردا گلۆر دەبمەوە و هەپروون بە هەپروون دەبم ... دەبم بە (باج)ی (١٩٦٤). دەکوژرێم و بە کوشتنم چڵەدارێ دەخرێتە سەر ئاگری شەڕ، داری ژەقنەبووت گوڵ دەکا، ژنێکی دی بێوەژن دەبێ، منداڵێکی دی هەتیو دەکەوێ، خوشکێکی تر براڕۆ دەکا، برایەکی تر پشتی دەشکێ، دۆستێکی تر خەم دەخوا، بەیانێکی تری ئاگرخۆشکردن بڵاو دەکرێتەوە، ئەوەندەی دی کوێرایی بە سەر خۆری ئازادیدا دێ، لە پرسەمدا کێشە دەقەومێ. چما هەر ئەمجارە منداڵ هەتیو کەوتووە؟. بۆ هەر ئەمجارە ژن بێوەژن بووە؟. بۆ ئەوە یەکەم بەیانی شەڕ دەبێ؟. نا... ئەم چەرخ و دۆڵابە دەسووڕێ... تا ئەملا هەبێ دەبێ ئەولا دەبێ و تـا ئـەولا هەبێ دەبێ ئەملاش هەر هەبێ... تا ئەم نەفەوتێ ئەو نافەوتێ و تا ئەو نەفەوتێ ئەمیش نافەوتێ. کە بە گوللـە سەد لەو دەکوژی، بە شەق و برسیکردن دووسەدی بۆ زیاد دەکەی. ئەوانیش کە بە گوللـە سەدلەم دەکوژن بە شەق و تۆقانـدن دووسـەدی بـۆ زیـاد دەکـەن. ئـەمانە، ئـەگـەرچـی هەڕەشەن لە سەر بوونی یەک، تەواوکەر و هۆی مانەوەی یەکتریشن. بەرداشە و دەگەڕێ. بۆ ئەوەی نەهاڕدرێم بوومە بەشێکی بەرداشەکە و تا ئێستا دەمهاڕی... کەچی ئەمڕۆ بەخۆم دەهاڕدرێم. بەردە و بەرد دەهاڕێ. دوو مارن، ئەمانە دوو ئەژدیهان و قەپیان بە کلکی یەکدا کردوە. کلکی یەک دەخۆن و ئەو بازنەیەی کە پێکیان هێناوە تەنگی دەکەنەوە. بازنەکە تەنگ دەبێ، تەنگ دەبێ تا کەڵبەی ئەم لە پشتەملی ئەو قایم دەبێ و کەڵبەی ئەو لە پشتە ملی ئەم دەچەقێ. ئەی کوا کلکی درێژیان؟. نازانم. خەڵک پێیان دەڵێن شەهید!... شەهیدی کوردایەتی!»

وەک پیشەی گەلێ جاری، هەردوو دەستی لە پشتەوە تێکپەڕاندبوون. سەری بڵند ڕاگرتبوو و سینگی دەرپەڕاندبوو. بە بەر سێبەرەکەدا دەهات و دەچوو. من دەڵێم سەد جار هات و چوو تۆ بڵێ هەزار جار. جاروبارێ، بە توورەیی تفێکی ڕۆ دەکرد، جاروبارێکیش بزەی دەکرد وخێرا خێرا چاوەکانی دەتروکاندن. هێندێ جاریش لە بەر خۆیەوە دەدوا:

ئازایەتیم لەو ساتەوە دەست پێ دەکا کە کۆتایی بە هەوڵی نەهێشتنی مەترسی سەر ژیانم دێنم. دەگەڕێ. بەرداشە و شالاوی خوێن دەیگێڕێ، داری ژەقنەبوتە و بە خوێن چرۆ و گەڵا و گوڵ دەکا. بە ژێردەستی و زەلیلکردنی خەڵک گەشە دەکا. بە خۆرگیران ڕوناک دەبێ. ئەمڕۆ دەکوژرێم. منداڵێ هەتیو دەکەوێ، ژنێ بێوەژن دەبێ... خەمی ژن و منداڵ و خوشکم نییە، خەمم نییە لە بری بەیان چ گەردەلوولێ بۆ خۆشکردنی ئاگر بەرپا دەکەن. خەمم نییە بکوژەکانم چ ئاهەنگێ دەگێڕن. خەمی ئەو کەسەمە کە بە چاوی تەڕەوە سەرچۆپی هەڵپەڕکێی ئاهەنگی کوشتنم دەگرێ. هەڵدەپەڕێ چونکەحیزبەکەی قەڵایەکی قایمی دوژمنەکەی ڕماندووە. ئەشکیش دەوەرێنێ چونکە قەڵایەکی قایمی خۆی ڕووخا. خەمی ئەو کەسەمە کە دوای مایەی خۆی دەکەوێ و وەک هەزاران مایەپووچ سەنگەری تۆڵە دەگرێ... دەکوژرێم. بەردێ لەو عاسمانەوە دێ و بەر کەللەی سەرم دەکەوێ. گوللەیەکی کوێری ژەهراوی کە لە ١٩٦٤ ەوە بۆم لە بۆسەدایە دێت و نووکی دڵم دەسمێ. پێم لە کەللەسەرێکی (باج)ی ١٩٦٤ هەڵدەکەوێ و بە هەزاربەهازارێکدا گلۆر دەبمەوە و ورد و خاش دەبم...»

دوو ڕۆژ بوو کە دەستی لە شەڕ بەردەبوو، خەیاڵی وەک فلیمی بەرەواژ بەرەو دواوەی دەبرد. هەموو زامێکی بەسەر کردنەوە و بە هەموو بزە و خورپە و هیوا و کۆستکەوتنێکی ڕابردووی خۆیدا چووەوە. دوو ڕۆژ بوو کە بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە ریخەڵۆکی هەڵڕژا و بەملا و ئەولای دەستیدا خزا، خۆشییەکی سەیری پێدا دەهات. بە خرووی برینی

خۆشەوەبوو دەچوو. دوو ڕۆژ بوو کە چاوی دەچوونە خەو، دەستێ بەر شانی دەکەوت: «هەستە... هەستە!. خەوتنێ دەخەوی بەخەبەر نایەیتەوە !.» جارێ، باریکەلەیەکی کەڵەگەتی چاوسەوزی بە بزە، بە نەرمی دەستی بە شانیدا دەهێنا و ئەوەی دەگوت و بە کاوەخۆ لێی دوور دەکەوتەوە. دەڕۆیشت و جاروبار ئاوڕێکی لێ دەدایەوە. چی دەویست؟. گەردنئازایی دەویست یا گلەیی هەبوو؟!. نەیدەزانی. چاوی دەچوونەوە خەو. پێڵۆکانی لێ دەبون بە دوو خشت و بۆی هەڵنەدەبڕان. دەستێکی تر شانی دەبزواند. ئەمەیان کوڕێکی لاوی چاو بە دیققەت بوو. بزەی نەدەکرد. چاوی پڕ بوون لە گلەیی. لاونیو بە دیاریەوە دەوێستا و دەیگوت: لە جیهانێکی خۆڵەمێشیدا یەک دەبینین. تێکەڵاوی مشکی و جامانەی ڕزیو دەبیت. هەر کەرتێکت بە کەرتە مەندیلێک و لەتە خەنجەرێکەوە دەلکێ. لە سەر سنوور، لەگەڵ ئالای سەر بارەگاکەتدا، گەردەلوول دەتبات و دەتهێنێ... زۆرت نەماوە بە مراد بگەی.

«ئەم خەونە ئاجرۆباجرانە چین دەیانبینم؟!. دەزانم ئەوەیان کێ بوو. بەڵام ئەمیان لە یەک کاتدا چەند کەسێ بوو: شەوقی، شێرکۆ، حەمە، فەرهاد، بارزان... کێی تریش بوو؟. زۆر کەس بوو. هەموو مردوو و نیوەمردوو و مردووی بەشی زیندووخۆر بوون و هەموو هەر گلەییان هەبوو!. دەکوژرێم. ئەمڕۆ دەکوژرێم. بەردێ لە حەواوە دێ و بەر کەللەی سەرم دەکەوێ. گوللەیەکی بە شیرپەنجە ئاودراو دێ و نووکی دڵم دەسمێ. ئیدی خەونی ناخۆش نابینم. خەونەکانم بۆ زیندووەکان و نیوە زیندووەکان جێ دەهێڵم. ئەدی ئەو هەمو هەرایەی کە ساڵەهای ساڵە لە ناو مۆخەسەرمدا تۆمار دەکرێن چییان لێ دێ؟!. چۆن دەسڕدرێنەوە؟! هیواکانم، تووڕەبوون و هەڵچوون و پێکەنینەکانم، بەڵێن و دۆستایەتی و خورپە و سۆز و ئەوین و هەستی تازە و سەیری باوکایەتیم چییان لێ دێ و چۆن لە ناو دەچن؟!. خۆ شتێ بوونی هەبێ نافەوتێ بەڵکو دەگۆڕێ. ئەم تۆمارکراوانە بە چی دەگۆڕێن و دەبنەوە

به چی؟!. ئاخر دەبنەوە بە چی؟!. دەبێ کەس هەبێ کەڵکیان لێ وەرگرێ؟!. ئەمڕۆ ڕۆمانی ژیانم کۆتایی دێ. تێکەڵاوی مشکی و جامانە و خەنجەر و مەندیل دەبم. ئەمڕۆ نوختە بۆ ڕستەی ژیانم دادەنرێ.»
گەڕایەوە سەردەمێکی ونبوو. منداڵیی بوو یا هەرزەکاریی؟. بەیانییەکی سەرەتای بەهار بوو. عاسمان وەک حاجەتی ماڵەهەژار لێسرابۆوە. زەوی، نمە شەونم داپۆشیبوو. خۆر، بە نازەوە سەری لە کەل دەردەهێنا، گیا و قەرسیلی تەڕ و پاراو قرچەقرچی گەشەکردنیان لێوە دەهات و تێکەڵاوی جریوەی چۆلەکەی هاروهاجی لە ترسی منداڵ زیرەکردوو دەبوو. خۆزگەی دەخواست ئەو خۆرە دوا خۆر بێ کە دەیبینێ. پێی خۆش بوو ئەو هەوا کەمێ سارد و هەست بزوێنە، قەت نە یەک پلە گەرمتر بێ نە ساردتر بێ. بۆنی شەوبۆ تێکەڵاوی بۆنی خاکی تەڕ و بۆنی قەرسیلی لاسکخوراو دەبوو و لە گەڵ هەوای شیداردا خۆی دەکرد بە سییەکانیدا. چ دەبوو ئەوە دوا هەناسەبوایە و تا ئێستا پێی بژیایە و چ هەناسەی تری بە دوودا نەهاتبایە؟. بەیانییەک بوو و جارێکی دی نەهاتەوە. خۆزگەی دەخواست هەموو شتێ وەک کاتژمێری شکاو لە جێی خۆیدا بوەستێ: خۆر یەک بستی دی بەرز نەبێتەوە، شەونم نەبێتەوە هەڵم، باران نەبێ، چۆلەکەکان تا ماون لە ترسی منداڵ فڕکەفڕک بکەن و بجریوێنن، یەک هەناسەی ئەو بەیانییە هەڵمژێ و تا هەتایە پێی بژێ. بەخۆشی، لەوە تێرتر نەبێ، برسیتر نەبێ، سەرماتری نەبێ، گەرماتری نەبێ. دەبێ یونس پێغەمبەر، بەیانییەکی وای لە ورگی نەهەنگدا بۆ ڕەخسا بێ و چەند سەد ساڵ درێژەی بووبێ بۆیە ئەو ماوەیە خۆی گرت.
«دەکوژرێم. ئەو سنوورە دەبڕم کە هەموو زیروحێ لێی تۆقیوە. چۆنە پێش کوژرانم وەسێتی خۆم بنووسم؟!. نا... یەک وشە بنووسم، بە لێکدانەوە و شیکردنەوە، سەد لاق و باسک و باڵی لێ عیجاد دەکرێ و سەد وەسێتم بە دەمەوە دەکرێ. زۆرن ئەوانەی وەستای درۆی دوای مردوون بەڵام ئەوانەی وەسێت بە دەم مردووەوە دەکەن، چەند کەمیش

بن، چەند بچووکیش بن، هەن. نایکەم. وەسێت ناکەم. وەسێتی من بە کەڵکی مردوو دێ. جیهانی مردوو کێشەی تێدا هەشبن کەمن. بەڵام لە جیهانی زیندەوەری ئەم مەڵبەندەدا، دەردەدەروون گەیشتۆتە ناو مۆخی گچکەترین ئێسقان. شێتخانەیەکە و ڕۆڵی ساغی تێدا دەبیندرێ: منداڵەوردکەی ڕدێن سپی و چاویلکە لە چاو و عەسا بەدەست و مێزەرلەسەر، خوێندەواری سەر لە گێزەر دەرنەکردوو، دز و درۆزن و حیزفرسەتی کرێکار، کرێکاری ئاغا و سەرمایەدار، ڕق و قین و ململانێی نێرەکەرانەش، جێیان بە هۆش و سۆز و خۆشەویستی چۆڵ کردووە. جێگۆڕکێ بە هەمووشتێ کراوە... پشتەوقیبلە نوێژ بکە سەد موسوڵمانی هێرت بۆ دەبنە مورید. بەرداشە و دەگەڕێ و دەهاڕێ. ئەمڕۆ منیش دەهاڕدرێم. چەند چرای هیوا لە دڵمدا خامۆش دەبن؟!. هیوای چی! کوا هیوای ژیان لە گۆڕپرستاندا هەیە؟. ئێمە دوای ڕێباز نەکەوتین، دوای دارەمەیت کەوتین و دواقۆناغمان گۆڕستانە. ئەوان دوای درۆ کەوتن و جاشایەتییان حەڵاڵ کرد و بە ئاگر پاراومان دەکەن. چاکترین ڕووداوێ لە دوو کەڵەکێوی ڕوو بدا کە لە شەڕدا شاخیان تێک گیراوە تفەنگی ڕاوچییە کە لێکیان دەکاتەوە. دەنا بە جووتە هەڵدەدێرێن. با هەڵدێرێن !. خەلقەندەی وردی دز و پیاوخۆر و نەخۆش لە سەر ئەم گۆی زەوییە گەورە و گرنگە هەبێ چییە نەبێ چییە؟!. من چی دەگۆڕم و بەرەو کوێ دەیبەم؟. پیاوکوژی لە پەیکەردا، لە تابلۆدا، لە گۆرانی و مۆسیقادا، لە شیعردا، لە چیرۆکدا، لەحیزبایەتی و بە ناوە کوردایەتیدا، لە عیبادەتی خودادا، لە مزگەوت و باڕ و ماڵدا ڕەنگ دەداتەوە و سەدای هەیە. خوێنرشتن بووە بە پیشە و خوێننەڕشتن دەسبەتاڵی و نەدارییە. ئاخر چ دەبێ مرۆ خۆی دادگایی خۆی بکا و خۆی شایەدیی لە سەر خۆی بدا و لە ئەنجامیشدا خۆی سزای خۆی بدا؟. دەبێ کام دەسەڵاتداری ئەم وڵاتە سەد جار خۆی هەڵنەواسێ؟!. ئەوەی لە ماڵی خۆی دانیشتووە و دەترسێ و برسییەتی خۆی هەڵناواسێ، منداڵان خۆیان هەڵناواسن،

پیرەژنە نەخوێندەوارەکان خۆیان هەڵناواسن، کوڕیژگە و کیژۆڵەی هەرزەکار کە بۆ یەک سوێیان دەبێتەوە و ئەترەشیان لە یەکتریش چووە خۆیان هەڵناواسن. سەرجەمی ئەندامانی پێشکەوتووی ئێرە و ئەوێ خۆیان هەڵدەواسن. کادیرەکان بە دەرزەن خۆیان هەڵدەواسن. ئەوەی وەیزانی دەوڵەتی بۆ دادەمەزرێ خۆی هەڵناواسێ. دوو پیاوە هەرە گەورەکان و یەک دوویەکی دەوریان، وا خۆیان هەڵدەواسن: سنگێ بە دیوارێکەوە دادەکوتن کە بستێ لە بالآیان بەرزتر بێ. پەتێکی لووس، ئاوریشم، ناسک - ڕەنگە بۆینباغ یا بابەتە قەیتانێ بێ - بە سنگەکەوەی دەکەن. لە سەرخۆ بە دەوری ملیاندا پێچی پێ دەکەنەوە. بە هەردوو پەنجە کەڵە، فشار دەخەنە سەر هەردوو شادەماری لاملیان کە خۆێن دەگەیەننە سەریان. فشار دەدەن... فشار دەدەن تا تووشی سەرەگێژکە دەبن. ئیدی پەتەکە جێی پەنجەکەڵەیان دەگرێ و فشار دەدا. چۆکیان شل دەبێ و دوای تۆزێ، زمانیان مۆر هەڵدەگەڕێ و بستێ شۆڕ دەبێتەوە و لە درۆ دەکەوێ. بەرداشیش لە گەڕ دەکەوێ و لافاوی خوێن دەنیشێتەوە و ماڵی دزراو بەسەر دەکرێتەوە.
پەلەپیتکەی تفەنگەکانیان، نووکی قەڵەمیان، خانووبەرەیان، ئۆتۆمبیلەکانیان، ژمارەی شەریکی نوێنیان، ئاودیوکردنیان، ملیۆنە دۆلارەکانیان، شیعریان، ڕۆژنامەیان... هەموو شایەدییان لێ دەدەن و پەنجە بۆ چاویان دەبەن. ئەندازیاری پاکەتفرۆش، مامۆستای سەرتاش، فەرمانبەری بۆیاغچی و هێندێ لە ژنە بێ نان و نەوا ناچارەکان کە لە بەر سێبەریاندا لەشی خۆیان دەفرۆشن شایەدن. هێندێ مەلا و شێخیش خۆیان هەڵدەواسن. هێندێ لە کەسوکاری شەهیدانیش خۆیان هەڵدەواسن. من بارەگای سەر بە ئالآم هەبوو و دامخست. بۆ داینەخەم، ها؟! کۆمەڵێ بوین سەرجەمی میللەتەکەی خۆمان خۆش دەویست بەلآم تا ڕقدان بگرێ ڕقمان لە تاکەتاکەی میللەتەکەمان بوو!. ڕقمان لە خۆمان بوو!. جیهانێک، بە لەپیاوەتیخستنی خەڵکەوە پیاوی تێدا ببێ

به پیاو، هەر بۆ داخستن چاکە. ئەستێرەکان بە دەوری خۆر و خۆیاندا دەخولێنەوە و بەردەوامبوون بە بوون دەدەن. ئێمە، ڕقمان بە دەوری خۆمان و تاکەتاکەی میللەتەکەماندا دەخولاندەوە و بەردەوامبوونمان بە عیللەت دەدا. دوانمان نەما ڕق لە ڕقدانی سەر نەکا. سەرجەمی میللەتەکەمان خۆش دەویست و ڕقمان لە تاکەکانی بوو. میللەتەکەمان کیژۆڵەیەکی نازدار بوو و ئێمە شەیدای بووین. نازدار بوو بەڵام چاوی، برۆی، گۆنا و سینگ و مل و گەردەنی، باڵای، پرچی، دەستوپلی، سەرومل... یەکەیەکە ناشرین بوو. ئەی کوێی جوان بوو؟!. ئەمە چییە سەری پێیە و پێی سەرە؟. لە کاتی منداڵیمدا دەمگوت (کەپەک) ە. ئێستا دەڵێم کوردە. نا... نا... کورد نییە. یەکێتییە، پارتییە... چەکداری کوردە. بەرداشە و دەگەڕێ. ئەوەی سەیری ئەمڕۆمان بکا نابێ لە مێژووی ڕەشمان سەرسام بێ. ئەوەی سەیری مێژوومان بکا نابێ لە ڕەفتاری ئێستامان سەرسام بێ. ئەوەی سەیری ئێستامان و مێژوومان بکا ناشێ قوڕ بۆ ـ ڕەنووسمان بپێوێ. مشتێ عەقڵین لە بەردلاندا ڕواوین.

یاخوا حەمە گۆڕت پڕ بێ لەنوور. خۆزگەت دەخواست بۆ ئەوەی مرۆ بتوانێ وەک دەستنوێژ، ڕۆژی چەند جارێکیش دەروون و ویژدانی خۆی بشواتەوە. بەڵام لە بیری خۆت دەبردەوە کە ویژدانیش دەغارێ... وەک پێستە دەغارێ و وەک بنی پێی حوشترەوان قایم دەبێ. گڵاو دەبێ و زێی بادینان و سیروان گڵاوییان دەر ناکا. ئەمڕۆ دواڕۆژمە. خۆزگە بەیانییە نەمرەکە دواڕۆژم دەبوو و بۆم دەبوو بە ورگی نەهەنگ. ئەمڕۆ دەکوژرێم. بەردێ لە حەواوە دێ و بەر کەللەی سەرم دەکەوێ. گوللەیەکی توورەی هێڕی بێ عەقڵ و بێ ویژدان و نەفام و کۆنە پەرست، بە ناوی هێمنی و ژیری و عەقڵ و ویژدان و فام و پێشکەوتنخوازییەوە دێ و نووکی دڵم دەسمێ. پێم لە کەللەسەری... « کسپەیەک لە سەری هەستا. بیرکردنەوەی بچڕا. جەستەی، بە سەر یەکدا

هەرەسی هێنا. دەستە تێکپەڕاوەکانی لێک ترازان. کەوتە جیهانێکەوە، لە هەموو لاوە خۆڵەمێش دەباری. هەور خۆڵەمێش بوو، زەوی خۆڵەمێش بوو، تەم خۆڵەمێش بوو، باران خۆڵەمێش بوو. بایەکی سارد هەڵی کرد و گەردەلوولی خۆڵەمێش بەرپا بوو. گەردەلوول، لوولی دا. خۆڵەمێشی ڕچیو نەبێ شتێ نەبوو دەستی پێوە بگرێ. گەردەلوول بردی... شاخی بڕی، دۆڵی بڕی، تەختاییەکانی گەرمیانی بڕی. گەردەلوولی خۆڵەمێش بردی و بردی تا گەیاندییە زنجیرە شاخەکانی حەمرین. جەستە سارد و سڕەکەی کێشا بە تاشەبەردەکاندا: چ جادویەک بە چاوترووکانێک گەیانتییە حەمرین؟. خۆ جارێ حەمرینتان ڕزگار نەکردووە!. چاو داخە و بیکەرەوە، دەگەیتە جێ مرادی خۆت. دەی کوێت دەوێ شەڕی تێدا دامەزرێنی؟. خانەقی؟! کەرکووک؟! دوز؟! پردێ؟!. کەس وەکی تۆ بە مراد نەگەیشتووە. دەی کوێت دەوێ؟! بارەگایەک ئاڵای وڵاتەکەتی لە سەر بشەکێتەوە یا پەتێکی قەنارەی سەوز یا زەرد؟!. چت دەوێ؟!. تۆش وەک ئەو لەتە خەنجەرە و ئەو مشکی وجامانە تێکئاڵاوانە، وەک ئەو مەندیلە سپییە لێرە دەبیتە یادگار و مێژوو دەتجوێ و دەتجوێتەوە. چت دەوێ؟. تەنها بیری لێ بکەیتەوە دێتە دی. چت دەوێ؟.

لە جیهانە خۆڵەمێشییەکەوە بیری بەرەو خێزانەکەی فڕی. بە چاوی خۆی دیتی: کۆمەڵە خەڵکێک، مشتێ لە میللەتەکەی، نموونەی سەرلەبەری میللەتەکەی بە هەموو سۆز و ڕق و دووبەرکی و خوێن بە فیڕۆدان لە یەک ماڵدا کۆببوونەوە. بزەی غەرەز، هەڵقرچان لە ناخەوە؛ تاڵاوی خەم؛ شیرینی هەواڵ؛ گەشبووەنەوە و گوژاندنەوە، تاریکستان و خۆرهەڵات لە یەک ماڵدا، لە یەک ژووردا و بگرە لە یەک سیمادا دەبیندران.

هەر باوەڕنەکردنی بەس بوو بۆ ئەوەی بێتەوە ماڵە باوانی خۆڵەمێشیی. ئای هەش بباریێ!. چما نازانن کەللە سەری (باج) لە تاشە بەردزۆرترە؟!.

لە پەنا بەردێکی حەمرین بوو.

- دەی چت دەوێ؟!.

ـ ماندووم. ماندووی سەفەرێکی دوورم. دەمەوێ خەوێ بخەوم خەوبینینی تێدا نەبێ. نامەوێ کەس، بە تایبەتی لاوە چاو بە دیققەتەکە خەبەرم کاتەوە. دەمەوێ بەڵای مشکی و جامانەکەی شێخەوە بخەوم... بەڵای ئەم خەنجەر ومەندیلەوە دەنووم.

گەڕایەوە سەردەمێکی ونبوو. منداڵیی بوو یا هەرزەکاریی؟. بەیانییەکی سەرەتای بەهار بـــوو. عاسمان وەک حاجەتی ماڵە هەژار لێسرابۆوە. گیا و قەرسیل، نمە شەونم داپۆشیبوون. خۆر، بە نازەوە سەری لە کەل دەردەهێنا، گیا و قەرسیلی تەڕ و پاراو قرچەقرچی گەشەکردنیان لێوە دەهات و تێکەڵاوی جریوەی چۆلەکەی هاروهاجی لە ترسی منداڵ زیرەکردوو دەبو. ئەو هەوا کەمێ سارد و هەست بزوێنە، قەت نە یەک پلە گەرمتر دەبوو نە ساردتر. بۆنی شەوبۆ تێکەڵاوی بۆنی خاکی تەڕ و بۆنی قەرسیلی لاسکخوراو دەبوو و لە گەڵ هەوای شیداردا خۆی دەکرد بە سییەکانیدا. ئەوە دوا هەناسە بوو و لەو ساتە بە دواوە پێی دەژیا و هەناسەی تری بە دوودا نەدەهات. بەیانییەک بوو، وەک کاتژمێری شکاو هەموو شتێکی لە جێی خۆیدا وێستا: خۆر یەک بستی دی بەرز نەبوەوە، شەونم نەبووەوە هەڵم، باران نەبوو، چۆلەکەکان لە ترسی منداڵ فڕکەفڕکیان دەکرد و دەیانجریواند... لە جێیەکی دووری ئەو بەیانییە نەمرەشدا، دوو بەرداش بە سەر یەکدا دەگەڕان... دەگەڕان و دەیانهاڕی...

# نوشته

شڵەژابوو. هەستی دەکرد ترس تۆڕێکە و لە هەموو لاوە دەوری تەنیوە. هەر جێیەکی جەستەی ببوو بە ڕیشۆڵەیەکی ترساوی سەربەخۆ. چاو لە هەڵکۆڵین دەترسا و گوێ لە بڕین و ناوچەوان لە داغمە و نینۆک لە هەڵکەنین و گون لە خەساندن. ئامێرە سێکسییەکەی وەها کرژ ببۆوە و چووبووە ناوەوە، چی دی ئامێری نێرینە نەبوو. خوێنی جەستەی لەشکرێکی تێکشکاو بوو و لە دەست و پێوە بەرەو ناو هەناوی پاشەکشەی دەکرد. چاوی ببوونە دوو چۆلەکەی ترساو و بێ ئۆقرەی دەستی منداڵە هەژار، کە چارەنووسیان بە سەرهەڵکەندن تەواو دەبێ. لە سەعاتێکدا دە جار... سەد جار... هەزار جار گۆڕەکەی دایکی دەهاتەوە بەر چاوی. دەیویست دایکی زندوو ببێتەوە و خۆی بچکۆلە بێتەوە. بچووک و لووس و خز بێتەوە و بچێتەوە ناو هەناوی دایکی. ئەوێی بە لاوە لە هەموو جێیەک سەلامەتتر بوو. حەزی دەکرد سەر بخاتە سەر ڕانی دایکی و ئەویش بە چمکێکی کەواکەی دایپۆشێ; وای داپۆشێ، لە چاوی خۆر و خەڵکی بشارێتەوە. لە جێیەکدا ئۆقرەی نەدەگرت. دەهات

و دەچوو. لەم ژوورەوە دەچووە ئەو ژوورە و لە لای ئەم پەنجەرەیەوە دەچووە لای ئەو پەنجەرە و جاروباریش دزئاسا، بە دەم تەماشاکردنی ئەملاو ئەولاوە خۆی دەگەیاندە دەرگای حەوشەکە و گوێی هەڵدەخست. لە هەموو هاتوچوونێکدا سەیرێکی وێنە هەڵواسراوەکەی دەکرد. بە گومانەوە لێی ڕادەما. وێنەکە، وێنەی پیاوێکی چاکەت سپی بوو; لەگەڵ پێکەنیندا سمێڵی ببوو بە خەتێکی ڕاست و پان، چاوی باریک ببوونەوە و گوڵێکی سووریش بە سەرەوەی وێنەکەوە، بە جامەکەوە چەسپ کرابوو. تەماشای دەکرد و بە پەلە ڕایدەکردە لای پەنجەرەکە و لەوێوە گوێی هەڵدەخست و بۆ دووری دەڕوانی.

عیززەت لاوێکی بیستوچوار ساڵەی تێکسمڕاوی بەخۆ بوو. بە پچڕ پچڕ ڕابردووی بیر دەهاتەوە. بانگیان دەکرد: هاوڕێ عیززەت کەریم فەیسەڵ. ئاوها ناویان دەخوێندەوە و خەڵاتیان دەکرد و دەستیان دەگوشی و دەستیان بە شانیدا دەدا. بیری دەکردەوە: «ڕابردوو هەمیشە مێژووە. ڕووداوەکانی ڕابردوو بەشێکن لە مێژوو، کەچی وا لە من زندوو دەبنەوە. ئەوەی دوێنێ ڕووی دەدا گەڕاوەتەوە سەرم. ڕووداوەکانی دوێنێ پێم پێدەکەنن. لستەی ناوەکان بە دەم قاقای پێکەنینەوە بە دیوارەکاندا هەڵدەگەڕێن و چوارچێوەیەکی سوور بۆ وێنەکە پێکدەهێنن. چم بە خۆم کرد؟. ئەمڕۆ قەیامەتی دوێنێیە و کاتی زندووبوونەوەی مردووەکانە. دەستم شایەدیم لێ دەدەن، زمانم شایەدیم لێ دەدا، قەڵەم و قاقەز و وایەری تەلەفۆن شایەدیم لێ دەدەن. چ بکەم؟. وێنەکە بگرم و لەتوپەتی بکەم یا لێیگەڕێم؟. ئەم ڕاپەڕینە سەردەگرێ یا تێکدەشکێ؟. قومار لە سەر کامەیان بکەم؟. چەکەکەم هەڵگرم و هێرش بەرمە سەر خەڵکەکە یا هەڵیگرم و بچم بەرگرییان لێ بکەم. بیانکوژم یا لەگەڵیاندا خەڵکی تر بکوژم؟. نێوان سەنگەری خەڵک و سوپا داوە موویەکە. بچمە کامیانەوە؟. لەم دوو ڕێیە نەعلەتییە کامیان هەڵبژێرم؟. چاوەڕوان دەبم تا بزانم تەرازوو بە کام لادا دەشکێتەوە. لەگەڵ سەرکەوتوودا دەبم.

خوداش هەر لەگەڵ سەرکەوتوودایە.
«هاورێ عیززەت کەریم فەیسەڵ» لە ناو کەللـەیدا دەنگی دەدایەوە و زایەڵەی دایکیشی دەنگەکەی دەسڕییەوە: «عیزە حیز ناو ئەو قووندەرانە بەردە... هەرچی خوێڕی ئەم شارە هەیە لە تۆ گرد بوونەتەوە». پێیان گوت: «نابێ جنێوی وا بە ناوەکەی تۆ بدرێ. یا دەبێ ناوی خۆت بگۆڕی یا زمانی دایکت ببڕیت». خێر و بێر و دەسەڵات لە ناوەکەیدا بوو و سۆزیش لە دایکی. کامیانی نەوێ؟. بە یەک حەب زمانی دایکی بڕی و ناوەکەی هێشتەوە. خەریک بوو بۆ هەناوی دایکی باڵ بگرێ. خۆی دایکی خۆی کوشت. پێیان گوت: کوڕی حیزب وا دەبێ... وا نەبێ با نەبێ».
لە پەنجەرەکەوە بەرەو دەرگاکە چوو. لەوێشەوە بەرەو پەنجەرەکە. زوو زوو تەماشای وێنەکەشی دەکرد. دەتگوت وێنەکە قەت ئەوەی دوێنێ نییە. وەک دوێنێ نوورانی و بە هەیبەت و پشتوپەنا نەبوو. دەتگوت ڕێوییەکی گەڕە. سات لە دوای سات بەهای خۆی لە دەست دەدا. دەنگی تەقە و هاتوهاوار چەند نزیک دەبووەوە وێنەکەش ئێسکی گرانتر و گرانتر دەبوو و گەڕتر دەبوو.
«چ بکەم؟. دەبێ باوکم تەگبیرێکم بۆ نەکا؟!. خۆ بکەومە دەست ئەو خەڵکەوە لەتوپەتم دەکەن. من ئازارم بە زۆر کەس گەیاندوە». بەڵام باوکی لە ماڵەوە نەبوو. ژنەکەی و کیژە یەک ساڵانەکەشی لە ماڵەوە نەبوون. هەر خۆی بە تەنها بە سەر پشکۆی چاوەڕوانیدا دەهات و دەچوو. جیهانی وەها لێ تەنگ ببۆوە، ببوو بە تۆڕێکی سفت و وردچندراو. ترس ببوە قورقۆشمی تواوە و جێی خوێنەکەی گرتبۆوە. دەنگ و هەرا نزیک دەبوونەوە. لە پەنجەرەکەوە بەرەو دووری ڕوانی: سەدان سەربازی بێ چەک دەستیان خستبووە سەر سەریان و ڕێیان دەکرد. ئەوانە تا دوێنێ لەرزیان دەخستە دڵی خەڵکەوە. کێیان مەبەست بوایە تیربارانیان دەکرد و کام کیژیان مەبەست بوایە بنیان دەپژاند.

ئێستا یەک چەقەنە بۆ کامیان لێدەی دەرپێکەی بەردەبێتەوە. یەک لەشکر دوودەکین و ڕەت دەبن... یەک لەشکر حیزن و تەسلیم دەبن... یەک لەشکر لە ڕیشۆڵەی ناو تۆڕ پشتوپەنای عیززەتە. پشتوپەنای عیززەت کەریم فەیسەڵە. ئەمیش لە ماڵەکەی خۆیدا چاوەڕوانی یەک چەقەنەیە تا دەرپێکەی بەربێتەوە بن پێی.

بەر لە چەند ڕۆژێک ماڵەکەی پڕ دەبوو لە خەڵک. بەخۆشی لە ماڵەوە نەبوایە خەڵک هەر دەهاتن. بە تەنەکە هەنگوین و گیسک و کاوڕەوە دەهاتن. ژنە جوانەکەی، بە پێکەنین و ڕووی خۆشەوە پێشوازی لێ دەکردن. هەر یەکە لەوانە کارێکی هەبوو: ئەم کوڕی گیرابوو و هاتبوو بۆ بەردانی و ئەو خانووی لێ زەوت کرابوو و هاتبوو بۆ وەرگرتنەوەی و ئەوی تر مێردی گیرابوو...

دەیانگوت عیززەت زەلام لە ئیعدام دەردەکا. بەرزانی مام فەرهاد، ئەو لە ژووری ئیعدام دەریکرد. دوایی کە بەر بوو، مام فەرهاد دنیای پڕ کرد: عیززەت کەریم کوڕەکەمی لە ژووری ئیعدام دەر کرد و یەک تەنەکە هەنگوین پتریشی نەویست. ئێدی عیززەت بووە شەخسە ڕەشە. بەر دەرگا و ماڵەکەیان، هەمیشە جمەی دەهات.

زەمانە ئێدی!. ئەو زەلامە ببوو بە جرج و کون نەبوو خۆی تێدا بشارێتەوە. خۆی دەیزانی چی کردووە. دەیزانی چەندی بە کوشت داوە. بیستی بە کوشت دەدا و یەکێکی دەرباز دەکرد. ترس وەک تاریکەشەو دەوری تەنی بوو. تاریکییەک وەک قوڕ مەودای بزاوتنی لێ دەگرت. لەشکرە تێکشکاوەکە لە پەنجەرەکەوە دیار بوو. دەتگوت لافاوی تۆقاندنە و عیززەت ڕادەماڵێ. تەماشای لەشکرەکەی دەکرد و ئاوڕی لە وێنەکە دەدایەوە. تا دوێنێ ئەو وێنەیە پشتوپەنای بوو، بەڵام وا خەریکە ببێتە دوژمنی: «دایگرم؟!». ژمارەی سەربازە دوودەکییەکان چەند زیاد دەبوو، ئەویش زیاتر بە لای داگرتنی وێنەکەدا دایدەشکاند: «دایدەگرم!». ناوی کوژراوەکان وەک مێروولە بە

دیوارەکاندا هەڵدەگەڕان. جاروبارێکیش، ناوێکی گەش لە ناو ناوەکاندا دەدرەوشایەوە: بەرزان... سیروان...
تەماشای لەشکرەکەی کرد. ئاوڕی لە وێنەکە دایەوە. بە دوو هەنگاو گەیشتە وێنەکە و دەستی بۆ هەڵبڕی تا دایگرێ. بە توندی لە دەرگا درا. لە جێی خۆیدا مەیی. دەستی بە قەد وێنەکەوە وشک بوو. وێنەکە پێدەکەنی. دەتگوت بە حاڵی ئەو پێدەکەنێ و بێزار نابێ. جارێکی تر لە دەرگا درا. ئەم جارەیان توندتر لە دەرگا درا. دەستی داگرت و بە کاوەخۆ بەرەو دەرگاکە چوو. لە پشت دەرگاکەوە هەستی ڕاگرت. بە ترسولەرزەوە پرسی: «کێیە؟!». دەتگوت ئەو «کێیە»یە ڕیشۆڵەیەکە و لە ناو هەزاران ڕیشۆڵەی تری ناو تۆڕێکی تەنگدا، بە تەنها دەرباز بووە و لە شەقەی باڵی داوە.
- منم کوڕم، منم. دەرگاکە بکەوە!.
بەو دەنگەی باوکی تۆڕی ترسی لەتوپەت بوو و شوێنەواری نەما. خوێن گەڕایەوە ڕوخسار و دەستوپێی. ئارام بووەوە. دەرگاکەی کردەوە و باوکی، بێ ئەوەی هیچ بڵێ، بەرەو ژوورەوە چوو و بە دەم هەنگاونانەوە بانگی کرد: وەرە کوڕم وەرە!. بە جووتە بەرانبەر یەک ڕاوێستان. عیززەت چاوەڕوانی یەک وشەی ڕەحمەت بوو. چاوەڕوانی دەروازەیەک بوو لێیەوە دەرباز بێ. دەمی داپچڕیبوو و بە دوو چاوی زەندەقبراوەوە لە زاری بابی دەڕوانی.
- کوڕم حکوومەت شکا.
- ...
- کورد دەستی بە سەر هەموو شتێکدا گرت. ها بگرە!. ئەو کاغەزەم بۆ پەیدا کردی. بڕۆ بدەرە پاڵ ئەو خەڵکە و وا بزانە تا ئێستا هیچ ڕووی نەداوە.
عیززەت کاغەزەکەی یەکالا کردەوە. لای خوارەوە مۆر و ئیمزای سووری پێوە بوون. لە سەرەوەڕا خوێندیەوە. عیززەت ئەندامی حیزبێکی

شۆڕشگێڕی کوردستان بوو. کام شێخ و کام مەلا دەتوانێ نوشتەی وەها بکا؟. ئەم نوشتەیە، هار و شێتی چاک دەکردەوە.
- لە کەیەوە؟.
- نووسراوە. سێ ساڵ دەبێ ئەندامیت.
- ئاخر...
- ئاخر و ماخری ناوێت. چت بۆ ئەوان کردووە بۆ ئەمانیشی بکە و تەواو. هەموو لایەنێک خەڵکی وەک تۆیان دەوێ. لە ئاسمان بە دوای خەڵکی وەک تۆدا دەگەڕێن. تێگەیشتیت؟.
تا ئەو قسانە کران وێنەکە کەوتە ژێر پێوە: ئەمە ناچاریی بوو کوڕم، ناچاریی!. هەر ڕۆژێ قەوما، دەبێ هەر ئەمە بکەین کە ئێستا دەیکەین. دەی خۆت ئامادە بکە با بڕۆین.
کتوپڕ عیززەت هۆشی وەبەردا هاتەوە. ئێدی ڕێک دەیزانی دەبێ چ بکا و چۆنی بکا. جلەکانی گۆڕین و چەکی هەڵگرت و زۆری نەبرد خۆی لە پێشەوەی خەڵکەکەدا دیتەوە. گەیشتە ئەو جێیەی کە ناوی وەک مێروولە زۆری لێ تۆمار کرابوون. هاواری دەکرد: دەی بە قوربانی کوڕ بم!. دەی کوڕینە چیتان بەر دەست کەوت بیسووتێنن. شوێنەواری هیچیان مەهێڵنەوە.
سووتا، شارەناوەکان سووتا. هەموو ناوەکان سووتان و لەگەڵ دووکەڵدا چوون بە ئاسماندا. هەزاران ناو بوون بە گەرد و لە چاو بزر بوون... ئاگر هەموو ناوەکانی سڕییەوە... شوێنەواری ناوەکان لە هیچ کوێدا نەما... ئەو ناوانە، هەرگیز نەنووسرابوون...

# لافنا

«تەنهام، خودای بە بان سەرانەوە تەنهام! لە ناو یەک دەریا مرۆڤدا تەنهام!. تەنهایی ڕێم بۆ خۆش دەکا بە دوای زاتی تۆدا بگەڕێم و بتکەم بە هاودەمی خۆم. لە تەنهاییدا دەتوانم بتدۆزمەوە. تۆ لە کوێ نیت؟. کوێت بە دوودا نەگەڕێم؟. دەمەوێ بتدۆزمەوە تا نهێنی شێتنەبوونی ئەم خەڵکەم بۆ ئاشکرا بکەی. من شێتم؟. ئەم خەڵکە، خودا نازدارەکەم، چاویان پەڕیوەتە تەوقی سەریان: نە دەبینن نە دەژنەون نە تێدەگەن. ئەم خەڵکە، بە هەموو کارەساتێ شوکرانەبژێرن و (نەء) نازانن. لەگەڵ ڕیتمی ڕاست ـ چەپ، ڕاست ـ چەپدا مەش دەکەن و خەت بەرنادەن. هەر کەسێ بیەوێ ڕیتمیان بە سەردا بسەپێنێ دەیسەپێنێ. ئەمانە، بەر لە هاتنی ڕۆژی حەشر، حەشر دەکرێن و کەس ئاگای لە کەس نییە. دایک ناپەرژێتە سەر بەچکەی خۆی و باوک منداڵی خۆی ناناسێ. ئەمانە، نە دەبینن نە دەژنەون نە تێدەگەن. چاو لە حەوا دەڕۆن و نازانن کوێوە دەچن. ئاشکرابوونم دەوێ خودا نازدارەکەم!».

عەولاڕەش لە سەربازیی دەرکرا. لیژنەی پزیشکان شێتبوونی سەپاند و

مۆریان کرد. (متخلف عقلیا) بووە مۆرێک و پێوەی نرا. وەک گامێش ناوچەوانی داغ کرا. ئێدی هەموو ئەوانەی کە چاویان پەڕیبوە تەوقەسەریان و نە دەیانبینی نە دەیانبیست نە تێدەگەیشتن، کەللـەیان پڕ بوو لە (متخلف عقلیا). بە دەستەجەمعی لە دار و بەرد و هەور دەپاڕانەوە وەک ئەویان لێ نەیات. شانازییان دەکرد کە وەک ئەو نەبوون. دەپاڕانەوە: خوایە وەک عەولا ڕەش ڕیتمی ڕاست ـ چەپمان لێ تێکنەدەی!. خوایە وەک ئەو شێت نەبین!.

مەشیان دەکرد. زرمەی پێلاویان دەهات و لەگەڵ سەربازی ئەوسەری دنیادا تۆزیان لە باوەغولغول و شامەغەریبە هەڵدەستان. کەس بە موو لە ڕیتمی ڕاست ـ چەپ لاینەدەدا، عەولاڕەش نەبێ. عەولاڕەش، کە گوێی لە ڕاست ـ چەپ دەبوو، تەرە دەبوو. ئەو، لەگەڵ ڕیتمەکەدا نەدەگونجا. کە عەریفەکە بۆی باس دەکرد لاقی چەپ و باسکی ڕاستی بۆ پێشەوە بهاوێ و لاقی ڕاست و باسکی چەپیشی بۆ دواوە، خۆی بە هەڵوەشاوەیی دەدی. باسکێک و لاقێکی لەو پێشەوە کەوتبوون و باسک و لاقێکێشی لە دوایەوە بەجێ مابوون. کە دەیانگوت: ڕاست ـ چەپ، ئەو لە ڕیز دەردەچوو و ڕایدەکرد. دەترسا هەڵوەشێتەوە. دەیانگوت عەولاڕەش لە دڵی خۆیدا هەرەلەیلێ دەڵێ و لەگەڵ ئەو ئاوازەدا ڕادەکا. هەرەلەیلێ نەبێ عەبە عەیبی نییە.

«خودای بە بان سەرانەوە!. کە گوێم لە چەپ ـ ڕاست دەبێ تۆز لە باوەغولغول و شامەغەریبە هەڵدەستێنێ، حەشرێ دەبینم ئەوسەری دیار نییە. باوەغولغول دەبینم خەڵتانی خوێنە و کەللـەسەر بە کفرەکەی شامەغەریبەوە هەڵواسراون. ئەو دەشتەی نێوان باوەغولغول و شامەغەریبە، هەزاران کەسیان پێدا ڕەت دەکرێن. هەموویان، چاویان پەڕیوەتە تەوقی سەریان و نابینن و ناژنەون و تێناگەن چ باسە. کەس ئاگای لە کەس نییە. دایک ئاگای لە بەچکەی خۆی نییە و باوک ئەولادی خۆی نابینێ. ئەوەی من دەیبینم کەس نایبینێ. ئەوەی من دەبیستم کەس نایبیستێ. شەپۆلە زۆر کورتەکان دەژنەوەم. ڕەنگەکانی خوار

وەنەوشەییەوە دەبینم. لرفەی سەربازە غەوارەکان دێتە بەر گوێم کە دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنان. ژنان، ڕوومەتی خۆیان دەڕنن. گوێم لە خزەی برینی ڕوومەتیانە. بۆچی ئەوەی من دەیبینم کەس نایبینێ؟. بۆچی هەر من ئەو حەشاماتە دەبینم کە لە داهاتوودا، بە دەشتی نێوان ئەو دوو جێیە پیرۆزەدا ڕەت دەکرێن و بەرەو خوار، بە ڕێیەکیاندا دەبەن کە ڕێ نییە و بۆ جێیەکیان دەبەن، کە جێ نییە؟. ئەگەر بشزانن دەیانبەن، نازانن بۆ چی دەیانبەن. چاویان لە تەوقی سەریانە و ڕێ دەکەن. هەر منداڵەکانیان نازانن بێدەنگ بن. ژنەکانیش زمانیان لە کێڵان ناچێ و دەمی خۆیان ناگرن. پیاوەکان، کامیان سمێڵیان لە سمێڵی هەموان زلترە، زەلیلترە. پیاوە سمێڵزلەکان لە مردن ناترسێن بەڵام لە ترسی ئەوەی بە سمێڵ ڕایانکێشن، خۆیان دەمرن. نابێ دەستی کەس بەر سمێڵیان بکەوێ. لە بەر ئەوە، بە بێ کرکە، لە پێشی حەشاماتەکەوە دەڕۆن. هەرە سمێڵزلەکەیان، بەرانئاسا لە پێشی هەموانەوە دەڕوا و با سمێڵی دەشەکێنێتەوە. تەمێی ژنان دەکەن بێدەنگ بن. چاو لە منداڵان سوور دەکەنەوە تا کڕ بن. هەرە سمێڵزلەکە تەگبیر بۆ پیاوان دەکا: بیانوو مەدەن بە دەستەوە با بە سمێڵ ڕامانەکێشن. دەستدرێژی بکەنە سەر ژنیش قسە مەکەن تا سمێڵمان گەلاو نەکەن. منداڵەکانیش سەربڕن قسە مەکەن با سمێڵمان پیس نەبێ و دەستی ئەو گەوادانەی بەر نەکەوێ.

ژنەکان سمێڵیان نەبوو بۆیە زمانیان لە کێڵان نەدەکەوت: (گوو بە قورگی باوکی چاکتان!. هەی زاڵمی زاڵمباوکانە!. بەراز بە بەرازی خۆی لێمانکەوێ بەڵام بۆنی دەرمان ئەسپێ و هەناسەی ترشاوی ئێوەمان بۆ نەیات. کافرباوکانە! بمانکوژن لەوە چاکترە فەساڵی سەگسارتان ببینین!).

منداڵەکان سمێڵیان نەبوو بۆیە دەوێران بگرین. منداڵەکان لە دوای دواوە دەڕۆیشتن و دەگریان. خودا چاکەکەم!. ئەوەی کە دەیبینم داهاتووە... ڕابردەی داهاتووە. نا، داهاتووی ڕابردووە. نازانم. کات بۆ تۆ چۆنە

خوداکەم؟. من وام بە سەر لوتکەی کاتەوە. ڕابردە و داهاتووم لێوە دیارن. کات تیشکێکی سەرووی وەنەوشەییە و بە بەردەممدا دەگوزەرێ. بۆچی ئەوەی من دەیبیستم کەس نایبیستێ؟. بۆچی ئەوەی من دەیبینم کەس نایبینێ؟. دەشێ لە ناو جیهانی کوێر و کەڕدا چاووم ببەستم و گوێم بئاخنم؟. نا، خودا زاناکەم، نا.

دەرکرا. دەیانگوت: وای لە خۆت سەر بە هەشێ عەبە شێت!. وەی نەگبەتی نانبڕیاو عەولا ڕەش!. تازە نانت بە ئاوتڕا ناگا. کەس کار و کاسبیت پێ نادا. ڕوو لە هەر جێیەک بکەی بەردباران دەکرێی. زەویت لێ دەبێتە ئاسن و ناکێڵدرێ. ئاسمان بارانت بە سەردا نابارێنێ. کێ ڕوو بە شێت و هاری وەک تۆ دەدا؟. خوداش لات لێ ناکاتەوە عەبە شێت. بە هۆی تۆوە غەور دەبین عەولا ڕەش. غەزەبی تۆ هەموان دەگرێتەوە. ئەو عالەمە بەخۆ دەکەون و لە هەر جێیەک بتبینن بەردبارانت دەکەن. خودا شاخ دەبینێ و بەفری تێدەخا عەبە شێت. هەر خۆی دەزانێ چ گوناحێکت کردووە ماڵوێران. نەگبەتی لە نەگبەت بوو بۆ لە شاری کوێراندا دەست بە چاوتەوە ناگری؟. بۆ لە ڕیتمی ڕاست ـ چەپ لاتدا ماڵوێران؟. خۆ تۆ لەو عالەمە زیاتر نەبووی عەبە شێت. بۆ دەسبەرداری هەرە لەیلێ نەبووی سەرلێشێواو؟. چاوقایم!. کەللـەڕەق!. کۆنەپەرست!. بەشەری سەردەمی بەرد!. کە گوتیان حکومەت ئێدی دەبڕێتەوە. حکومەت خودای سەر ئەرزە و نەشر بەو خەڵکە دەکا یا حەشر کەیفی خۆیەتی. ئەوەی لێی هەڵگەڕێتەوە کافرە. ئەوەی لە ڕەوتی لابدا بێ ئیمانە. وەی لە خۆت قوڕبەسەرێ عەولا ڕەش!.

خودا جوانەکەم!. ئەگەر ڕۆیشتنی سەر دوو لاقان باو نەبا، نیوەی ئەو خەڵکە لە سەر چوارپەل دەڕۆیشتن. چی باو بێ ئەوان وا دەکەن. لادان لە ڕیتمی چەپ ـ ڕاست باو نییە بۆیە لێی لانادەن. خودا نازدارەکەم من نامەوێ وەک ئەوان بم. بۆ ئەوەی وەک ئەوان نەبم، بمگۆڕە. بمکە دڵۆپێکی زەریای خۆت.

عەولا ڕەش ڕیزپەڕە، لە خەت لادەدا. تەنهایە. ڕوو لە هەر جێیەک دەکا

تێیهەڵدەدەن. کراوەتە تۆپ. ئەم تێیهەڵدەدا ئەو دەیقۆزێتەوە. بە دەم پێکەنینەوە تێیهەڵدەدەن. ئەویش ناچار بووە بە ڕۆژ بخەوێ و شەو بێدار بێ. ئەوان تێیهەڵدەدەن، ئەویش لە خودای خۆی دەپاڕێتەوە: (خودا نازدارەکەم بیانبەخشە چونکە تێناگەن. دەمکەن بە تۆپ بیانبەخشە. بەرەو دەشتی کاکی بە کاکی پێش حەشاماتی ژن و منداڵ دەکەون بیانبەخشە. بۆ زندەبەچاڵکردنی خۆیان بە چرنۆک چاڵ هەڵدەکەنن، بیانبەخشە. تێناگەن خودا باشەکەم. ئەمانە، فێری بەخشین و لێبوردنن. فێرن بە دەستەجەمعی لاقی چەپیان بۆ پێشەوە بهاون و باسکی چەپیان بەرەو دواوە. فێرن بپاڕێنەوە. لە گەورە دەپاڕێنەوە بۆیە زوو زوو لە تۆش دەپاڕێنەوە. لە منداڵییەوە فێرە پاڕانەوە دەکرێن. بیانبەخشە خودای باش. بەخشین خەڵاتیانە. ئامانج و سەرکەوتنیانە. ئەمانە، خودا چاکەکەم، بە بێ ڕیتم و دەستوور ناتوانن هەنگاو بنێن. دەستوور نەبێ یەکتر دەخۆن. بیانبەخشە خودا جوانەکەم. فیکەی پشوویان بۆ لێدرێ پشوو دەدەن دەنا تا خۆیان نەپسێنن پشوو نادەن. فیکەی خەوتنیان بۆ لێدەدەن دەخەون دەنا قەت ناخەون. فیکەی ڕابوونیان بۆ لێنەدەن، هەتا مردن دەخەون. بە فیکەی خواردن و خواردنەوە نەبێ نە دەخۆن و نە دەخۆنەوە. فیکەی کفر کفریان پێ دەکا و فیکەی ئیمان ئیمانداریان دەکا. فیکەی فەلسەفە دەیانکاتە فەیلەسووف. فیکەی شۆڕش شۆڕشیان پێ بەرپا دەکا و فیکەفیک مێشکی تەقاندم خودا جوانەکەم. بە یەک فیکە بە دەستەجەمعی دەبنە ڕۆشنبیر و بە یەک فیکە نەفرەت لە ڕۆشنبیریی دەکەن. بیانبەخشە خودا بەڕێزەکەم چونکە تێناگەن. کە من بەردباران دەکەن کاری فیکە. بیانبەخشە...

گوێی لە دەنگی پیاوێک بوو. هەر بە دەنگەکەدا زانی تەمەنی چەندە و هەر لایەکی سمێڵی چەندە. بە کوڵ دەگریا و وەک ژنێکی جەرگسووتاو دەیلاواندەوە: فالە فالە... لافنا لافنا... فلانا فلانا... لاناف لاناف...، عەولا ڕەش بەرەو دەنگەکە چوو. چۆنی بیر لێ کردبۆوە وەها بوو، پرسی: «خارە لۆ وە دەکەی؟». بە چپە وەڵامی دایەوە: «ورس بە

سەگە شێت!. مەبەستم ئەنفالە. «
- ئەدی لۆ بە ئاشکرا نایرێی؟. لۆ جێی عەرفان دەگۆڕی؟.
- دوایی نامبەخشن. ئەگەر بە ئاشکرا بیڵێم لێبوردنم بۆ دەرناچێ. نابێ کەس بزانێ هەرچی ئەولاد و نەوەم هەیە ئەنفال کراون. نابێ کەس بزانێ هەر بەخۆم ماومەتەوە. ئەگەر بزانن نامبەخشن، نا!.
- چما ئەتوو نیادەرتالیت دوات ببڕێتەوە؟. بە دەنگێکی برند هاوار بکە: ئەنفالە... ئەنفالە... ئەنفال!.
- نیادەرتال چییە؟.
- ئەتووی. هەی مەیموون!. مەیموونیش بەچکەی بخورێ دەزیقێنێ. ئەنفالە ئەنفال. گێت لێمە؟. ئەنفال، لافنا نا. دە برێ دەی!. بە دەنگێکی برند برێ: ئە... نف... ال.
- ئە... نف...
- دەی!. دەک داوەشێی پیرە سە!. دەی بابی بابم. برێ: ئەنفال!.
- نا بە خوا عەبە شێت، ناوێرم. حکومەت نەمبەخشێ خوداش نامبەخشێ. باوکم بە ڕەحمەت بێ وەهای دەگوت. مەلا نەجموددینیش وەهای دەگوت. هاوڕێ عەزۆکیش هەر وا دەڵێ. هەموو مەزەبەکان هەر وا دەڵێن. حەتتا دکتۆر هینیش هەر وا دەڵێ. دکتۆر هین عەمرێکە لێزانە و دەچێتە هەر جێیەک...
- ئا، دەچتە هەر جێیەکی ڕەعتییەکی وێ دەدەن
- ئەویش دەمی پێوە دەنێ...
- دەرێ: هاوار لۆ لێبوردنێ! لێبوردن لۆ نما؟. لۆ...
- ئەوەی نەچێتە بەغدا ڕەنج بە خەسارە...
- ئەوەی نەچتە بغدا گەورە نابێ. دەرێ ئاخ بەغدا... عەی حەلا بەغدا... خودا نازدارەکەم بیبەخشە. کەرە و کەر دۆزەخ نابینێ. مەڕێکی بێ دەسەلاتە و مەڕ دۆزەخ نابینێ. لەگەڵ کەرەکەی عوزێر و سەگەکەی ئەسحابلکەهف و مەڕی سمایلۆکدا حەشری بکە و بیخەرە بەهەشت. لە بەهەشت چی زۆرە گیا زۆرە و ئەمیش گیاخۆرە. خودا جوانەکەم خۆ

لە بەهەشتت کەم نابێ، دە بیبەخشە و بیخەرە بەهەشتەوە. بیبەخشە و ئەهـ.

❊ ❊ ❊

بەینێ باو بوو: ئەو عەولاّ ڕەشە یەکێک بوو لەو شێتانەی هەولێر کە بەرگرییان کرد. ئەو سەرشێتانە لەگەڵ ڕیتمی چەکداران و خەڵکەکەدا ڕێک نەکەوتن و لە جێی خۆیاندا مانەوە. کە هەموویان کوژران، عەولاّڕەش دەستی لە شەڕ هەڵگرت و خۆی دزییەوە. خەڵکەکە ڕایاندەکرد و شێتەکان، شێتانە بەرگرییان دەکرد. هەرە سمێڵزلەکان لە پێشەوە ڕایاندەکرد. دوای ئەوان سمێڵقەیتانی و ئەوجا سمێڵتاشراو. ئەوجا هەرزەکار. دوای هەرزەکار ژنەکان ڕایندەکرد و دوای ژنەکانیش منداڵ. هەموان بە پێخاوسی ڕایاندەکرد و باسیش هەر (هات... هات) بوو. عەولاّڕەش لە خۆی پرسی: کەنگێ سمێڵزلەکان لە دواوە دەبن؟. زۆری بیر کردەوە تا زانی: لە بەرەنگاریدا لە دوای دواوەن و لە ڕاکردندا لە پێشی پێشەوەن. حاجی ئەحمەد وای نەکرد. کە خەڵکەکە ڕایان کرد، ئەو دەستی دایە تفەنگ و بەسمێڵ و بێ سمێڵ ڕۆیشتن و بە تەنها مایەوە. پێی ڕاگەیاندن: ئێوە بڕۆن، من کەمێ ئەو لەشکرە دوا دەخەم تا نەجاتتان دەبێ. هەر واشی کرد. ئەو بە تەنها بیست دەقیقە لەشکرەکەی دواخست. باجەکەی ئەوە بوو دوای کوشتنی، سەریان لە جەستەی جیا کردەوە. وەک حەزرەتی حوسێن.

عەولاّڕەش لە یەکەم سمێڵزلەوە پێدا هات و پاڕایەوە تا گەیشتە منداڵەکان. دەیویست بەرگریی بکرێ، بەلاّم کەس گوێی لێ نەدەگرت شێتەکان نەبێ. حاجی ئەحمەد نەمابوو بە گوێی بکا. شێتەکان بەرگرییان کرد تا تاقیان لێ بڕا. عەولاّ سەرکردەیان بوو. هەر کە یەکێکیان لار دەبووەوە، دەچووە دیاری: «سەگەشێت کوژرای؟. عەیب ناکەی!. دە هەستە دەی هەستە داوەشێی!. ئێمە نەبین لەشکر دەگاتە سمێڵزلەکان».

عەولاّڕەش ڕاکردنەکەشی شێتانە بوو. کە هەموویان کوژران ئەو هاواری کرد: «ئەمن لەگەر زۆربەدا نابم. مادامەکی هەمووتان کوژران، ئەمن

دەمینم!».

دەروونناسەکان دەیانەوێ فێری بکەن بڵێ «لاّفنا» و ئەویش ناڵێ. تەماحی دەخەنە بەر وپارەی دەدەنێ، هەڕەشەی لێدانی شێخی لێ دەکەن و جگەرەی لێ دەبڕن، هەر ناڵێ «لاّفنا». دەیکەن بە تۆپ: ئەم تێیهەڵدەدا و ئەو دەیقۆزێتەوە، هەر ناڵێ. ئەو لەگەڵ زۆربەدا نابێ. ئێستا زنجیری لە لاق و پیلە و لە کونجێکدا کەوتووە و کار و پیشەی دواندنی خودایە: «نابینن، نازانن، تێناگەن، نازانن چ دەکەن!. خودا نازدارەکەم بیانبەخشە. مەڕن و مەڕ ناچنە دۆزەخ. لەگەڵ ڕیتمی مێگەلدا دەرنابەم خودا جوانەکەم. ئەم کونجەم بۆ بهێڵە خودا گیان. ئێرە بۆ من پەرستگایە و لێمی مەستێنە تا تێکەڵی خۆت دەبمەوە. تەنهام و بە دوای تەنهاییدا دەگەڕێم. پرسیار لە ناو سەرمدا زاوزێ دەکەن و چی دی لە ناو کەڵلـەمدا جێیان نابێتەوە. خەریکە سەرم دەتەقێ خودا جوانەکەم. ئەی خودا جوان و هەمەتەرح و هەمەڕەنگەکەم!. ئەم پرسیارانەی ناو سەرم بە سەر ئەو خەڵکەدا دابەش بکە. با بپرسن ئاخۆ لافنا چییە. بۆ ئەو عالەمە خۆی لێ لادەدا؟. خۆ هەر ئەوەندەیان خۆشە فێرە پرسیار بن. پێم وایە ئێدی هەر دەپرسن و چاوەڕوانی وەڵام نابن. کەس نابێ وەڵام بداتەوە. بەڵام یەکێکی وەک من دەبێ لە ڕیتمی پرسیاران لابدا و وەڵام بداتەوە: لافنا ئەنفالی بەرەواژە. سەرکەوتنی بەرەواژە. شەهادەتی ئەنفالکراوان «بە گونمەوە»ی قوماربازانە. لافنا ژیانی بەرەواژە... سەرفرازی بەرەواژە... بەرەواژە خودا جوانەکەم، بەرەوەواژە!».

❊ ❊ ❊

بەینێکە پەیکەری پیاوێکی کورتەبنەی شرپۆش لە چوارڕێیانێکدا، لە سەر سەکۆیەکی مەڕمەڕ دانراوە. کراس و شەرواڵەکەی بە نیشانەی پرسیاری ورد ورد نەخشێندراون و خاڵە تۆخەکانی جەمەدانەکەی و قۆپچەکانی کراسەکەی، نیشانەی پرسیارن. ڕۆژی لەدایکبوون و مردن و ناوی خۆی و بابی، لە سەر مەڕمەڕەکەی بەر پێی، هەر بە نیشانەی پرسیار هەڵکەندراون. نیشانەی پرسیار برەوی هەیە و شار و وڵاتی داگرتووە.

ئەو خەڵکە وا ڕاهاتوون هەموو ڕۆژێکی هەینی، دوای نوێژ، خۆپیشاندان ساز دەکەن. کە دەچنە مزگەوت، یەک یەک و دوو دوو دەچن. بەڵام کە دەردەچن، دەڵێی بە تێڵاوە دوایاندەکەون و هەڵیاندەبڕن. بە لێشاو دەردەچن و مل بە یەکەوە دەنێن. حەفتە نییە یەکێک یا دوو نەبێتە بن دەستوپێوە. کە دێنە دەرێ، هەر یەکە موقەبایەک لە باخەڵی دەردەهێنێ و بەرزی دەکاتەوە. هەر یەکە لە موقەباکان، نیشانەیەکی پرسیاری لە سەر تۆمار کراوە. تاوێ بە دەوری پەیکەرەکەدا دەسوڕێنەوە، ئەوجا بەرەو پەرلەمان، بە بێ دەنگی دەکەونە ڕێ. هەموو جارێکیش لە نیوەی ڕێدا تووشیان دەبێ بە تووشی لاوێکەوە، کە لە پەرلەمانەوە بە تەنها دێت و موقەبایەکی بەرز کردۆتەوە کە نیشەنی سەرسوڕمانی لە سەر کراوە. کە مەش دەگاتە پەرلەمان، ئەویش دەگاتە پەیکەرەکە و یەک دوو جار بە دەوریدا دەخولێتەوە. خەڵکەکە تا بانگی عەسر لە پەرلەمان بە بێ دەنگی دەوێستن و دوای بانگ دەچنەوە مزگەوت و بە موقەبای بەر باخڵیانەوە نوێژ دەکەن. نیشانەی پرسیارەکان لە سەر دڵیان دادەنێن و نوێژ دەکەن. پرسیاری سەر موقەباکان شەق دەبەن و هەر یەکەیان هەزاران نیشانەی پرسیاری وردی لێ دەکەوێتەوە و وەک مێرووله، لە بەر پژدێنیانەوە ڕێچکە بەرەو چاڵی چاویان و کونەگوێیان دەبەستن. پرسیاری ورد ورد بە سەر بەرەکاندا پەرت دەبن و نەخشەکان تێکدەدەن. کەس چرپەیان نابیستێ. هەموو حەفتەیەک ئەو ڕیتمە بە ڕێوە دەچێت و لاوە شرپۆشەکە، نەبێ کەس لێی لانادات. وڵات و شار بوونەتە یەک نیشانەی پرسیار و لە هەموو جێیەکەوە دیارە. ئا، باو باوی نیشانەی پرسیارە. میلی کاتژمێرەکانیش بە نیشانەی پرسیار دروست کراون.

# بەرەو دۆزەخ

پیرەژنێکی حەفتا ـ هەشتا ساڵەی دەمبەتاڵی بەدفەساڵ، کە سیمایەکی هەڕەشەئامێزی هەبوو و لە هەمان کاتدا بزەیەکی بە سەر لێوەوە بوو، بە قاڵدرمەکاندا، بەرەو ڕووم هەڵدەگەڕا. من سەرەوخوار دەبوومەوە. کە گەیشتە ئاستم، بزەکەی بووە پێکەنین و دوو ددانی خرێنەبڕەی زەردی دەرکەوتن. چۆن مۆنالیزا بە بزەکەیڕا دیارە کە ئاوسە، ئەویش بە بزەکەیڕا دیار بوو ئاوس بوو. ئەرێ مۆنا لیزا ئاوس نەبوو؟!... سەد مەتەڵ لە بزەی مۆنا لیزادا هەیە و ئاوسبوونی یەکێکیانە.
گەیشتە بەردەمم و بە گوێمدا چرپاندی: «ئاوسم... زگم حەوت مانگانە. حەوت مانگ بەر لە ئێستات لە بیرە؟. ئاودەستی مەیخانەکەت لە بیر ماوە؟!». موچڕکم پێدا هات. وەک ئەوەی لە ژێر ئەشکەنجەدا دانم بە تاوانگەلێکدا نابێ کە ئەنجامم نەداون، بێ ئەوەی یەک وشە بڵێم، ئاوها لە ناخەوە دانم بە تاوانی خۆمدا نا. بەڵێ لە بیرمە. ئەوەی لە ئاودەستی مەیخانەدا دروست دەبێ دەبێتە بەرهەمی عیشق!. بە ترسەوە تەماشای زگیم کرد و دیتم. ڕاستی دەکرد حەوت مانگان بوو. پیرەژنێکی حەفتا

ـ هەشتا ساڵەم لێ ئاوس بوو. هەر بە ڕەنگ و ڕوخسار و بزەکەیڕا دیار بوو کە زگەکەی کوڕە. جگە لەوەش، ژنە فاڵچییەکی ناولەپخوێن پێی گوتبووم: «تۆ دەبی بە باوکی حەوت کوڕ و قەت کچت نابێ!».
دەوروبەرم تاریکستان بوو; بەڵام تیشکێکی بەهێز و هەمەڕەنگ لە پرۆجەکتەری بنمیچەکانەوە لە ڕوخساری من و پیرەژنە ئاوسەکەی دەدا. تاریکستانەکە، هەزاران جووتە چاوی تێدا بوون و هەموویان لە ئێمەیان دەڕوانی. هەموو چاوەکان دەچروسکانەوە و هێندێکیان بە سەر زەوییەکەدا گلۆر دەبوونەوە و هێندێکیان لە مۆلەق بە حەواوە وێستابوون و لە ئێمەیان دەڕوانی. لە ناو ئەو هەزاران جووتەچاوەدا هەستم بە بوونی جووتە چاوی باوکم دەکرد کە ئاگریان لێ دەبووەوە و منیان دادەگیرساند. مەحاڵ بوو لەو هەموو چاوانە و لە چاوی باوکم ون بم. دوای بزەیەکی گاڵتەئامێزی پیرەژنە ئاوسەکە، هەموو چاوەکان بوون بە چاوی باوکم. چاوی باوکم، بوونە گەردواێک و هەموو چاوەکانی تری تێدا کۆ بوونەوە. گەرداوەکەی باوکم منیشی لوول دەدا. تاریکستانەکەی دەورم بوو بە یەک قەوارەی پڕ لە باوکم و هەڕەشەی لێ دەکردم. لە دەست باوکمی ناو تاریکستانەکە ڕامکرد... تا تینم تێدا بوو، بەرەو جێیەکی دەرەوەی ئەو جێیە تاریکە پڕ لە باوکمە ڕام کرد. دەتگوت دووپشک دەبارێ و من بە بەر بارانی دووپشکدا لە دەست دووپشک هەڵدێم. لە نێوان عیشقی ئاودەستی و جەزرەبەی باوکمدا چ بکەم؟!.
هاوتەریب لەگەڵ جۆگە ئاوەکەدا، بە گورگەلۆقە ڕام دەکرد. تاریکی دەوری تەنیبووم و هەموو تاریکییەکە باوکمی تێدا بوو. باوکم، تەنها لەو دوو سێ هەنگاوەدا نەبوو کە چاووم فەرقی دەکرد. جۆگە ئاوەکەم نەدەدی بەڵام گوێم لە خوڕەی ئاوەکە دەبوو، کە ئاوازێکی مەرگهێنەری لەگەڵ هەناسەم و وردەبەردی بن پێم و بەرپێمدا پێکدەهێنا. چاوە ئاگرینەکانی باوکم لە ناو تاریکیدا، جاروبار بڵاچەیان دەدا. چۆن جووتێ چاو هەموو تاریکایی شەو پڕ دەکەنەوە ئەو دوو سێ هەنگاوە نەبێ کە فەرقم دەکرد؟!.
ئەو کەتنەی من کردبووم، هی ئەوە نەبوو باوکم لێم خۆش بێ. نا،

کەتنێکی وام کردبوو دەبوو بە نەمریی لە ژێر ئەشکەنجەدا بمێنمەوە. من گیایەکەی گلگامیشم دزیبوو و مار بێ تاوان بوو. لە دەست ئەو نەمرییە، بەرەو دۆزەخ هەڵدەهاتم. دۆزەخ و مەیخانە و قەحپەخانە و قومارخانە، جێگەگەلێک نەبوون باوکم چاوی پێیان بکەوێ. پێم وا نەبوو باوکم ڕێی بکەوێتە دۆزەخ. نا، کەسێ سەری بچێ نوێژی نەچێ و چوار حەجی کردبێ و گەورە و گچکە بۆ تەبەڕوک ناولەپیان ماچ کردبێ، خۆ سەگی هار نەبووە بچێتە دۆزەخ. باوکم لە دۆزەخ چ دەکا؟!. ئەو هەر دەبێ بچێتە بەهەشت و منیش دوژمنم ئەو جێیە بوو کە ئەوی لێ بێ.
باوکم، هەر لەپێکی بەقەدەر دەرخۆنەیەک بوو. چاوی پروشکی ئاگریان لێ دەردەهات. بە سەر بەرددا بڕۆیشتبا پروشکی ئاگر لە بەردەکان دەبووەوە.
لە بەر ئەوەی لە پۆلیس دەترسا، عەزرەتم بوو هەموو جیهان ببنە پۆلیس.
ئاخ پۆلیسی بەسۆزی وڵاتەکەم... ئاخ پۆلیسی نەجاتدەر و ژیانبەخش!. بۆ زیاد ناکەن؟... بۆ زاوزێ ناکەن؟... ئەی خودا سا ئەو پیرەژنە حەفتا هەشتا ساڵەیەی لێم ئاوس بوو، پۆلیسێکی ببێ و پەتی قەنارە بخاتە ملی باوکم. خوایە دەسا ببێتە سەرۆکی پۆلیسی هەموو دنیا و کەلەپچە بخاتە مەچەکی هەموو ئەو پیاوە بەهەشتیانەی کە لە باوکم دەچن.
بە دەم هەناسەبڕکێوە، شان بە شانی جۆگە ئاوەکە گورگەلۆقەم دەکرد. دەنگی بەردەوامی ئاوەکە، لە سەرەتاوە ئاوەدانیی بوو بەڵام دوایی لێم بووە بێدەنگییەکی قورس و تۆقێنەر. لە دەنگی بەردەکانی بن پێم دەترسام. لە دەنگی هەناسەی خۆم دەترسام. لە دەنگی ئاوەکە دەترسام. دەنگی بەردەوام بێدەنگی بەردەوامە و خەوهێنەرە، بەڵام ترسی باوکم کە هەموو تاریکەشەوەکەی لێم پڕ کردبوو، لێنەدەگەڕا خەوم بێ. خەوی چی!!. هەر ئێستا نا نەختێکی تر باوکم پشتەملم دەگرێ و یخم دەکا. بە خۆمدا دەمیزم و لە سەر ئەوەش نەمریی دەخاتە سەر تەمەنی نەمریمەوە و ئازارم دەدا. نا، وا چاکە هەر ڕا بکەم... بڕۆم تا پاسەوانانی دۆزەخ دەبینم و داوایان لێ دەکەم پەنام بدەن. لەوێ، دەبمە شوانی مار و دووپشک. دەبمە چاودێری ئەو تێلایانەی کە خەڵکیان پێ دارکاریی دەکەن. لەگەڵ

ژنەکەی ئەبولەهەبدا دەبمە کۆلکیشی سووتەمەنی کولخەنی دۆزەخ. کێ دەڵێ نامکەنە چاودێری تەرازووی خێر و شەڕ؟. کێ دەڵێ دەفتەری پاکبوونەوەی خەڵکم نادەنێ. ئەوێ بۆ من لە هەموو جێیەک ئارامترە. لەوێ نەحەوێمەوە لە هیچ جێی تر ناحەوێمەوە. ئاوسکردنی پیرەژن شتێ نییە سزای نەبێ. سزای ئەمە بە شێوەی نەمرییە و تا هەتا پاکبوونەوەی نییە. چاوی باوکم، هێندەی دۆزەخ ئاگریان تێدان و لە دۆزەخیش سووتێنەرترن. جگە لە هەموو ئەمانەش، دایکی ناموبارەکم کە هێشتا شیرەخۆرەبووم مرد و بە جێی هێشتم، لەوێ باروبنەی خستووە. چۆن دڵی هێنای جێم بهێڵێ؟. لە سەر تاوانی وا چۆن ناخرێتە دۆزەخەوە؟. دەزانم ئێستا دەموپلی هەڵقرچاوە و قژ و برژانگی سووتاون. بەڵام خۆ پێی دەکرێ حەفتەی جارێ ڕوخسەت لە چاودێران بخوازێ و بێتە لای خۆم و مار و دووپشکەکانم.

هەستم دەکرد باوکم وا بە دوامەوەیە. ئاوڕم دەدایەوە و تەماشای ئەو مەودا کورتەم دەکرد کە چاووم دەیدی، کەمێ ئاسوودە دەبووم. باوکم لەو دوو هەنگاوەدا نەبوو. کێ دەڵێ لە ناو یەکەم هەنگاوی ناو تاریکییەکەدا نییە؟. هاکە زانیت کەوتە بەر مەودای بینینم. ئێدی چۆکم دەشکێ و خۆم بە دەستەوە دەدەم. بە خۆمدا دەمیزم. ئەویش، وەک ئەوەی شتێ بجوێ، ددانی بە چیرەوە دەبا و بێ ئەوەی زاری بکاتەوە دەڵێ: ئەمەشت کرد؟. هیچ نەما پیرەژنی حەفتا ـ هەشتا ساڵە ئاوس بکەی؟. ئاخر بە نەنکی من دەشێ نەک تۆ. هەی مەلعوون! دەبێ سەد ساڵ لە دۆزوخی مندا بە سەر بەریت! هەی زۆڵ! ئابڕووی منت برد!. ئەو وا دەڵێ و بزەی پیرەژنەکەش لە ناو تاریکیی ئاسماندا دەردەکەوێ. ماوەیەکی کەم کاس دەبم و گوێم لە دەنگی ئاوەکە نامێنێ. ئاو کوا دەنگی هەیە. بەرد ئاوی بەرکەوێ دەنگی دەبێ. ئەو دەنگە هی ئاوەکەیە یا بەردەکە؟. ڕەنگە ئەو دەنگە، دەنگی گەمەی جووتبوونی ئاو و بەرد بێ. لرفەیان دێ. ئاو بە ماسی ئاوس دەبێ و بەرد بە قەوزە. بەڵام خۆ باوکیان نییە سزایان بدا، ئێدی بۆ بترسێن؟. ئاو لە ترسی سەرچاوە هەڵدێ بەڵام بەرد لە جێی خۆیدا دەمێنێ. من لە

ترسی باوکم هەڵدێم و پیرەژنەکە، لە ژێر تیشکی پرۆجەکتەرەکە، بە بێ منەتیی دەمێنێ. ئەو بۆ کوێ بچێ؟. ئەو بە منداڵ ئاوسە و من بە ترسی بەخۆدامیزین... من بە ترسی نەمریی ئاوسم.

باوکم، وەک لەشکرێکی بێ کۆتایی تاریکستانەکەی لێ پڕ کردبووم. من چەقی بازنەیەک بووم و ئەو بازنەکە. نیوەتیرەی ئەو بازنەیە، تا دەهات کورت دەبووەوە و هاکە زانیت باوکم، لە هەموو لاوە گەمارۆی دام و دەستی لێم گیر بوو. ڕووناکاییەکی زیوینم هاتە پێش. لێم یەقین بوو باوکم لەو ڕووناکییەدا نییە. بە تەوژم بەرەو ڕووناکییەکە چووم. چ ببینم؟: دیوارێکی چوار هێندەی بەژنی من بڵند، لە بەردەممە. دیوارەکە، لە ئاوێکی یەکجار ڕوون دروست کرابوو. خشتی نەبوو یا هەیبوو و لە ئاو بوو. تەماشای دواوەوەم کرد; باوکم بە کێردێکەوە بە دوامەوە بوو. لای چەپم باوکم بوو و لەپە گەورەکەی ئامادە کردبوو. لای ڕاستم، جۆگە ئاوەکە بوو و دەنگی برابوو و ببوو بە زەریایەک گامێشی لووش دەکرد. باوکم لە کەنارەکەیدا وێستا بوو و دوژمنانە سەیری دەکردم. بەردەمیشم دیوارێکی زیوینی ئاو بوو.

دەنگێک گوتی: مەڕۆ! ئەودیو ئەو دیوارە شاری تاوانە.

دەنگێک گوتی: مەڕۆ! ئەودیو ئەو دیوارە، شاری بێدەرپێکانی جیهانە.

دەنگێک گوتی: ئەوێ قەحپەخانەیە و ڕووی تێ مەکە.

دەنگێک گوتی: ئەودیوی ئەو دیوارە جێی خیانەتکارانە و مەڕۆ!.

دەنگێک گوتی: ئەودیو ئەو دیوارە، فریشتەی لێ لاڵوپاڵ کەوتوون و لە بەر ڕێبواران دەپاڕێنەوە لەگەڵیاندا جووت بن و کەس بێزی نایا لا بە لایاندا بکاتەوە.

دەنگێک گوتی: ئەودیو ئەو دیوارە وڵاتی ئەندازەیە. دار و بەرد و چاڵ و گردی بازنەیین. بەرەو هەر جێیەک بڕۆی بە نێوان بازنەدا دەڕۆیت و بازنەیی دەڕۆی. سێگۆشە و چوارگۆشە و پێنتاگۆن و پەرەبۆل، گۆشە و لا و تیرەیان تێکچووە و ئاسمانیشیان پڕ کردۆتەوە. نیوەتیرەی چەوت و گۆشەی سفر چاوت دەردێنن. مەڕۆ!!. لەو دیوارە ئاودیو مەبە!.

دەنگێک کە بە دەنگی ئەنکم دەچوو گوتی: مەچۆ!. ئەو دیوارە مەبڕە!. لەوێ شیش سوور دەکەنەوە و بە قوونی خەڵکیدا دەکەن. لەوێ، دەبێ ئاوی تلۆقەی خۆت بخۆیتەوە. ئەوێ دۆزەخە و مەڕۆ!. پیرەژنان حەفتەی جارێک دێنە دەرێ و لە بەر سێبەر دادەنیشن و تەشی دەڕێسن و لفکە بۆ بەهەشتییەکان دەچنن و دەرخۆنە بۆ دۆزەخ ساز دەکەن.

ئەو قسانە، لە بری ئەوەی بمترسێنن هانیان دەدام. کەسیان نەیانگوت باوکت لەوێیە. کەسیان نەیانگوت جووتە چاو تاریکایی ئاسمانیان پڕ کردۆتەوە و بە سەر زەویدا گلۆر دەبنەوە و دەچروسکێنەوە و لێت دەڕوانن. کەس نەیگوت پیرەژنی ئەوێت لێ ئاوس دەبن و بزەی گاڵتەئامێزت بۆ دەکەن. هاوارێک لە ناو ناخمەوە هات بەڵام خۆم نەمبیست: چۆن ئەو دیوارە ببڕم و بەژوور کەوم؟.

«ملی پێوەنێ. ملی پێوەنێ خۆی دەکرێتەوە... مل نێ دەی مل نێ و بیسمە...» ملم پێوە نا و بە جەستەی خۆم دیوارەکەم سمی. ئەودیو دیوارەکە، ڕۆژ بوو. ڕۆژێکی ڕووناک. نە باوک لەوێ جێی باس بوو نە ترس. ئەوێ، تا چاو بڕ دەکات تەختان بوو. ئەوێ، وڵاتی هیوا بوو. هیوای تەواوبوون و دەستپێکردنەوە. جۆگە ئاوی بە خوڕەخوڕی لێ نەبوون بەڵام هەزاران ڕچەڕێ پێکدا هەڵقژابوون. لە خۆڕا ڕێیەکم گرتە بەر و ڕۆیشتم. هەزاران سەرەتەشی لە دەم ڕێیەکە کەوتبوون. کلکەتەشی شکاو و نیکی ژەنگن بەو ناوەدا پەرت ببوون. دەرخۆنەی شکاو و قولابی چنین و لفکەی نیوەتەواو ئەو دەم ڕێیەیان تەنی بوو. دەستم بۆ هیچیان نەبرد و هەر ڕۆیشتم. ترسم نەبوو باوکم پێمڕا بگات. ئەو ناوچەیە ناوچەی دۆزەخ بوو و باوکم لەوێ نابێ. لەشم سووک بوو و دەروونم ئاسوودە بوو و بەرەو دۆزەخ، بە دەم گۆرانیگوتنەوە دەڕۆیشتم. تا ژمارەی نیک و کلکە تەشی و سەرەتەشی و قولاب و دەرخۆنە زیادتر دەبوو، لە دۆزەخ نزیکتر دەبوومەوە و بەختەوەرتر دەبووم و بۆ هەمیشە لە چاوی ئاگرینی باوکم و بزەی پیرەژنە حەفتا ـ هەشتا ساڵە ئاوسەکە و هەزران جووتە چاوی ناو تاریکایی دوور دەکەوتمەوە.

# ڕێیەکەی حاجی

وا بۆ حەوت ساڵ دەچێ ئەو درۆیەی لەگەڵدا کراوە. ئەو دەمە لە پا نەکەوتبوو. هێشتا گوڕێکی مابوو و دەیتوانی بچێتە دەرێ و تەنانەت بۆ نوێژی هەینیش دەچوو. بەڵام ئێستا تەواو پەکی کەوتووە. مەرگی دووەم کوڕی ئەژنۆی شکاندبوو. دوو شەبەقی گەورە کەوتبوونە جەرگیەوە. کە تەرمی سێیەم کوڕی هاتەوە، دوو ڕۆژان بە دزییەوە بزەی دەهاتێ. مەرگی ئەوەیان لە ترسی سووکایەتی پێکردن و تەنانەت کوشتنیش دەربازی کرد. ئەوەیان پیشەیەکی نەبوو کوشتن نەبێ. بەڵام دوای دوو ڕۆژان، هەموو خراپییەکانی بیرچوونەوە و کزە لە دڵیەوە هات و کونێکی تر کرایە جەرگی. چۆن بەرگەی سێ شەبەقی گەورەی جەرگی بگرێ؟. ئیدی پەکی کەوت و کە ڕاستیشیان دەکردوە، زۆربەی جار شەرواڵەکەی تەڕ بوو.

وا بۆ حەوت ساڵ دەچێ ئەو درۆیەی لەگەڵدا کراوە. ئەو دەمە لە پا نەکەوتبوو. نزیکەی حەوت ساڵ لەمەوبەر، سەرکردەی کول چووە ماڵە میر و لێی مێوان بوو. ئەمیش وەک سەرکردەی کول، کە هەموو تەمەنی دژی میر و بەگ و ئاغا و سەرمایەداران بە سەر بردبوو، بەرەو ماڵە میر

بەرێ کەوت. خستیانە سەر پێ و لە دەرگای حەوشە ئاودیویان کرد و ڕۆیشت. جێی کڵاشەکانی دوو هێڵی هاوتەریب بوون و جاروبار چەند دڵۆپە تەراپییەک دەکەوتنە نێوان دوو هێڵەکەوە. بە هەر حاڵێک بوو گەیشتە لای ماڵە میر. ماڵی میر بە چەکدار و ئۆتۆمبیلی نوێباو دەورە درابوو. بۆنکڕووز و گۆشتی برژاو و سپرتۆ لە ماڵە میرەوە دەهات. دەیویست سەرکردەی کول ببینێ و داوای دابینکردنی ژیانی خۆی لێ بکات. خۆی بە خاوەن ماف دەزانی و سێ کوڕی بە سەرکردەی کول بەخشیبوو. سێیەم کوڕی هەمیشە باسی پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان خۆی و سەرکردەی کوللی دەکرد: دەست بە گیرفانیدا دەکات و پارەی لێ دەردێنێ. ئەویش هەموو جارێک دەست بە شانیدا دەدا و بە هاوەڵانی خۆی دەڵێ: «کورد دە شێری وەک ئەم کەرکووکییەی هەبێ ڕزگار دەبێ». پەیوەندی سێیەم کوڕی لە دەستچووی، لەگەڵ سەرکردەی کولدا بەهێز بوو. داوای ڕەت نەدەکرایەوە.

دەبێ بە چ ڕێزێکەوە پێشوازی لێ بکا! دەبێ چ کۆشک و تەلارێکی بۆ ساز بکا. بێ گومان ئەو دەستە پیرۆزانەی ماچ دەکا کە سێ کوڕی ئازای پەروەردە کردووە. بێ گومان بە پێخواسی بە پیرییەوە دەچێ و پێی دەڵێ: «قوربان بەندەی موخلیستان شەرمەندەیە کە نەهاتۆتە خزمەتتان. دەبوو بە سەر بێم و دەستتان زیارەت بکەم». وا دەڵێ و دەستی دەگرێ و دەیباتە ژوور مەجلیس. تەنانەت لە ژوور خودی میریشەوە دایدەنێ. ئەمیش هەر بیر لەوە دەکاتەوە لە مەجلیسێکی وادا بە خۆیدا نەمیزێ. پێی دەڵێ: «جەنابی سەرکردەی کول! سێ کوڕم بە ڕێبازی ئێوە بەخشیوون. کوڕی تریشم ماون بەڵام هەر خەریکی کتێب و متێبن و بە گوێم ناکەن». میر بە ڕووخۆشییەوە بەخێرهاتنی دەکا. دیارە کە سەرکردەی کول بە پێخواسی بە پیرییەوە بچێ، دەبێ میریش لە بەری هەستێ و ڕێزی بگرێ. ئا، ئەو میرەی کە مسکێنی وەک ئەمی بە بنیادەم نەدەزانی، جووتە پێ لە بەری هەڵدەستێ. هەموو تەمەنی خۆی بە دژایەتیکردنی میر و ئاغا و سەرمایەدار بە سەر بردبوو، کەچی وا دەچێتە ماڵیان. کە سەرکردەی کول

بچێ ئەم بۆ نەچێ؟. بە خشە خش بەرەو دەرگا گەورەکە چوو. یەکێ لە چەکدارە چاودێرەکان بەرەو پیری هات.
- ها مام حاجی خێرە؟!.
- هاتووم سەرکردەی کول ببینم، کارم پێی هەیە.
چەکدارەکە چاوێکی لە هاوەڵەکەی خۆی داگرت. ڕووی کردە حاجی:
- مام حاجی ئێستا سەرکردەی کول میوانی زۆرە و فریا ناکەوێ قسەت لەگەڵدا بکا. سبەی بەیانی وەرەوە چاوەڕوانت دەبێ. باشە؟. من هەواڵی هاتنی تۆی دەدەمێ. سبەینێ بە شێنەیی قسەی دڵی خۆتی پێ بڵێ. باشە؟.
- کوڕە میوانی چی!. من باوکی سێ شەهیدم... من باوکی شێرەکەی کەرکووکم. چەکدارەکە بزەی هاتێ. چاوێکی تری لە هاوەڵەکەی داگرت و بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی:
- کام شێر؟. کەرکووک پڕە لە شێر. هەموو کەرکووکییەکان شێر و پڵنگن. کامەیان کوڕی تۆیە؟.
- من باوکی شەهید وریام. وریا شێت... وریا شێتت نەدەناسی؟. هەر بەرەیەک ئەوی تێدا بوایە سەردەکەوت.
- کوڕەکەت شێت بوو یا شێر بوو مام حاجی؟
حاجی دوو چاوی تەڕی تێبڕی و کەمێ لێی ڕاما. بێ ئەوەی هیچ بڵێ، گۆچانەکەی کردە چەقی بازنەیەک و سەدوهەشتا پلە بە دەوریدا خولایەوە و کەوتەوە سەر جووتە خەتە هاوتەریبەکەی خۆی. بە خشە خش بە سەریاندا کەوتە ڕێ. فارگۆنی قەتاری بیرکەوتەوە کە سکەی خۆی بەرنادا. ئەویش سکەی خۆی بەرنەدەدا. بە نیازی گەڕانەوەی سبەی بەیانی بەرەو ماڵ بووەوە. لە بەر خۆیەوە دەیگوت: شێت بوو یا شێر بوو؟. وەڵڵاهی منیش نازانم. هەتا لە ژیاندا بوو بەرەو ڕوو وریا شێر بوو و لە پاشملەش وریا شێت بوو.
بە خشەخش بە سەر هێڵە هاوتەریبەکاندا دەڕۆیی و دڵۆپ دڵۆپ میزیش دەکەوتنە نێوان خەتەکانەوە. کە گەیشتەوە بەر دەرگای ماڵەکەی خۆی،

کوڕ و کچەکانی وەک گەلەگورگ پەلاماریان دا:
- بۆچی چوویتە ماڵە میر؟.
- بۆ دەرۆزە چووبووی؟.
- چووبووی پارەی خوێن وەرگریت؟!.
- بە پارەی فیشەک دەژیی؟. هەر فیشەکە و چەندت دەدەنێ؟.
- لە دوو گەز خام بەولاوە چی دەبەیتە قەبرەوە؟.
- بۆ ئابڕوومان دەبەی؟.
- چما میر ئێمە بە پیاو دەزانێ تا بچیتە ماڵی؟. سەرۆکی کول دەستی کێی نەبڕیوە تا تۆڵەی کوڕت بۆ بکاتەوە؟.
- گوتیان چی؟ چییان پێ گوتی؟. ها؟.
دوو چاوی تەڕی هەڵبڕین. کەمێ بە ڕوخسارەکانی دەوری خۆیدا هەڵڕوانی، ئەوجا گوتی:
- پارەیان پێم بدابا ئاوها بە گیانم دڕ نەدەبوون. نەیاندامێ. گوتیان سەرۆکی کول مێوانی زۆرە و ناپەرژێتە سەر ئەوەی قسەت لەگەڵدا بکا. گوتیان سبەینێ وەرەوەو و بە شێنەیی قسەت لەگەڵدا دەکا. سبەینێش دەچمەوە.
ئەو شەوە هەر بیری لێ دەکردەوە. درۆیان لەگەڵیدا کرد یا بە ڕاستیان بوو. سبەی بەیانی دەچێت و سەرۆکی کول بە پێخواسی بە پیریەوە دێ و دەستی زیارەت دەکا. کۆشک و تەلارێکی وەک ئەوەی میری بۆ دادەمەزرێنێ. دیوەخانی دەبێ و خزمەتی دەکەن. ئەوجا کوڕ و کچەکانی خۆشی لەگەڵیدا نەرم دەبن. ئاوها بە تووڕەیی نایدوێنن. سەرۆکی کول پیاوێکی بە وەفایە. ئەو هەرزە چەکدارانە چوزانن وریا شێت، شێرەکەی کەرکووک کێیە!. سەرۆکی کول هەر بە خۆی دەیناسێ. چما هەر وریا نەبوو بە سوعبەتەوە دەمانچەی لە سەر سەری داکی سەرکردەی کول ڕاگرت و گوتی: «پارەم دەدەیتێ یا بێ داکت بکەم؟»؟. سەرۆکی کول چاک دەزانێ وریا کێیە. سبەینێ دەچێتەوە کنی.
دیسان خەتەکەی خۆی گرتەوە بەر. خش... خش وەک فارگۆنی قەتار

سکەی بەرنەدەدا. دڵۆپ دڵۆپ میز دەکەوتنە نێوان خەتەکانەوە. جارێ گۆچانەکەی دەستی لە جێیەک هەڵدەکەندرا و لە جێیەکی تر دەچەقی، جارێ کڵاشەکانی خش... خش بە سەر خەتەکاندا دەکشان. گەیشتە بەردەم ماڵە میر. نە ئۆتۆمبیلی دوا مۆدێل دیار بوون نە چەکدار. گەیشتە بەر دەرگا و ڕەق لە جێی خۆیدا وێستا: «ئێستا هەر بەخۆیەتی. دیارە هەموانی بەڕێ کردووە و بەخۆی چاوەڕوانی منە. بە پیرمەوە دێ و دەستم ماچ دەکا. ئەوجا دەستم دەگرێ و دەمباتە جێیەکەی خۆی و بە تەنیشتمەوە دادەنیشێ. پێم دەڵێ: بەندەی موخلیستان شەرەفمەندە. دوێنێ نەمتوانی دەستتان زیارەت بکەم. خۆت دەزانی سەگوسواڵ زۆرن و مەودام نەبوو. ئەمڕۆ بۆ جەنابتان تەرخان دەکەم. جەنابت باوکی شێرێکی کەسی بە ڕێوی نەدەزانی».
بە کاوەخۆ سەری هەڵبڕی. چاوە تەڕەکانی لە دەرگاکە بڕین. دەرگاکە ئاسنێکی پتەو و قاوەییەکی سوورخن بوو. گۆچانەکەی بەرز کردەوە و تەق تەق لە دەرگای دا. پاش تاوێک، ژنێکی کەڵەگەت دەرگای کردەوە. تەماشایەکی حاجی کرد. ئەوجا بەملا و ئەولای دەرگاکەیدا ڕوانی و لەگەڵ هەر ئاوڕدانەوەیەکدا بسکە قەترانییەکانی دەلەرانەوە: ها مام حاجی!. بە خێربێی!. ئەمرێکت هەبوو؟.
- هاتووم سەرکردەی کول ببینم. قەول بوو چاوەڕوانم بێ.
ئەوەی گوت و تک تک میز بە نافەکەیدا دەهاتە خوارێ. هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە سەری ڕۆیی: دوێنێ هاتم گوتیان مێوانی زۆرە و سبەینێ وەرەوە. ئێستا هاتووم بە خەڵوەتیی ببینم.
- مام حاجی، سەرکردەی کول بەرەبەیان ڕۆیی. لێرە نەماوە.
- ئەی منی لە بیر کرد؟.
مام حاجی بە کاوەخۆ نیوە بازنەیەکی کرد و بە سەر سکەکەی خۆیدا، بە خشەخش بەرەو ماڵ گەڕایەوە. کوڕ و کچەکانی وەک گەلەگورگ دەورەیان دا...
نزیکەی حەوت ساڵ بەر لە ئێستا ئەو درۆیەی لەگەڵدا کراوە. ئێستا هێزی

ئەوەی نییە بە خۆی بچێت. ناتوانێ بە هەمان هێڵی هاوتەریبدا بڕوا. تا هێز لە چۆکیدا مابوو حەفتەی یەک دوو جاران بە سەر ئەو دوو هێڵەدا دەڕۆیی و دەگەڕایەوە. دوای ئەوەی هێزی نەما، ئیدی خەڵکی بەو ڕێیەدا دەهاتن و دەچوون. مەڕ و بزنی پێدا ڕەت دەکران. تراکتۆری پێدا دەهات و دەچوو. بووە شارێیەک لەو گۆڕە و ئۆتۆمبیلی پێدا دەهاتن و دەچوون. سەرکردەی کول بڕیاری دا ئەو ڕێیە بۆ بەردەم ماڵە میر قیر بکرێ.

وا بۆ حەوت ساڵ دەچێ ئەو درۆیەی لەگەڵدا کراوە. ئێستا بە چواردەستە هەڵیدەگرن و لە بەر دەرگای حەوشەی دادەنێن. لەوێوە چاو دەبڕێتە ماڵە میر. هێندێ جار ئۆتۆمبیلی نوێباو دەوری ماڵەکە دەدەن. کە ئۆتۆمبیلەکان دەبینێ، بانگ دەکا:

- وەرن... وەرن بمبەن بۆ ماڵە میر.

- چ کارت بە ماڵە میر داوە؟. دەچی سواڵ دەکەی؟.

- نا، هەر دەچم پێیان دەڵێم بۆ درۆتان کرد؟. دەبێ بزانم بۆ درۆیان کرد.

- باوە گیان. درۆی ئەوانە درۆ نییە. درۆی ئەوان پێداویستی ڕۆژە.

- ئەی بۆ قۆڵیان بڕیم. بمبەن.

حاجی خۆی و منداڵەکانی خەریکی ئەو قسانەن: تەق و گرم و شریق... دەرگای ئۆتۆمبیلەکان دەکرێنەوە و دادەخرێنەوە. خرم و خڕ، چەکدارەکان سوار دەبن. حاجی لە دڵی خۆیدا دەڵێ: «ئا، ئێستا بۆ لای من دێن. ئا، بۆ ئێرە دێن. سەرکردەی کول دادەبەزێ و دەستم زیارەت دەکا. پیاڵە چایەک لە ماڵەکەم دەخواتەوە. ئا، دێت و لادەداتە لام... سەلام دەکات. کە دەمەوێ لە بەری هەستم، دادەچەمێ و دەستم دەگرێ و ناهێڵێ هەستم. بۆ ئەو جوان نییە من لە بەری هەستم...»

ئۆتۆمبیلەکان دەکەونە ڕێ و بە خێرایی بە سەر ڕێیە قیرکراوەکەی حاجیدا دەڕۆن و لەولای ماڵی حاجییەوە، بەرەو جادە سەرەکییەکە پێچ دەکەنەوە. حاجیش بێ ئەوەی چاو بتروکێنێ، تا لە چاوی ون دەبن هەر تەماشایان دەکا.

# داشی دامە

«بیستو چەند ساڵ؟ بیستی چی، ئەوا سیوسێ ساڵە! سیوسێ ساڵ بەر لە ئێستا بۆ دواجار گوندەکەم جێهێشت. هیچ شتێکم بە هیچ شتێکی منداڵ و میرمداڵ و هەرزەکاری ئەو سەردەمەی ئەوێ نەدەچوو. دواییش، هیچ شتێکم بە هیچ شتێکی خەڵکی ئەو وڵاتەی ئەورووپا نەدەچوو. لە قوتابخانەی گوندەکەدا، بیرکاری پۆلیسێکی ڕەزاقورس بوو و هەر هێندەت دەزانی یەک دوو قوتابی بە دڵی شکاوەوە، یا بە دەرگادا دەتفاندەوە یا بە سەر دیواری قوتابخانەکەدا ئاودیوی دەکردن و پاش ماوەیەکی کەم، دەیکردنە پێشمەرگە، جاش یا دامەزانی بلیمەت یا پۆلیسی خاڵی پشکنین. بیرکاری گیانلەبەرێکی تۆقێنەر بوو و لە ناو قوتابخانەکەدا، هەندێ جار لە سەر شێوەی مامۆستا و هەندێ جار لە سەر شێوەی کتێب و دەفتەر و هەندێ جاریش لە سەر شێوەی دار، خۆی پیشانی قوتابیەکان دەدا و وای دەترساندن ئیدی ببرای ببڕ ڕوویان لە قوتابخانە نەدەکردەوە! کەچی ئەو بیرکارییە دڕندەیە، بۆ من ببووە پشیلەیەکی نەرمونۆڵی دەستەمۆ و وەک هەویریش لەگەڵ هۆش و دەستوقەڵەممدا دەهات. وەها دەستم بە سەریدا

دەڕۆیی، وەک دێو پەستابوومە ناو قوتووی چرایەکەوە و کەی کارم پێی هەبوایە دەرمدەکردە دەرێ. دەست لە سەر سینگ لە خزمەتمدا دەوێستا: فەرموو گەورەم چ فەرمانێکت هەیە؟! من لە جیهانی بیرکاریدا پاشا بووم و کەس نەدەوێرا بیر لەوە بکاتەوە کوودەتام بە سەردا بکا. کوودەتایان کردبا، کێ مەملەکەتی بیرکاری پێ بەڕێوە دەچوو؟ کێ وەک من دەیتوانی بە پێی یاساکانی بیرکاری ڕەفتار بکا؟ کێ دەیتوانی لێدانی دڵی خۆی، لە ماوەی ساڵێکدا بژمێرێ؟

کۆیلەکانی بیرکاری، بە چاوترووکانێک شیعریان لە بەر دەکرد، کەچی منی شای بیرکاری، کۆیلەی لەبەرکردنی شیعر بووم. دوو ڕۆژ هەوڵی لەبەرکردنی شیعرێکم دەدا، ئەوجا لە تاقیکردنەوەدا یەکەم بەیتیم بیر نەدەکەوتەوە تا ئەوانی دی بە دوایدا بێن. هەموو شیعرەکە وەک زنجیرە بە بیرێکدا شۆڕ دەبووەوە و بیرم نەدەکەوتەوە و نەدەکەوتەوە...»

دواڕۆژی لەو گوندەدا مۆرێک بوو و بیرەوەرییەکانی بە مۆمی سوور خەتم کردبوو: کە باریان کرد، ئەو هاوەڵانەی کە بیرکاری، یەک دوو ساڵ پێشتر، یەک بە دوای یەکدا دەرپەڕاندبوون، لە بەر خۆرەتاوەکە دانیشتبوون و دامەیان دەکرد. یەکێکیان پێشمەرگە بوو و بە هۆی گفتوگۆوە گەڕابۆوە. ئەوی دی کە بەرانبەری دانیشتبوو، جاش بوو و بەر لێبوردنی شۆڕش کەوتبوو. سێیەمیشیان، کە ماوەیەک بوو ببووە پۆلیسی خاڵی پشکنینی نێوان دوو شار، بۆ سەردان گەڕابۆوە ئاواییەکە و هەر جارە و یارمەتی یەکێکیانی دەدا: ئەو داشە بەرە پێش، ئەو داشەی بدەرێ! یا دەیگوت: نەکەی کورە ئەو داشە لانەبەی؟!

ـ کاکە ئێمە بار دەکەین.

ـ دە ئەو داشە بخۆ، دەی! ئەرێ بە خوا ئاغم کرد! بار ئەکا و بار ئەکا، کەرەکە بە کوتەک هار ئەکا! دە بیخۆ هەی لە گیانت خۆش بێ! چما وا دەزانی بە خێری نەنکم داشت دەدەمێ؟! چما ئەو داشەم لەو دەشتە دۆزیوەتەوە؟! ها؟ دە بیخۆ دەی!

ئەوەی بەرانبەری کە پێشمەرگایەتی بە سیمایەوە دیار بوو، بە دیار

داشەکانەوە دامابوو. بە کزییەوە داشەکەی خوارد و لەولاوەی دانا و بەرانبەرەکەشی دایە بەرێ: «یەک... دوو... سێ و ئەوەش ئاغە!» بەردێکی ڕەشی سوورخنی خواروخێچ، لە دووەم خانەی ئەوسەرەوە جێی خۆی کردەوە و ئاغایانە لە خانەکانی دەڕوانی...

قسەکەی دوپات کردەوە:

- جەماعەت بار دەکەین و هاتووم خواحافیزیتان لێ بکەم!

ئەوانێش کە چاوێکیان لە داشەکان بوو و چاوێکیان لەو، نیوەهەستان هەستان و دەستیان بۆ درێژ کرد.

- خوا حافیزتان بێ!

- بە خێر و خۆشی!

- خوا ئاگادارتان بێ!

ئەویش بە کزییەوە خواحافیزی کرد و گوتی: «خوا یار بێ ئێوەش و منیش لە گفتوگۆیەکی تردا یەکتر دەبینینەوە!»

- «نا، ئەمە ئاخر گفتوگۆیە و تەواو! هەموو شتێ براوەتەوە و ڕێککەوتین! وا دەزانی سیاسەتیش بیرکارییە؟!» پێشمەرگەکە وای گوت و جاشەکە دوای ئەوەی کەمێ لە داشەکان ورد بووەوە، بە لاچاو تەماشایەکی کرد.

دوای ئەو ماڵاواییە ساردوسڕە ئیدی چاوی بە گوندەکە نەکەوتەوە. ئەو ماڵاواییە، سیوسێ ساڵی بە دوودا هاتن: کەرکووک... شاخ... دیوانیە... شاخ... ئۆردوگای زێوە... شاخ... ئۆردوگای ئەندیمەشک... شاخ... شام... تاران... شاخ... ئەورووپا و ئیدی لەوێ جێی خۆی گرتەوە و دایکوتا... چ شاخ بە دووی ئەورووپادا نەهات. هەر جارێ بە شاخەکانی ئەلپدا ڕەت بوایە، هەناسەیەکی ساردی هەڵدەکێشا. شاخەکان تەڕ و پاراو و بە پیت بوون و بۆ شۆڕشی چەکداری لەبار بوون. ئەدی بۆ کەس لەوێ شۆڕشی نەدەکرد؟ بۆچی مافیاکانی ئیتاڵیا نەیاندەدایە شاخ؟ بۆچی ئەفریقاییە ڕەشەکانی ئەڵمانیا و مەغریبییەکانی ئیتالیا، کە بەردەوام سووکایەتییان پێ دەکرێ نادەنە ئەو شاخانە؟! دەڵێی کوێرن و ئەو شاخانە نابینن!

ئەو ماڵاواییە بووە تابلۆیەک و لە پەڕەی ڕۆحیدا هەڵکەندرا. داش و خەتە سپییەکانی سەر چەمەنتۆکە، بەردەوام لە بەر چاوی بون و دامەچییەکان، محەمەد و سەعید، هەمیشە هەر ئەو دووە، ئەمبەر و ئەوبەریان لێ گرتبوون و هۆمەری پۆلیسیش لە نێوانیاندا دانیشتبوو و هەر جارە و قسەی بۆ یەکێکیان دەکرد. محەمەد، چاوی بە چاوی کەللەی پاککراوی مەڕ دەچوو و دەتگوت هەمیشە، دەمولێوی بۆ چڕتلێدان لەسەر پێیە. سەعیدیش، پێ دەچوو هەمیشە سەغڵەت بێ و چاو بۆ پەنایەک بگێڕێ خۆی لێ بەتاڵ بکاتەوە. دوو ڕیز بەردی ڕەش، بەرانبەریان لە دوو ڕیز بەردی سپی گرتبوو. شانزەی ڕەش و شانزەی سپی. بەردە ئازاکانی ڕیزی پێشەوە، چ ڕەش چ سپی، زوو هێرشیان دەبرد و زوو دەخوران و لەکۆڵ دەکرانەوە و لە دەرەوەی خانەکاندا، بە بێ ناز کۆمەڵ دەبوون. بەردە لاتەکانی ڕیزی دواوە، کتوپڕ فرسەتیان دەدی و دەبوونە ئاغە و بە ناو بەردی نەیار دەکەوتن! محەمەدی پێشمەرگە و سەعیدی جاش و هۆمەری پۆلیسیش قریوەیان دەهات... محەمەد، دەبووە بەردێکی سپی و دەکەوتە ناو خانەیەکەوە و سەعیدیش لە خانەیەکی بەرانبەردا دەبووە بەردێکی ڕەش و بۆ خواردنی یەکتر، بە ڕقەوە لە یەکتر ڕادەمان. خۆیان، بە ویستی خۆیان دەبوونە داش و یەکتریان دەخوارد... ئەوان خەریکی ئەو گەمەیە بوون و خەڵکی گوندەکەش باریان دەکرد و دەگەڕانەوە و دەبوونە جووتیار و بەردەوامیش لێیان دەکوژرا و لێیان دەمرد و زاوزێیان دەکرد. ڕایان دەکرد و تەسلیم دەبوونەوە و لە قاوشی بەندیخانەش زاوزێیان دەکرد و زیاد دەبوون. لە دەمی گفتوگۆدا لێیان دەکوژرا و زاوزێیان دەکرد و کاتی شەڕ لێیاندەکوژرا و زاوزێیان دەکرد و لە ڕەویشدا هەر بە دەم ڕێوە، لە پەنابەرد و لە ناو کەلاوەکاندا زاوزێیان دەکرد. ژنەکانیان، لە پرسەدا ئاوس دەبوون و لە ڕەودا منداڵیان دەبوو و منداڵەکان بە دەم ڕێوە گەورە دەبوون و دڵدارییان دەکرد. کە گفتوگۆ کۆتایی دەهات، ئەو سێ دامەزانە لێهاتووەش لێک دادەبڕان و هەر یەکە و لە خانەی تەختەیەکی گەورەدا، ئازایانە لە ڕیزی پێشەوە جێی خۆی دەکردەوە. لە خەیاڵی ئەو پاشایەی

بیرکاریشدا، شەڕ بوایە یا ئاشتی و گفتوگۆ، ژیان ناخۆش بوایە یا خۆش، هەمان دیمەن بوو... ئەو داشە بخۆ! ئەو چەکدارە بکوژە! ئەو کەلاوەیە بتەقێنەوە! تەسلیم بە! دوای عافوات بچۆرە ناو تەختەی دامەکەوە! پلکە حەمدێی بسکشۆڕ کوڕێکی بوو! کیژەکەشی کوڕێکی بوو و مام ئەحمەد کوژرا. مام سەمەد لە ئەنفالدا لە سەر لووتکەی خاڵخالان وەستابوو و توند زەکەری خۆی گرتبوو و بەرەو کەرکووک، گوایە فڕۆکەکانی لێوە دێن، ڕایدەوەشاند و دەیشیڕاند: گەووادانە! هەر لێمان بکوژن! وەڵڵاهی تا ئەمە مابێ ئێمە هەر زیاد دەکەین!

محەمەدەیش پێی دەگوت: هەی بێدین! بۆ بەرەو قیبلە زەکەرت دەردەکەی؟!

- بەرەو کەرکووک دەرمکردووە!

- بەرەو قیبلە وەستاویت!

مام سەمەد بە ساردییەوە هەرامەکەی پێچایەوە ناو شەرواڵەکەیەوە و بە بێدەنگی، هەندێ چپەچپی دەکرد! ئەویش یەکێ بوو لەوانەی کە لە دەست بیرکاری، بە سەر دیواری قوتابخانەدا بازی دابوو و بە دەرگای مزگەوتدا چووبووە ژوورێ.

ئەو دوارەژەی گوندەکە، بەردەوام دەهاتە خەونی. دامە و داشی دامەی سەر چەمەنتۆکە و محەمەد و سەعید و هۆمەر و چاوی مەڕ و جرت و پەنایەک بۆ خۆبەتاڵکردنەوە، هەمیشە لایەنی زاڵی خەونەکانی بوون. گەلێ جار لە خەونەکانیدا، داشی ڕەش و سپی تێکەڵ دەبوون و ڕەش، سپی و ڕەشی دەخوارد و سپیش هەردوو ڕەنگەکەی دەخوارد و کتوپڕ بەردێکی بەڵەکی نیوەڕەش و نیوە سپی، دەبووە ئاغە... گەلێ جاریش دەبووە داشە هارە و ئیدی لە گرتن نەدەهات! هەندێ جار لاڕێی دەگرت و قەدبڕ دەڕۆیی و هەندێ جار بە سەر خەتەکاندا پەلاماری دەدا.

«من خەریکی چیم؟! کەی ئەم گەمە شێتانەیەی ناو کەللەسەرم کۆتایی دێ تا ئەم خەونانەش کۆتاییان بێ؟! ئەو داشە بخۆ! ئەگەر نەیخۆی نابێ؟! نا نابێ! لەو ڕۆژەوە یاسای بۆ دەرچووە و لە ڕۆژنامەی ڕەسمیدا بڵاو کراوەتەوە، دامەچییەکان جێبەجێی دەکەن و کە گوتیان بیخۆ، دەبێ

بیخۆی، جا بەردەکان گەورە بن یا بچووک، بەرد بن یا پشکۆ یا قەوانە فیشەکی دەمانچە و تفەنگ! داشیش کە خورا، ئیدی لە دەرەوەی گەمەکەدا تووڕ دەدرێ. نابێ تووڕ نەدرێ؟! ناکرێ بەردی سپی، لە بری ئەوەی شازدە بن، چواردە بن و بەرانبەر هەژدە یا بیست بەردی ڕەش گەمە بکەن؟! ناکرێ خانەکان، لە بری ئەوەی، هەشت بە هەشت، شەستوچوار بن، نۆ بە نۆ، هەشتاویەک یا یانزە بە یانزە، سەتوچلوچوار بن؟ یانزە کەڕەت یانزە سەدوچلوچوار ناکا؟ نابێ هەر ساتە و یاسایەک بۆ ئەو گەمەیە دانرێ و ڕەچاو بکرێ؟! ئەنجامی بەردی سپی ئەوەیە یەک داشی لێ بمێنێتەوە و ببێتە داشەهارە و لە باشترین گەمەیدا قایمە دەرچێ. قایمە بۆ سپی بردنەوەیە. داشەهارە، گۆگردئاسا لە گرتن نایێ! جرت بەملا و فرت بەولا! جارێ لە خانەیەکدا خۆی دەبینێتەوە و چوار چاودێر بۆ پاراستنی بە دیاریەوەن، جارێ بە سەر خەتەکاندا و بە نێوان خانەکاندا فرتەی لێ دەکا. هەندێ جار دەکەوێتە تەنکاوەوە و زۆری نامێنێ بخورێ، بەڵام فریاڕەسی کڵاوسووری پەنای داشەکانی بەرانبەر فریای دەکەون و دەستی دەگرن و بە لاڕێدا دەربازی دەکەن. دەربازی نەکەن گەمەکە کۆتایی دێ و ئەوەش نابێ ڕوو بدا! ئەنجامیش هەر ڕاکردنە... پشوو نەدەی! ئەی خوایە چۆن باوەڕم بە محەمەد کرد؟ ئەو، جارێ سپییە و جارێ ڕەشە! لەمدیو شاخەکە بێ سپییەو و لەودیوی بێ ڕەشە، بەڵام سەعید بەردەوام ڕەشە! لە بنار بێ یا لووتکە، لەمدیو بێ یا لەودیو، لە دوورەوە لە هەموو کەسەوە دیارە ڕەشە، ڕەش! کە داشی ڕەش هەبن، دەبێ داشی سپیش هەبن، بەڵام تەنها لە ناو خانەکاندا نابن... دەکەونە سەر خەتەکانیش... جارێ خۆیان بەم خانەیەدا دەکەن، جارێ بەودا! مام سەمەدیش بەردەوام تووڕە دەبێ و زەکەری ڕادەوەشێنێ و هەڕەشەی زاوزێ و زیادبوون دەکا! مادام گەمە دەکەی، گەمەت پێ دەکرێ. ئەوە یاسای دەڤەری دامەستانە. هەر لە منداڵییەوە بە سێڕیسکان دەست پێ دەکەن. سێ ڕیسکان گەمەی منداڵانە بەڵام خۆ ئامادەکردنیشە بۆ دامە... تەنها یەک شت سێڕیسکانیان لێ تێکدەدا: سەگهەڵبڕین... سەگرپاندن! کە دەڵێن ئەوە سەگە بەرەڵایەکە،

ڕاکردووەکانی دەست بیرکاری، پێ بە خەتەکاندا دەخشێنن و بەردی سێڕپسکان پەرت دەکەن و دەست دەدەنە هێرکە بەرد و دووی دەکەون. سەعاتێ دوو سەعات ئەم کۆڵان و ئەو کۆڵانی پێ دەکەن. لە ئەنجامدا لە گوندەکە دەریدەکەن و ملی بەو دەشتەوە دەنێن. سەگی تاین، بستێ زمانی شۆڕ دەکا و شەویلەی کەف دەکا. لە حەژمەتدا، هەندێ جار کلکی خۆی دەگەزێ. بە هەر لایەکدا ڕادەکا، یەک دوو منداڵی بەردبەدەست پێشیان لێ گرتووە. لە ئەنجامدا، دەکەوێتە گۆشەیەکی بێ دەرفەتەوە و بە خۆیدا دەڕێ! دەیڕێنن و دوای ئەوەش زۆر نابا دەیکوژن. بەر لەوەی بیتۆپێنن، لاقێکی یا دەستێکی دەشکێنن. ئەوجا لاقەکەی تری. هەندێ جار هەر چوارپەلی دەشکێن. ئیدی لە جێی خۆیدا مات دەبێ و تەنها سەری بەملاوئەولادا بادەدا و کەڵبە بێکەڵکەکانی گڕ دەکاتەوە. قەپ بە کلکی خۆیدا دەکا. سەگەکە، هەناسەی لە بەر دەبڕێ و ئەوانیش ئارام دەبنەوە و بەکاوەخۆ، بەرەو ئاوایی دەگەڕێنەوە. کەس باوەڕ ناکا ئەو منداڵە خەواڵوو و خاو و خلیچکانە، هەر ئەو هاروهاجانە بووبن کە کەمێ پێشتر پەلاماری سەگەکەیان دەدا. کەس باوەڕ ناکا ئەو کەلاکە سەگە، هەر ئەو سەگە بێ کە نەختێ پێشتر بۆ دەربازکردنی گیانی خۆی کلکی خۆی گەستبێ و ئەو هەموو ڕاکەڕاکەی کردبێ! ئەمە چ قەشمەریجارێکە!

دوای سیوسێ ساڵ، بە سەری ڕووتاوە و قژ و سمێڵی سپی و جانتایەکی ڕەشی سەفەرەوە گەڕایەوە. هەتا لە گوندەکە نێزیکتر دەبووەوە، بیرکردنەوەی چڕتر دەبوو: «هەر دەبێ ئەو هەموو کارەساتە، خەڵکی ئەم دێیەی گۆڕیبێ. ئێستا جاشێتی شوورەییە! ئێستا دزیی ڕسواییە و سەگهەلبڕین شەرمەزارییە! ئێستا. لە بری دامەکردن، ئەو خەڵکە خەریکی زانست و پیشەسازی و بازرگانین! ئێستا هەموویان، برایانە شانیان داوەتە بەری و کاروباری وڵات ڕادەپەڕێنن! ئێستا شەهیدەکان، وەک نێرگز سەریان لە خاکەوە دەرهێناوە و بۆ ئەو پێشکەوتنانە بزە دەکەن! بە دڵنیاییەوە محەمەدیش بۆتە نێرگز! ئا، سەعیدیش کوژراوە! ئەدی گۆزە هەر لە ڕێی ئاودا ناشکێ؟!»

که ئۆتۆمبیلەکە گەیشتە سەر پردی سەر زێیەکەی نێزیکی گوند، کە دەیان جار ڕاوەماسی و مەلەی لێ کردبوو، کۆمەڵێ گەنجی نیوەڕووتی دی، کە دەوریان لە نێرەکەرێک دابوو. بە هەموویان بەرزیان کردەوە. کەرەکە خۆی ڕادەپسکاند و وەختابوو بێتە زمان. بە هەموویان، لە سەر پردەکەوە و بە سەر پەرژینەکەیدا، هاویشتیانە ئاوەکەوە و شڵپەیان لێ هەستاند! بەڵام کەرەکە کلکی خۆی نەدەگەست! زمانیشی شۆڕ نەبوو! شۆفێرەکە، لە بەر خۆیەوە بۆڵاندی: دەک جوانەمەرگ بن! ئەوە لە بری نوێژ و تەعاتیانە! بەڵام خۆ کەریش باوی نەماوە! با بیتۆپێنن پیاو! کەر بە کەڵکی چی دێ؟

که گەیشتە ئاوایی، بیری هەر لای کەرەکە و بۆچوونی شوفێرەکە بوو. دێیەکە، هیچ شتێکی وەکوو خۆی نەمابوو. یەک خانووی سیوسێ ساڵ لەوەپێش نەمابوو. دارستانێک بوو لە ئاریەڵ و بورج و عەموودی کارەبا. گۆڕەپانێک بوو لە ئۆتۆمبیلی هەمەڕەنگ! ڕواڵەتی گوندەکە بە تەواوەتی گۆڕابوو. یەک خانووی قوڕ لەو دێیەدا نەبوو. بە مەزەندەی خۆی لەو جێیە وەستا کە جاران ماڵی خۆیانی لێ بوو. لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزی. سێ پیرەمێرد سەریان بە دیار تەختەیەکی دامەوە خوار کردبوو و چوار منداڵیش، بۆ فێربوونی دامە، بە دیاریانەوە وەستابوون و تەماشایان دەکرد.. بەرەو لایان چوو و سڵاوی لێ کردن. بێ ئەوەی تەماشای بکەن، بە چپە سڵاویان سەندەوە. یەکێ لە پیرەمێردەکان، بە خۆشییەوە هاواری کرد: «بخۆ! دەی ئەو داشە بخۆ! ئەرێ بە خوا ئاغەم کرد! سڵاو لە تۆ سڵاو لە تۆ یار... سڵاو لە تۆ سڵاوی بۆندار... دە باشە، دەی: ئەوە یەک... دوو... سێ و ئاغە! ها ها ها!» ئەویش بە خۆ و جانتاوە، بە دیاریانەوە وەستا و دەستێکی لە گیرفانیدا بوو و بلیتی فڕۆکەکەی تاوتوێ دەکرد.

# بەرزبوونەوە

پشتیان کردە خۆیان و ڕوویان لە چاڵەکە کرد. چاڵێکی لاکێشەیی دوو - سێ مەتر پان، نیوەپڕ بوو لە جەستەی خوێناوی. چاوێکی بە تەرمەکاندا گێڕا... کیژ و کوڕ و ژن و پیاو بە سەر یەکدا کەوتبوون. ڕەشبەڵەکێکی حەرامی مەرگ بوو. هێندێکیان دەلەرزین. دیمەنەکە ژیانی لە لا خۆشەویست کرد. ناخی دەیویست بژێ. لەو دەمە ترسناکەشدا دەیزانی ژیان چەند دەرفەتی کەم بێ، ئەوەندە شیرین دەبێ. لە تەرمەکان ڕاما و بیری کردەوە: دەبێ چەند پاڕابێتنەوە!. دەبێ چەند بە سەر دەستوپێی جەللادی خۆیاندا کەوتبن!. بە پاڕانەوە و دەستماچکردن بکوژی خۆیانیان مەست و بەختەوەر کردووە. تۆ بڵێی وایان کردبێ!. ڕەنگە هێندێکیان وایان کردبێ و هێندێکیان تفیان ڕۆ کردبێ. من نابێ بپاڕێمەوە. نا، ناپاڕێمەوە. بێ منەتیان دەکەم تا بەختەوەر نەبن. ئامانجی ئێستام بەدبەختکردنی ئەوان و بەختەوەریی خۆمە!. خۆ هەرچی بکەم هەر دەمکوژن!. دەبا بە بەختەوەریی بمرم. دەسبەرداری داوە مووی پاڕانەوە دەبم کە دەزانم بەرگەی هیچ ناگرێ.

لەوسەری چاڵەکەی ڕوانی. (شیرین)ی هاوسەری دەستی (مینا)ی کیژیانی گرتبوو و کەمێ لە ئاسۆ بڵندتر لە بۆشایی و مۆلەق وێستابوون. دەمولێویان دەبزواند. لە بزواندنی دەمولێویان حاڵیی دەبوو: «مەترسە!. لێیان مەترسە با بەختەوەر نەبن!. با ئەو جەستە ماندووەت بە دەم پێکەنینەوە لەکۆڵ بێتەوە. مەترسە!... کارێکی وا بکە ئەوان لە بزەی تۆ بترسن». چاوی بە چاڵەکەدا گێڕا. دەیزانی جەستەیان لەوێیە، بەڵام نەیدیتن. دیسان تەماشای ئەوسەری چاڵەکەی کردەوە. لەوێوە، کەمێ لە ئاسۆ بڵندتر لە بۆشایی وێستابوون و چاویان لەم بڕیبوو. شیرین توولێکی سپی لەبەر بوو... مینا، هەموو جەستەی خۆی بە گەڵاهەنجیر داپۆشیبوو و پێدەکەنی.

چاوی گواستەوە بەردەمی خۆی. دەمی چاڵەکە خوێناوی بوو. تەماشای تارمایی شیرین و مینای کرد. بزەیان دەکرد و بە چاو بانگیان دەکرد. سەرسام بوو. پێڕێ، بە دەم قیژە و هاوارەوە لێی دابڕان. مینا خۆی بە سینگییەوە لکاندبوو و بە زۆر لە سینگیان هەڵپچڕی. هەستی دەکرد گۆشتیان لە سینگی پچڕی. ئازاری ئەو هەڵپچڕینە لە ئازاری چەقۆ کوشندەتر بوو، کەچی خۆشەویستیی بۆ ژیان لێ نەگەڕا بمرێ. چنگیان بە باسکی شیریندا کرد و بە پەنجەیان چاڵیان دەخستە باسکە خڕپنەکەیەوە. هەر بۆ ئەوەی خۆی بژێ، بەرگەی گرت و نەمرد. ژیانە بەرتەنگە هەڕەشەلێکراوەکەی لا خۆشەویست بوو. هەناسەی دەویست. هەوای بیابانی تێکەڵی بۆنی خوێن و عارەقە چ بۆنێکی خۆشی هەبوو! نا، ئەو هەوای نەدەویست بڵکو هەوا بەخۆی دەیویست بچێتە سییەکانیەوە. سییەکانی و هەوا ئەویندارى یەک بوون و پێویستیان بە یەک هەبوو. ئەوینێکی دووسەرە بوو.

«مەپاڕێوە. پاڕانەوەت بەختەوەریان دەکا. پاڕانەوەت دەیانکاتە فەحلی بە دەسەڵات. بەشەر، کە دەکوژێ یا دەکوژرێ، دەگەڕێتەوە سەردەمی سەرەتا. ئەو دەمەی بە ڕەو دەژیان و یەک پارووی بێ ماندووبوونیان

چنگ نەدەکەوت. لە ڕەوێکدا یەکێک دەبووە زۆردار و ئەوانی تر لێی دەپاڕانەوە و بە پاڕانەوە بەختەوەریان دەکرد. بە نووزە نووز داوای لوقمەیەک گۆشتیان لێ دەکرد و ئەویش بە مرەمرِ ڕێی دەدان بخۆن. پاڕانەوەت عێرەقیان دەکا. پاڕانەوەت لە گوێیاندا دەبێتە دەنگێکی هێند جنسی ڕەحەتیان دەکا. پێیان پێبکەنە و زەلیلیان بکە. چاو ببڕە چاویان تا وەک شای ناو چاڵەکەی بەردەمت دابەزیت... وەک هەڵۆ بنیشیتەوە... دەی وەک هەڵۆ بنیشەوە»

شیرین بزەی دەکرد. وەک سەردەمی هەرزەکارییان، بە نازی چاو بانگی دەکرد. مینا، هەر بە چاو و دەمولێوی، وەک سەردەمی منداڵی گرۆگاڵی دەکرد و ئامێزی بۆ دەکردەوە. پشتەوەیان ئاسمانێکی پەمەیی بوو و خۆرێکی سوور و لە خۆری ئاسایی گەورەتر لە ئاسۆوە بەرز دەبووە و قژە خاوەکەیانی درەوشەدار دەکرد. ئەمیش بزەی بۆ کردن و بەختەوەریی لە سیمایدا پێشاندان. بە چاو، سەد «وا هاتم»ی پێ گوتن. تەماشای لای دەستەڕاستی خۆی کرد. پیرەمێردی ئاوایی، پاشای دامە و سێبەری مزگەوتەکە، ڕووەو چاڵەکە بە چۆکدا هاتبوو و دەلەرزی. جاروبارێ ئاوڕی لە سەربازەکان دەدایەوە و دەپاڕایەوە: «بیکەن لە ڕاهی خودا مەمکوژن!. من هیچم نەکردووە!. لەوەتەی هەم دژی حکوومەت نەبوومە!... ئەم کابرایە دژتانە... دوژمنتانە... هەقی ڕەمیکردنە... بیکوژن... من مەکوژن...» سەربازەکان بە قسەکانی پێدەکەنین. بە وشەکانی بەهێز دەبوون و هەستی دەسەڵاتیان گەشەی دەکرد و توانای دەستڕێژیان زیاد دەبوو. تەماشای لای دەستە چەپی خۆی کرد. هاوڕێکەی سەردەمی منداڵیی، سەرباز، کە لە قۆزێتیدا کەس شانی لە شانی نەدەدا و کام کیژی گوند بڵێی، بە یەک بزە بۆی دەکەوتە تەنکاوەوە، دەپاڕایەوە و دەگریا... بە نووزە نووز بانگی دایکی دەکرد و دەیویست بیخاتە پەنای چمکی کەواکەیەوە. سەربازەکانیش بە دەم قاقای پێکەنینەوە ڕیز دەبوون و تفەنگیان سوار دەکرد و خۆیان ئامادە دەکرد.

«من دەبێ زەلیلیان بکەم. تف ڕۆ دەکەمە ڕوخساریان. ئەم جەستە بەڵایە ئەوەندە ناهێنێ بۆی بپاڕێمەوە... من وەک پاشای دامە و کوڕە قۆزەکەی ئاوایی ناکەم. نا... من وەک ئەوان ناکەم. هاوسەری بەسۆزم وا دێم!. کیژە جوانەکەم وا دێم... دێم!. بە دەم قاقای پێکەنینەوە دێم... دێم و ئەو ڕوخسارکەمتیارانە بە تێکشکاوی جێ دەهێڵم...»

لە کەیەوە شەماڵ دژی باوکسالاری و ناموسپەرستیی بوو؟!. ئەوەتا ئەنفال بووە شۆڕشێک دژی هەردوکیان. ئەویش وەک شیرین و مینا لێپرسراو بوو لە جەستەی خۆی و هیچی تر... ئەنفال هاوسانی بوو لە نێوان نێر و مێدا... تەنانەت منداڵیش لەگەڵ گەورەدا یەکسان بوو.

تا ئەو کاتە دەیویست بژێ با بە سەرشۆڕیش بێ. یەک تۆزێ هەوای تر هەڵمژێ با هەوای کۆیلایەتیش بێ... یەک چرکەی تر با بە سەرشۆڕیش بێ... پڕ بە سییەک هەوا هەڵمژێ با ژەهراویش بێ... یەک بەردێکی تر ببینێ با خوێناویش بێ... یەک شتی تر ببینێ، هەر شتێ، با تفەنگی دەستی بکوژی خۆشی بێ... یەک هەنگاو بڕوا با بە ناو ژیلەمۆی ئاگریشدا بێ. بەڵام کتوپڕ یاخی بوو. لە ناخەوە لە ژیان هەڵگەڕایەوە. بە دەم بزەوە وەرچەرخا و ڕووی لە چەکدارەکان کرد و پتەو و ڕەپ ڕاوێستا. سیمای چەکدارەکان شێوا و ڕەنگ لە ڕوویاندا نەما. یەکێکیان فەرمانی دا: ڕووەو چاڵەکە بکەوە سەر چۆک!. دەی خائین!.

- نا!. دەمەوێ کە دەمردم، بە چاوشۆڕیی بتانبینم. دەمەوێ ئەو کاتانەتانم بیر بێتەوە کە بە سەر پێڵاودا دەکەوتن و دەپاڕانەوە...

فەرماندەرەکە بۆی هات و دایە بەر دار. خوێن بە سەریدا فیچقەی کرد. هەستی بە ئازار نەکرد. دەستی هەڵنەبڕی پێش بە لێدان بگرێ. چاوی نەترووکاند. لە بری ئازار، جێی لێدانەکان دەخورا... خروویەک دەخورا، حەزی دەبزواند.

«های، های!. خۆ زاڵبوون بە سەر ترسی مەرگدا خۆی جۆرە ژیانێکە. پەڕینەوەیە بە سەر پردی سیراتدا بەرەو بەهەشت. تێکشکاندنی نەیارە.

زەلیلکردنێتی... ڕووخاندنێتی...» چاوی هەڵبڕی و بە دەم بزەوە و بە سەر شانی نەیارەکەیدا دووری ڕوانی: ژنەکەی، یا تارمایی ژنەکەی، خەریک بوو خۆی بۆ ڕووت دەکردەوە و بە بزەوە بانگی دەکرد: «وەرە! وەرە ئازیزم ئێستا کاتێتی!... وەرە خرووی برینت دامرکێنم!... وەرە!...»
فەرماندەرەکە شێتانە دەیقیژاند و دەستی ڕادەوەشاند. شەماڵیش بێ ئەوەی ببزوێ، بزەی دەکرد. خوێنی گەرم بە ڕوخساریدا دادەچۆڕا. دەمی پڕ بوو لە تامی خوێن و گۆشتی خاو. دەتگوت ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم تام و بۆنەی کردوون. بەڵام کەی؟. ڕەنگە ڕۆژێ بووبێ کە هێشتا مرۆ دڕندەیەکی کەڵاکخۆر بووبێ و ئاگری بەکار نەهێنابێ... ڕۆژگارێک، کە گۆشتی بە کاڵی و خوێنەوە خواردبێ. حەزی لێ بوو پەلاماری نەیارەکەی بدا، بەڵام ماندوێتی و شەونخونی و ڕێگای بێ برانەوەی بیابان پرزەیان لێ بڕیبوو. چاوی هەڵبڕی و (شیرین)ی وەک کۆترێکی سپی. لە ئاسمانێکی پەمەییدا دیت. سووک بە هەوادا دەهات و دەچوو و قاقا پێدەکەنی و بانگی دەکرد. سینگ و مەمکی ڕووت بوو و دەتگوت منداڵ نەیمژیوە. ئەمیش بە پەرۆشەوە بزەی بۆ دەکرد و دەمودگانە خوێناویەکەی هەرەسی بە فەرماندەرەکە دەهێنا. فەرماندەرەکە، شێتانە و بە پەلە گەڕایەوە و دوو سێ هەنگاو لای چەپی چەکدارەکانەوە وێستا. شیڕاندی:
ـ ئامادە بن!.
لە ناو شیڕەی دەنگیدا ڕەگی گریان دەبیسترا و هەست بە بێدەسەڵاتیی دەکرا. خێرا خێرا چاوی دەترووکاندن. شەماڵ، لە کونجێکی بنی هەستیەوە بەزەیی پێدا هاتەوە. بەڵام زوو فریا کەوت: «دەبێ زەلیلی بکەم، زەلیل... خۆ من خودا نیم بەخشندە بم» ئەوجا تەماشای پشتەوەی چەکدارەکانی کرد و بزەیەکی حەزئامێزانەی
کرد. بزەی شیرین، ڕێی نەدەدا هەست بە بوونی چەکدارەکان بکا. شیڕەی فەرماندەرەکە بە ناو بیابانەکەدا پەخش بوو و بێ ئەوەی دەنگ بداتەوە، نەما: ـ دەستڕێژ!.

شەماڵ لە جێی خۆیدا وێستا بوو. گوێی لە دەسترێژ بوو بەڵام هەستی بە هیچ نەکرد. دەژیا و هەناسەی دەدا و تامی خوێن و گۆشتی خاو لە دەمیدا بوو و شیرینیش لە پشت چەکدارەکانەوە، بە بەرگێکی تەنک و سپییەوە بزەی بۆ دەکرد و بە ناز بانگی دەکرد. بە لای چەپیدا ڕوانی. کوڕە قۆزەکەی ئاوایی لە ناو خوێن و لمی دەم چاڵەکەدا هەڵدەپلکا و جەستەی، بە هیوای دەربازبوون، بە خێرایی شەیتانۆکە بەرەو ناو چاڵەکە دەکشا. بە لای دەستەڕاستیدا ڕوانی و دیتی: خوێنێکی گەش لە جەستەی پاشای دامە و سێبەری مزگەوتەوە بەرەو ناو لمەکە دەکشا و لم هەڵیدەمژی و بزری دەکرد. تەماشای جەستەی خۆی کرد. چ عەیبی نەبوو. هەتا توانی قاقا پێکەنی و لە چەکدارەکانی بەرانبەر خۆی ڕاما. پێدەکەنی و دەستی بە لاڕانی خۆیدا دەکێشا. گرمەی هەوری فەرمانی دەسترێژ بەرز بووەوە:
- ترسنۆکانە!... نەتانپێکا!.. دەی جارێکی تر!. دەسترێژ!.
گوێی لە دەسترێژ نەبوو بەڵام گوللـەکانی دەدی بە لێشاو بەرەو تەوێڵ و سەر دڵی دەهاتن. کتوپڕ، دەتگوت دۆخینی شەرواڵەکەی بەزی و کەوتە بن پێی، ئاوها جەستە داماڵا و کەوتە سەر زەوی. لە ئەنجامدا، جەستەی خۆی لە بەر خۆی داماڵاند. هەستی بە بارسووکییەکی خۆش دەکرد. ئەو جەستە شەکەت و برسی و چڵکنەی لە کۆڵ بووەوە و داوای هیچی لێ نەدەکرد. نە پشوو نە ئاو نە خەو. بەخۆشی، هێواش بەرەو بەرزایی هەڵکشا. تارمایی ژنەکەی و کیژەکەشی، هاوتەریب لەگەڵ ئەودا بەرز دەبوونەوە و قاقا پێدەکەنین.
ئاوڕی لە جەستەکەی خۆی دایەوە: لە دەم چاڵەکە کەوتبوو. خوێنی گەشی لە بەر دەڕۆیی. تەوێڵی دوو سێ کونی تێ کەوتبوون و سەر سینگیشی ببوە سەرەن. سەربازەکان، بە خەمبارییەوە دەورەیان لێ دابوو. ناوچەوانیان گرژ بوو. فەرماندەرەکەیان، پەیتا پەیتا دەستی بە تەوێڵی خۆیدا دەهێنا و ئەمسەر و ئەوسەری دەکرد...

# هەموو ڕێیەکان دەچنەوە قاهیرە*

دەتگوت لە ئاسمانەوە بەربۆتەوە ناوەندی قاهیرە. لە سەر پردەکەی سەرەوەی دوورگەی زەمالکی قاهیرە، بە دیار ڕووباری نیلەوە نیشتبۆوە. ئاوی ڕووبارەکە، هەر لە خوارووی سوودانەوە پیسیی ڕادەماڵی تا ئەو جێیە: ماسی مردوو، لەتە قرژاڵ، ڕیخی فیل و کەرکەدەن، لووڵاق و کەللـەی وردبوو و ڕیخەڵۆکی بەشەری خوارووی سوودان، پاشەڕۆی نەوت و داروپەردووی خانووی ڕووخاو، بەرماوەی خواردنی دانیشتوانی دەم نیل... و نزوزبڵ و کەلاکی سەگ و پشیلە و مەیموون، و هەرچی فڕە دەدرێ، ئەو ڕووبارە لەگەڵ خۆیدا، بە لەتوپەت کراوی ڕایماڵیبوو. بۆنێکی کەسکوون، بۆنی غەدر و خوێنڕێژی و کۆیلایەتی و کۆڕەو، لە قووڵایی مێژووەوە، لە ناوجەرگەی ئەفریقیاوە، لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە دەهات و خۆی دەکرد بە لووتی ئەمدا.

«ئەم خەڵکە چۆن گێژ نابن؟ چۆنە وا لەم جێیە بۆگەنە ناگوێزنەوە بۆ جێیەکی دی؟ ئەمانە لە بۆگەنی خراپەکاری و نامرۆڤایەتی و کۆیلایەتی بار کراون و بە بێ بۆگەنی هەڵناکەن! لەوەتەی هەن، هەر وا هەن... بە

بێ خواردنی بەرهەمی تاوان و هەڵمژینی بۆنی تاوان هەڵناکەن و ناژێن».
نەیدەزانی بەرەو کام بەری پردەکە بڕوات. ئەمبەر یا ئەوبەر؟ هەردوو بەر بۆ ئەو وەک یەک بوون. دەیزانی لەو چرکەساتەدا، ئەوەی لەوبەر هەیە، لەمبەر نییە. ئەوەی لەو چرکەساتەدا لەمبەر تووشی دەبێ، لەوبەر تووشی نابێ. یەک شتێک، ناتوانێ لە یەک کاتدا لە دوو جێ بێت. بەخۆشی ناتوانێ لە یەک کاتدا لە دوو جێ بێ. لەو دەمەدا نە لەوبەر بوو نە لەمبەر. لەو چرکەساتە چارەنووسسازەدا، لە سەر پردەکە بوو. دەبێ یا لەمبەر بێ یا لەوبەر. چۆن بزانێ لە کام بەری پردەکەدا بەخت یاری دەبێ و بە ئامانجی خۆی دەگا و لە کامیاندا بەدبەختی تووشی دەبێ؟.
پشتی دابوو بە پەرژینی پردەکەوە و هەر جارە و بە لایەکیدا دەڕوانی. خەڵک دەهاتن و دەچوون. وەک مێرووله، خۆیان لە یەکتر لادەدا و خۆیان بە یەکدا دەدا... ئەم دەهات ئەو دەچوو. مێروولەی سەر ڕێچکە، هەموویان بە یەک دەچن و کەس ناتوانی بیانناسێتەوە و ڕەنگە خۆشیان یەکتر نەناسنەوە. هەموویان یەک ڕەنگ و یەک قەبارە و یەک شێوەن و هەمووشیان یەک مەبەستیان هەیە: کارکردنی دەستەجەمعی بۆ مەملەکەتی خۆیان. بەڵام ئەو ڕێچکەیەی سەر پردەکە وا نەبوو. خەڵکەکە هەمە چەشنە و هەمەسیما و هەمەڕەنگ و هەمەمەبەست بوون. هەر یەکە و بۆ مەبەستێک دەچوو و هەریەکە و ئامانجێکی هەبوو. یەکێ دەچوو شارێک بۆ خۆی چێ بکا و یەکێ دەچوو شارێک لە یەکێک تێکبدا. بە کراسی قۆڵکوترەوە، بە چاکەتەوە، بە دیزداشەوە، قەڵەو، لاواز، مێ، نێر، پیر، منداڵ... دەچوون بۆ کار، بۆ ڕابوارد، بۆ دزی، بۆ سەردانی دایکیان، لە لای باوکیان دەگەڕانەوە... ئەمانە خەریکی چی بوون؟. لە بری ئەوەی بێن و بچن، بۆ جێیەکانیان ناگۆڕنەوە؟ ئەم هەرایە لە پای چی؟. هەمووشیان بۆ شەو، سەرو نوێنیان هەیە! ئەو ژنە دەچێتە دوکانی عەترفرۆشیی و لەوێ کار دەکات... ماڵەکەیان لەوبەرە و دێتە ئەمبەر بۆ کار!. ئەوی تریان لەمبەرەوە دەچێتە ئەو بەر تا... ئا، تا گۆشت بکڕێت. ئەدی بۆ لە بەرەکەی لای خۆی نایکڕێت؟ ئەدی بۆچی هەموویان ئەوەندە بە

پەلەن؟ دەڵێی هەڵیاندەبڕن. ئەگەر کەسێک لە سەر ئەم ڕێچکەیەدا پەلە نەکات، دەبێتە بن دەستوپێوە. هەمووان ناچارن پەلە بکەن. ئامانجی هەر یەکەشیان ئەوەیە بحەسێتەوە. خۆیان بۆ حەسانەوە ماندوو دەکەن!... دواییش بۆ ماندووبوون دەحەسێنەوە. ئەم بازنە داخراوە لە پای چی و هەتا کەی؟ لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە ئاوهان!»

لەو خەیاڵانەدا بوو، ژنێکی جوان، باریکەلە و سپیلکانە، لەو بابەتەی کە هەمیشە بووکی خەیاڵی ئەم بووە، دەستی منداڵێکی لە خۆی جوانتری گرتبوو و لەوبەرەوە دەهاتە ئەمبەر. بە دەم بزەوە هەنگاوی دەنا و هەموو بوونی نوقمی بەختەوەری بوو. جاروبار، سەری بە لای منداڵەکەدا لار دەکردەوە و قسەیەکی دەکرد یا قسەیەکی لە منداڵەکە دەبیست و بزەکەی زیادی دەکرد و منداڵەکەش دەیدایە قریوەی پێکەنین. لە لای دەستەچەپیەوە دەهات و بەرەو لای دەستە ڕاستی دەچوو. تەماشای هەموو کەسێکی دەکرد و بزەی سەر لێویشی گۆڕانی بە سەردا نەدەهات. گەیشتە بەردەمی ئەم... تەماشایەکی کرد و بە دەم بزەکردنەوە تێپەڕی. ئەمیش وەک ئەو خەڵکە، بزەیەکی جوانی بەر کەوت... «خەرمانی بزە بەرەکەت!»

ئەو ژنەی بە قیبلەنومایەک دانا کە ڕێی ڕاستی پیشان بدا. مادام لە لای دەستەچەپیەوە دێ، دەبێ ئەمیش بەرەو ئەمبەر بچێت. مادام بەرەو ئەمبەر دێ، دەبێ ئەمیش ئەو ئاڕاستەیە بگرێ و بە دوویدا بڕوات. ئەو بۆ کوێ بچێ، بەختەوەری لەوێیە و ئەمییش تووشی چاکە نەبێ، تووشی هیچ نایێ. دەبێ دووی کەوێ... دەبێ بە لای باسکی ڕاستی خۆیدا وەرچەرخێ و بڕوا. بیری دەکردەوە: «دەبێ بڕۆم... بڕۆم، تا دەگەمە ئەشکەوتێک، دەڵەدێوێکی تێدا نوستووە. مەمکی چەپی ڕاخستووە و بە مەمکی ڕاستی، جوان خۆی داپۆشیوە. لە خەو هەڵدەستێ و دەگرمێنێ و دەڵێ: بۆن دێ... بۆنی بێگانان دێ... لەم دەوروەمەکان دێ...»

بە خەیاڵە قۆڕەکانی خۆی پێکەنی. دەڵەدێوی ئێستا، دوامۆدە لەبەر دەکات و سێ چوار زمان دەزانێ و هەر بە بزە، لە سەر تەوقی سەر دەتخات و

ئەمبەر و ئەوبەری پردەکەت پێ دەکات و لەناوت دەبا. ڕۆیشت... هێواش هێواش دووی ئەو شۆخە دەم بە بزەیە کەوت. خەڵک خێرا ڕێیان دەکرد و ئەم هێواش. دوای هەموو دوو سێ هەنگاو، شانی بەر یەکێک دەکەوت و لەگەڵیدا دەیگوت: «عەفەوەن!». تا لە پردەکە پەڕییەوە، ڕەنگە سەد جار «عەفوەن!»ی گوتبێ! «چەند ئاسانە داوای لێبوردنیان لێ بکەیت!. ئەمانە، هەر لە خۆیان دێ داوای لێبوردنیان لێ بکرێت!» خۆ یەک کەس بەوی نەگوت «عەفوەن!». خۆ ئەوانیش شانیان بەر شانی ئەم دەکەوت! ئەدی بۆ داوای لێبوردنیان لێ نەدەکرد؟. هەر لەبەر ئەوەی وەک خۆیان ڕێی نەدەکرد، بەرهەڵستی ڕۆیشتنیان بوو و هەمووشیان درکیان بەوە دەکرد. ئاخر ئەم فێری ڕۆیشتنی جێی تەختتان نییە و ئەوانیش فێری ڕاکردنن بە تەختاندا... ئەو خەسڵەتە، لە کرۆمۆسۆمی ئەم و ئەواندا هەر ماوە. کە گەیشتە ئەوسەری پردەکە، نە ژنەکە دیار مابوو نە منداڵەکە. بەڵام هەستی دەکرد شیرینایی بزەکەی، بە پەرژینی پردەکە و ڕێڕەوەکە و سیمای خەڵکەکەوە مابوو... هەموو شتێک، لە ناو ئەو بۆگەنییەدا بزەی دەکرد. ئەمیش بزە کەوتە سەر لێوی و چاوی پڕ بوون لە بەختەوەری. بزەی ئەو ژنە هەستێکی تێدا دروست کرد، دەتگوت پێشتر لەو جێیەدا، جارێکی دی ژیاوە. دەتگوت ئەوەی ڕوودەدات، دووپاتبوونەوەی ڕووداوی سەد... دووسەد ساڵ، هەزار... دوو هەزار ساڵ پێشترە و ئەم بە چاوی خۆی دیویەتی. دەبێ ئەو کاتە ئەم کۆڵهەڵگرێکی ئەهرامەکانی فیرعەون بووبێ! دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان یەکێ بووبێت لە سەربازە ئازاکانی سەلاحەددین! بیری دەکردەوە: «من ئەم جێیەم دیوە!... من جارێکی دی لەم جێیە ژیاوم و ئەم بۆگەنییەم بۆ هاتووە. من بە هەرزەکاری، لە سەر ئەم پردە، لەگەڵ کیژێکدا ژوانم هەبووە. لە سەر ئەم پردە... لەمبەرەیدا، تا هەناسەم سوار بووە، دەمیم مژیوە. ئەو ژنە جوانەی کە ئێستا تێپەڕی، دۆستی من بوو... من و ئەو، یەکترمان خۆشدەویست. ئا، دەڵێی دوێنێ بوو: جێی ئەو بینا شەش نهۆمییە، تەختانێک بوو، کایان لێ دەفرۆشت. لەملای ئەو بینا سپییە بەرزەوە، کە ئەو دەمە خان بوو، لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا

بەسترابوومەوە و بەردباران دەکرام. ئەو دەم بەخەندەیەش بەردباران دەکرا. پێنج شەش هەنگاو لاولای منەوە، بە ستوونێکەوە بەسترابۆوە و بەردباران دەکرا. سەدان کەسی بەرد بەدەست، لە ڕاهی خودا بەردیان تێدەگرتین تا خێریان بۆ بنووسرێت و بچنە بەهەشت. بەرد وەک تەزرە بە سەر سەرمدا دەباری. بەردەکان، لە بەردی لای خۆمان قورستر و ڕەقتر بوون. بەڵێ بەڵێ، من لێرە بەردباران کراووم. بەڵام کەی؟. نازانم کەی... کە بەردباران دەکرام، دەمتاشراوێکی سەبیل بەدەم و شەپقەلەسەریش بە دەم بزەوە تەماشای دەکردم. بە دوو پەنجەی، نیشانەی سەرکەوتنی کرد و بزەیەکی سەرکەوتووانەی بۆ کردم. زمانی حاڵی دەیگوت: «چارەنووست لە دەستی مندایە!» پێم وابێ ئەو دەمە سەرباز بووم. دەمەوێ بزانم و ناتوانم بزانم... بۆم نییە بزانم، چەنکە زانینی ئەو بابەتە شتانە لە من قەدەغەیە. من لە سەرمە فەرمان جێبەجێ بکەم، نەک بزانم».

بەڵام خۆ ئەوە یەکەم جار بوو ئەوێ ببینێت! ئەدی ئەو هەستی دووبارەبوونەوەیە چی بوو؟

«دەبێ ڕەگێکم لێرە بێ. دەبێ پارچەیەکی زندووم لێرە بێ. من خۆم نا، بەڵکو پارچەیەکی ترم لێرەیە و بەردەوام ئاگادارم دەکاتەوە. پێم دەڵێ: ئەوەتام لێرە!... فریام کەوە!... دەنگم لە بنی حەوت خشتی بناغەی ئەهرامەکاندایە!... نا، من... دە هەنگاو لە دیواری مزگەوتەکەی سەلاحەددینەوە دوورم... فریام کەوە!»

دەنگەکە لە ناو بیرەوە دەهات. هاوارێکی خنکاو بوو و کەس گوێی لێ نەدەبوو. لە ناو بیرەوە یا لە ناو قووڵایی ڕۆحی خۆیەوە دەهات؟! نەیدەزانی. لە هۆشی خۆی دڵنیا نەبوو: «دەبێ ڕاست بێ؟ دەبێ ڕاست بێ لەوێ بڕیاری چارەنووسی هەموو مرۆڤایەتی بدرێت؟ نا... هەموو مرۆڤایەتی نا. لەوێ بڕیار لە سەر چارەنووسی دانیشتوانی باشووری سوودان و فیل و تەرس و فەلەستینی و کورد و ئەو و من دەدرێت. چارەنووسی فەرەنسییەکان چ پەیوەندی بەم شوێنەوە هەیە!»

بە لای ڕاستدا لایدا. لە ناو ئەو بۆنە بۆگەنەدا، بۆنی بنیشتەتاڵە و

خەناوکەی مێخەک و کفر و بۆنخۆشکەی گەرمیان، هەستی دەبزواند. قاهیرە و بنیشتەتاڵە و بۆنخۆشکە؟! بۆ نا؟. ئەدی ئەو و قاهیرەیان گوتووە؟. بنێشتەتاڵەش وەک ئەم، خۆی لە بن زمانی مارێکدا شاردۆتەوە و گەیشتۆتە قاهیرەی بەهەشت. لێرە، بە کاوەخۆ دەتوێتەوە و دادەزاییێتە ناو لمی دەم نیلەوە. بنێشتەتاڵە، لەگەڵ قەوچەی سۆزانییەکی لەشفرۆشدا لێرە گیرساوەتەوە. خۆ ڕەنگیشە لە بن زمانی فرۆشیاری کچە گەرمیانیەکاندا بووبێ! ئەدی ئەم لێرە چ دەکات؟ کێیە و چ کارەیە؟!.
ئا دۆزییەوە. یەکێکە لە لیژنەی بەدواداچوونی چارەنووسی ئەنفالەکان و بە تەکلیف چۆتە ئەوێ. پێیان گوتبوو: بچۆ ڕاپۆرتێک لە سەر ژنە فرۆشراوەکانی گەرمیان بنووسە... بزانە سەر بە کێن! دەبێ چارەنووسیان بزاندرێ!
«تەحاا!! بەشی من هەر ڕاپۆرتنووسینە! لە سەر ژن، لە سەر پیاو، لە سەر ئەوەی دەڵێ لەل. من دەبێ هەندێ شتی شاراوە ئاشکرا بکەم و هەندێ شتی ئاشکرا بشارمەوە... وەهایان بشارمەوە، وەک ئەوەی هەر لە بنیی نەبووبن! من جاسووسی دەستی دووەمی جاسووسانم. پەڕەمووچەی زەڕنەقووتەم و بە هەوای هەناسەی منداڵێک بە ئاسماندا دەچم. بۆ ئەوەی ببمە مودیر، یەکەم ئەرکم سووککردنی خۆمە تا ئاستی پەڕەمووچە... تا ئاستی سەگی پۆلیس: بۆن بە جانتاکانەوە بکە بزانە شیعرێ میعرێ نادۆزیتەوە بە زمانی نەیاردا هاتبێ!. بۆن بە دڵەکانەوە بکە بزانە هیچیان بۆ کیژەکانی قاهیرە زوخاو ناڕێژن! بۆن بە نیگای ڕێبوارانەوە بکە بزانە کەس بە چاوی سووک تەماشای سۆزانییە ڕەسمییەکانی بارەگای باڵا ناکات!. بچۆ بزانە کەس، کە چیا دەبینن حایج بووە و دەقەوچێ، قەشمەری بە کلیپە هونەرییەکان ناکات! دەبێ بۆنت تیژ و چاوت تیژ و چەقۆی زمانیشت تیژ بن تا ببیتە مودیر و وەزیر... بڕۆ بۆ فڕۆکەخانە! بڕۆ بۆ سەر پردەکەی قاهیرە!... بڕۆ... بڕۆ تا دەگەیتە دەڵەدوێک... مەمکی چەپی لە بن خۆی ڕاخستووە و... «
ئاهووو! دەڵەدێو دەسبەرداری خەیاڵی نابێت!. ئەو بە دوای ئەو کیژانەدا

هاتبوو کە لە قاهیرە هەڕاج کرابوون. ئەگەر منداڵیان هەبن، ئێستا هەرزەکارن... بە خۆی دەگوت: «ئێستا ئیمامی عەلی نەماوە تا، وەک ئەوسا بووە پەنای منداڵی ژنە جەلەولاییە تالانکراوەکان، ئێستاش ببێتە پەنای منداڵی ژنە فرۆشراوی دەوروبەری جەلەولا! ئەو پیاوە بۆیە نەما تا منداڵی ژنی تالانکراو بێ پەنا بن! من هاتووم بزانم ڕاستە بە ئالای بەرۆکیانەوە، بە دەم کۆڕنیشی نیلدا دەست بە دەست دەکەن! دەمەوێ بزانم شەرەفی ئەوەیان ماوە دڵیان بۆ وڵاتی خۆیان لێ بدات! ئەمانە خیانەتکارن... دەڵێن هەر هەموویان خیانەتیان لە میللەتی خۆیان کردووە! وەی بابە لەم کارەی من، وەی بابە! بەر لەوەی بمنێرنە ئێرە، هەر هەمان کارم دەکرد... دوای هەمان ئەم نەفەرانە کەوتبووم تا هێلانەیان بدۆزمەوە و داویان بۆ بنێمەوە! ئەمە پیشەمە! من لە سەرمە نهێنی وردوردی دڵی ئەمانە بدۆزمەوە و بە فەردەش فایلی زلی سەرقافڵەی وەیل بشارمەوە... بدۆزەوە و بشارەوە، تا هیچ ڕەسەنایەتییەک نەمێنێت!»
بۆنی خەناوکە دەهات... بۆنی بنێشتی کوردی و کفرەکانی گەرمیان بۆ لووتی دەهات... بۆنی عارەقەی بن هەنگڵ و گۆرەوییەکانی مەجید حەساری دەهات و تێکەڵاوی بۆنی خوێنەکەی دەبوون... بۆنی مەرەکەب دەهات. بۆنی خوێنی کچێنی و خوێنی وشکەوەبووی ئەمدیو و ئەودیوی بەردە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئیسماعیل خەیات دەهات... بۆنی باڕووت و دووکەڵ و ئاگر و هەوای گەرمیان دەهات... بۆنی تووڕەبوونی گەرمیان دەهات... بۆنی ژیوانبوونەوەی خواپەرستی و خاکپەرستی دەهات... بۆنی ژیوانبوونەوەی شەهید دەهات... بۆنی ژیوانبوونەوە چەند کەسکوونە!
بە دووی بۆنەکەدا چوو... تا دەهات تیژتر دەبوو. لە باڕێکی بیرەفرۆشیدا بۆنەکە کەسکوونتر بوو. کە ڕەت بوو، بۆنەکە کەم بووەوە. گەڕایەوە، بۆنەکەش گەڕایەوە دۆخی تۆخیی خۆی. خۆی پێدا کرد. وەک سەگی فرۆکەخانە بۆنی دەکرد. ئەم مێز بۆ ئەو مێز، ئەم نەفەر بۆ ئەو نەفەر، تا دۆزییەوە: «بەڵام ئەم سەروسەکوتە نابێ یەکێ بێ لەوان!. کوا؟ خۆ ئالاش بە برۆکییەوە نییە! نابێ ئەمە یەکێ بێ لەو هەژدە کیژە

فرۆشراوانەی گەرمیان. چاو مەڕی، قژ خەنەیی، جەستە داتەپیو، کیسەی چاو هەڵئاوساو، لێو وەک تکی خوێن سوور و قێزەون، ورگ دەرپەڕیو و تەمەن لە نێوان سیوپێنج و چلساڵ!

ـ ئەم کاتەت باش!. بە عارەبی ئەوەی گوت. «عارەبی، تاجی سەری زمانەکانە و دەبێ بەر لە هەموو شتێک، ئەو زمانە تاقی بکرێتەوە! عارەبی زمانی قەیامەت و عەرعەر و وەیل و هەردوو بەری نیلە. عارەبی، زمانی قەومی هەردوو بەری بەردەکانی سمایلە. دەڵێن بەردەکانی سمایل، ڕۆحیان تێگەڕاوە و هەر یەکە بە لایەکدا فرتەیان لێ کردووە. هەندێکیان لە بن نەفەقی (باب الشرجی) کەوتوونە و دەرۆزە دەکەن... ئەوانەی بن نەفەقە، ڕەنگیان کاڵ بۆتەوە و بەرد دەنگی لێوە بێ، ئەوان نا»

ژنەکە، مژێکی لە جگەرەکەی دا و دووکەڵەکەی هەڵڕژاندە سەر مێزەکە و بە سەر مێزەکەدا پەرتی کرد. دەتگوت دووکەڵی هەڵهێنایەوە. لە بەر خۆیەوە، بێ ئەوەی وەڵامی ئەم بداتەوە یا تەماشای بکا، بە چپە گوتی: «هەر ئەم خۆڕییەم کەم بووا» بە کوردی ئەوەی گوت. جگەرەکەی، کە هێشتا بە نیوە نەببوو، نوشتاندەوە ناو تەپڵەکەکە و کوژاندیەوە. سووراوی لێوی بە قونکەکەیەوە مابوو. ئەمیش، هەر بە سەرسوڕمانەوە تەماشای دەکرد. بۆنی بنێشت و ئەم سەروسەکوتە!. دەبێ ئەو بۆنە لە مۆخەکەیدا مابێ!. وەک سامگرتوو، بێ ئەوەی خەمی (خوێڕێتی)یەکەی بێ، بە کوردی گوتی:

ـ تۆ کوردیت؟.

جووتێ چاوی گەورەی شێدار و پڕ لە جنۆکە و کارەسات و سەرسوڕمانی هەڵبڕین. چ خۆشحاڵییەکی پێوە دیار نەبوو. ئەگەر یەکێ بووبێ لەو هەژدە فرۆشراوانە، بە پێی تەمەنی، دەبوو یا حەسیبە بێ یا سەوزە...

ـ ناوت سەوزەیە؟

دەسکی جانتاکەی ئاڵاندە باسکییەوە و گورج هەستایە سەر پێ. بە ڕقەوە چاوی تێ بڕی و بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ من سەوزەم... من کوێستانم... من حەسیبەم... گەلاوێژم... چیمەنم....

- ده تۆ جارێ دانیشه!... دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم... من بۆ هەواڵی ئێوە لێرەم! ئەو ناوانە لە کوێ دەناسیت؟
هەر بە پێوە بەردەوام بوو:
- کامتان پیاوە، من خوشکی ئەوەتانم... کامتان مەردە، من کیژی ئەوەتانم... کامتان شایە، من ژنی ئەوەتانم...
- ده تۆ...
هەتا دەمی گرتی، تفێکی کردە چارەی. تفێکی گەرم و لیچ، بە ناوچەوانیدا هاتە خوارێ و زوو سارد بووەوە. هەردوو ڕوومەتی داپۆشی و زەنگوڵەیەکی بە جێی سمێڵیەوە چەسپ بوو. بە دەر لە دەسەڵاتی خۆی، بیری کردەوە: «بە دووی ئەو ژنە دەم بە بەزەیەدا نەهاتبام، ئەم تفەم لێ نەدەکرا! بەڵام کێ دەڵێ لە بری ئەو تفە، لەوبەر گوللەیەک چاوەڕوانم نەبوو؟! هەرچۆنێک بێ، تف لە گوللە باشترە!»
بە پەلە ئەودیو مێزەکەی چۆڵ کرد و ڕۆیشت. لە جامەکەوە دیتی، بە لای دەستەڕاستدا لایدا... هەر دەڕۆیشت و تفی دەکرد. ئەوەی لە جێیەکەیدا مایەوە، سووراوەکەی لێوی و قونکە جگەرەکە و نیو پەرداخ بیرە و تفەکەی بوو، کە هێشتا نەیسڕیبوو. دەستەسڕەکەی دەرهێنا و چاوێکی بە دەوری خۆیدا گێڕا و دیتی چەندین جووتە چاوی ڕەشی پڕ لە بزە و بەزەیی تروسکەدار سەیریان دەکەن. تفەکەی سڕییەوە. لە بەر خۆیەوە کەوتە دوان: «بۆ وای کرد؟ خۆ من هاتم بیدوێنم! خۆ قسەی خراپم نەکرد!. کوردییەکەی هیچ تێکنەچووە. گەرمیانییەکی تەواو دەدوێ... بۆ کوێ چوو؟ ئیمامی عەلی فریای منداڵی ئەمیش بکەوە و بیکە بە سەربازی لەشکری خۆت!... بیکە سەربازی لەشکرەکەت و بەرەو نەمان... بەرەو نەمریی پێشی کەوە!... قیرسیا لەو تفەی کە ڕۆی کرد!»
بە پەلە هەستا. بە لای ڕاستدا لایدا و ڕۆیشت. لە ناو دەریایەک سەری بەشەردا، کە هەموو هەڵبەز و دابەزیان دەکرد. سەری ناسییەوە. لە ناو بیستوهەشت ناودا کامیانە؟. دووی کەوت... کە گەیشت پێی، بە بێ سڵەمینەوە باسکی بە باسکیدا کرد و پێ بە پێی ئەو دەڕۆیشت. ئەویش

هیچ خۆی تێکنەدا و لەگەڵیدا ڕێک ڕێی دەکرد و سەربازانە، هەنگاویان دەنا. چی دی بۆنی بنیشت و مێخەک و کفری گەرمیان و بۆنخۆشکە و ژیانبوونەوەی لێ نەدەهات... بۆنی بیرە و میز و نیکۆتینی لێ دەهات... نیکۆتینێکی کەسکوون.

- بۆچی ئەو تفەت لێ کردم؟

- حەڤدە ساڵە ئەو تفە کۆ دەکەمەوە... ئەمڕۆ دەرفەتم دەست کەوت ڕۆی بکەم و ڕۆم کرد. حەڤدە ساڵە چاوەڕوانی زبڵدانی چارەی کەسێکم کە منی بە زمانی شیرین بە داوەوە کرد و دامی بە جامبازی ژنە کورد. حەڤدە ساڵە لە زمانێک دەگەڕێم بە زمانی تۆ بگەڕێ تا ئەو تفە لە کۆڵی خۆم بکەمەوە.

- من هیچم نەکردووە!

- هەمووتان، هەموو شتێکتان کردووە. جاش، بەعسی، مەخابەرات... هەرچی وەک سیپاڵە کۆن بەڕێی کردم، کوردێکی وەکو توی لەگەڵدا بوو تا تێمبگەیەنێ چۆن سووک بم و چەند سووک بم... باوک و دایک و براکانیشم... بۆ برایەک یا کەسێکی خۆم توانی تڕیک لە تۆڵەی من بکەنێ؟. ئێستا بە ملی شکاوت بۆ تاقیبی من هاتویت؟ لە بری براکانم هاتووی یا ئەو ئامۆزایانەم کە لە سەر من شەڕە خەنجەریان دەکر؟ خۆ ئێستا شەڕەتڕیش ناکەن! لە بری ئەو جاشە هاتویت کە لە کەلەبەری تاوێرەبەرد دەریهێنام و بە دەم قاقای پێکەنین و «سەیدی سەیدی»یەوە، وەک چەپکە گوڵ تەسلیمی ئەفسەرێکی کردم تا دواتنۆکی ئاوبارە و جوانیم بخواتەوە؟ هاتوی داوای لێبوردن دەکەیت؟ لە بری کێ؟... ها ها ها... یا هاتوویت گۆشاوگۆش سەرمبڕیت و ئابڕوو بکڕیتەوە... ها ها ها... ئابڕووی کێ؟...

- ڕێزی خۆت بگرە خانم!

دایەوە قریوەی پێکەنین: یا گەدەع ئوسکوت!

- بۆچی کردتە عارەبی؟

وەڵامی نەدایەوە. لە کۆڵی خۆشی نەدەکردەوە. نەشیدەگوت وەرە. وەک

پارچە جلێکی بەری، وەک تاکێکی پێڵاوەکانی، بە بێ ئیرادە و بڕیار، دەیبرد. ئەمیش بە بێ دەنگی و بێ ئەوەی چ دەسەڵاتی هەبێ، دەڕۆیشت. بە دەم ڕووباری نیلدا ڕۆیشتن. سەد هەنگاوێک لەلای مزگەوتەکەی سەڵاحەددینەوە، خانمێک، خۆی دابوو بە سەر پەرژینی دەم ڕووبارەکەدا و یەکێک وێنەی دەگرت و وێنەی لەگەڵدا دەگرت. ئافرەتەکە، تا ژوور ناوکی بە دەرەوە بوو. پێستی، سپییەکی ئەورووپاییانە بوو و ئەڵقەیەکیش بە ناوکییەوە بوو. خانمەکەی شانی ئەمیش، سڵاوێکی قەشمەریئامێزی لێ کرد. ئەویش، بە دەم ترسەوە بەرەو لای هات: «بە خوا بە شوێنمدا هاتن!... من تاقیبی تۆم کرد، بەڵام لەوێ نەبوویت!»

- دووپاتی بکەیتەوە هەردوو چاوت دەردێنم!. ئەوە کێیە لەگەڵتدا؟

- کڕیارێکی باشە! خەلیجییە!

- ئا دەی کوا؟ چەندی پێ داوی؟... نا، دوایی حیسابت لەگەڵدا دەکەم. زوو بگەڕێیتەوە ها! ئەمشەو وەزیری دادی وڵاتی جنۆکان ... وڵاتی زۆڵەکانی بەلقیس، تۆ یا یەکێکی وەک تۆی گەرەکە.

- بە چاوان!

نەیدەزانی مەسەلە چییە. یا دەیزانی و لە خۆی تێکدەدا. خانمی هاوشانی، بە مەغزاوە تەماشای کرد و بزەیەکی کرد:

- ئەو پیشەیەی ئێوە کردتان، ئێستا من دەیکەم. جیوازییەکە ئەوەیە کە ئێوە، منی کیژ یا دەزگیرانی خۆتان بە فرۆشتن دا، منیش ڕووسییەکان دەفرۆشم! هەر هەمان پیشەیە ها! بەڵام ئەوەی ئێوە لەمەی من تۆخترە. بۆ ئەوەی لەم کاسبییەم تێبگەیت، تا ئێرەم هێنایت. ئێستا وەل بە و بڕۆ ملت بشکێنە!

- نا، ناڕۆم!. هەتا قسەت لەگەڵدا نەکەم، ناڕۆم! دەبێ بۆم باس بکەیت... خانمی گەرمیانی، تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد. هەر ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو، سێ - چوار زەلامی کەتەی بازووبەند لە مەچەکی سمێڵ باریکی لێ پەیدا بوون و دەوریان دا. ئیدی بەر چاوی تاریک داهات. کاتێکیش وەئاگا هاتەوە، پەساپۆرت و پارەکەیان بە چاکەتەکەوە بردبوو.

هەرچی پێ بوو بردبوویان. پێڵاوەکانیشی نەمابوون. بە لارەلار، دەستێکی بە پەرژینی دەم نیلەوە گرتبوو و دەستێکیشی بە لووتە خوێناوییەکەیەوە بوو... و دەڕۆیشت. پاش ماوەیەک، لە پەلوپۆ کەوت و لە جێیەک دانیشت. بێ ئەوەی دەسەڵاتی بە سەر خۆیدا بشکێت، دەستی بە گریان کرد. بە کوڵ دەگریا. گریانی قەتیسماوی تەمەنێکی دووروودرێژی لە دەم نیلدا دەرپەڕاند... ژیوانبوونەوەی هەموو ژیانی، بووە ئەشک و بە چاویدا هاتە خوارێ.

زۆری نەبرد، بەردەمی پڕ بوو لە پارەی وردە. هەرچی دەهات، شتێکی فڕە دەدایە بەردەمی. شوێنەکەی، لە مزگەوتەکەی سەڵاحەددینەوە دوور نەبوو... «ماڵت ئاوەدان بێ سەڵاحەددین! لێرە فریام کەوتیت! کێ دەڵێ تۆ کوردایەتیت نەکردووە؟ قاهیرە چ شارێکی مەزنە! خەڵکەکەی چ خێرەومەندن!»

ئەمیش، وەک بیستوهەشت کیژەکە لە قاهیرە گیرسایەوە و کەوتە سەر سکەی خۆی: «ژنەکانی قاهیرە چەند ناسکن! ئاوی نیل، لە ناوجەرگەی ئەفریقاوە دێتە ئێرە، کەچی لە وڵاتی منەوە ژن ڕادەماڵێت... ڕووداوەکان، لە تاریکایی مێژووەوە دێنە ئێرە... ڕێبوارەکان، لە هەموو شوێنێکی جیهانەوە دێنە ئێرە... ژنە فرۆشراو و لەشفرۆشرکان، لە هەموو دنیاوە دێنە ئێرە... هەموو ڕێیەکی دنیا بە قاهیرەوە بەستراوە و هەموویان دەگەنە ئێرە... منیش هاتمە ئێرە... هەموو گەورەپیاوانی کورد دێنە ئێرە و بە بەردەمی مندا ڕەت دەبن... بە بەردەمی من و چیمەندا... من و گەلاوێژدا... بە بەردەمی من و نازانم کام یەک لەو بیستوهەشت کیژە فرۆشراوانەدا دەگوزەرێن و ناماننناسن و نامانبینن... نا، نایانەوێ بمانبینن. کەچی کە لە دوای نیوەشەودا مەست دەبن و زەوقیان دەبزوێ، دەستودامانمان دەکەون... ئەو بیستوهەشتە، منداڵەکانیشیان پێ گەیشتوون بۆ ئەو کاسبییەی کە لە چارەیان نووسراوە! منیش بوومەتە یەکێک لەوان. منیش جەستەی ژنە ڕووسی دەفرۆشم... ئێستا منیش بازرگانی بەو بیستوهەشت کیژە و کیژی ئەوانەوە دەکەم. ئێستا بووینەتە

سیونۆ و دەبینە پەنجا و دەبینە سێسەد و سێ هەزار و سێسەدهەزار و هەر وا دێت و زیاد دەکەین تا دەبینە حەوت ملیۆن... حەوت ملیۆنی خشت. پیاوی گەورە لێپرسراوی هەموومانە... پیاوی گەورە، بینباشی... ملیۆنباشی هەموومانە. ڕەنجی ناولنگە فرۆشراوەکان بۆ ئەوانە. بازاڕمان گەرمە و تا دێ گەرمتر دەبێ. گەرمتر و گەرمتر دەبێ و دراو دەبارێ و کەلاکی ولاتێکی مردوو دادەپۆشێت! دەبارێ و عەیب و عاری کەتنکەرەکان دەشارێتەوە.

هەموو ڕێیەکان دێنەوە قاهیرە!

هەموو ئاوەکان دێنەوە قاهیرە.

هەموو خائینەکان دێنەوە قاهیرە.

هەموویان دێنەوە قاهیرە... جامبازەکان...

ڕۆحی هەموو ئەنفالکراوەکانیش دێنە قاهیرە و بە دوای خوشک و دایک و کیژی خۆیاندا دەگەڕێن. بە دوای گەلاوێژ و چیمەن و لەیلا و پەیمان و گولیلک و شلێر و کوێستان و سەوزە و مندا دەگەڕێن. کەسمان هیچ مۆر ناکەین... من یەکێکم لەوان و هەر وا تف کۆ دەکەمەوە تا ڕوخسارێکی زبلدانم تووش بێ و ڕۆی بکەم... ئەو ڕوخسارەی منی بۆ ڕاپۆرتنووسین نارد... ئەوانەی بە دواماندا دەگەڕێن، یەکە و چەقۆیەکیان پێیە تا بە خوێنی ئێمە ئابڕوو بشۆنەوە... خوێنی خۆیان گووی سەگیش ناشواتەوە. نێرەپیاوی سمێڵ بابڕ، ئابڕووی خۆیان بە مەرگی ئێمەی بە داوەوە کراو و فرۆشراو دەشۆنەوە».

پەیمان پلانێکی داناوە. پەیمان هەر عاشقە سەودا سەرەکەی جارانی گەرمیانە و بیری ناچێتەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان، کارمامزێکی سلّی چاوبەلّەکی گەرمیان بووە. بیری ناچێتەوە هەر لە دلّی خۆیەوە، لە جێیەکی نهێنی ناو دلّییەوە عاشقی چەکدارێک بوو پێیان دەگوت پێشمەرگە. ئەو دەمە، (پێشمەرگە)ی بە لاوە جوانترین وشە بوو و ئاگای لێ نییە (پێشمەرگە) دەرۆزە داکەن. پەیمان، ئێستاش خەریکی بیرکردنەوەیە لە خەبات، بەلام دەترسێ بگەڕێتەوە و بۆ سڕینەوەی عار بیکوژن. پەیمان پڕۆژەیەکی

هەیە: مادام زۆربەی سۆزانییەکانی قاهیرە کار بۆ ئێمە دەکەن، با خەریکی دروستکردنی وڵاتێک بین!. ئەمیش، هەمیشە سەرزەنشت و ڕێنمایی دەکات: دروستیشی بکەین، پیاوە سەڵارە ڕەوشتبەرزەکان شەقێکی تێ هەڵدەدەن!... کێ وڵاتی دروستکراوی دەستی سۆزانی دەوێ؟ سەری خۆت مەهێشێنە، پەیمان!.

بێ هیوایی دەستی بە سەر سروەشدا کێشاوە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕەشبینتر دەبێ... هەموو ئەنفالکراوە فرۆشراوەکانی قاهیرە و منداڵە دووڕەگەکانیشیان، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕەشبینتر و ڕەشبینتر دەبن و لە ناو خوێنی وەچەی فیرعەونەکاندا دەتوێنەوە... دوای ئەو هەموو ساڵانە، ئێستاش لەو ساتە دەترسن کە برایەکیان، ئامۆزایەکیان، پوورزایەکیان، دەزگیرانیان یا هەر کەسێکی دەڤەری خۆیان دەماری پیاوەتی ببزوێ و بێت و بە تیغێکی تیژ گرێ ملیان هەڵبڕێ و بە خوێنەکەی، ئابڕوو بکڕێتەوە!... بەڵام نا. کە دێن، ئەوانیش وەک ئێمە لێرە گیر دەخۆن و دەبنە ئەندامی دەستەکەمان... با بێن... با بێن تا ئەوانیش وەک پەیمان بیر لە دروستکردنی وڵاتێک بکەنەوە... با بێن...

*** لە قووڵایی ڕۆحمەوە هەست دەکەم ئەو بیستوهەشت کچ و ژنە کوردە گەرمیانیانەی کە عارەبەکانی عیراق بە مەلهاکانی میسریان فرۆشتن، یەکە بە یەکەیان خوشکی منن... کیژی منن... دەستنوێژم لە هیچیان ناشکێت. هەست دەکەم خاوەنی بیستوهەشت خوشکی فرۆشراووم و دەسەڵاتدارانی بێ باکی کوردستانیش داوام لێ دەکەن کە برایەتی لەگەڵ فرۆشیارەکانیاندا دامەزرێنم. من برای ئەو کیژانەم و لە کەسوکاریان زیاتر، هەست بە کۆسکەوتنی خۆم دەکەم... لەگەڵ ئەوەشدا، داوای لێبووردن لە کەسوکاریان لێ دەکەم.**

# کێنتاور*

بە شێتم دەزانن یا نازانن، بە جەحەننەم! گوایە خۆیان زۆر عاقڵ و تەواون!. چما شێخ، کە دەیەوێ عاقڵم بکات، بەخۆی زۆر عاقڵە؟ خۆ من بڕیارم نەدابوو هەموو شەوێ ئەو پەیکەرە تارماییە بێتە سەردانم. پەیکەری تارمایی! نا نا، تارمایی پەیکەر!. بەڵام دەبزوا و قسەی دەکرد و خەمی دەخوارد و... وەک ئێمەومانان... وەک عاقڵەکانیش ژیوانبوونەوە و ئازاری ویژدانی هەبوو. ئەویش پێدەکەنی. کەس هێندەی ئەو تارماییە ڕاستگۆ نەبوو. ئەو ماڵوێرانە نەیدەزانی درۆیان بکات! کە یەکەم جار هاتە سەردانم، بۆ سبەینێ بردیانمە لای شێخ! باوکم بە شێخی گوت: «مامە شێخ! بە قوربانی هیممەت و بەرەکەتت بم! ئەم کوڕەم شێت بووە!. دوێنێ، عەیب نەبێ، عەیب و عەلەمی نەبوو کەچی بەیانی کە هەستا، نوێژی نەکرد. پێی گوتین: من نوێژ ناکەم چونکە ئەنجامم وەیلە... ئیدی بۆ نوێژ بکەم؟ ئێوەش مەیکەن! بە خودا هەمووومان ئەوە ئەنجاممانە! عاقیبەتی گشتمان وەیلە. وەیل بە تایبەتی بۆ ئێمە دانراوە! کە پێم گوت چووزانیت، گوتی: ئەمشەو یەکێ لە وەیلەوە هاتە لام و

باسی کرد... پێی گوتم جارێ ماوتانە بەڵام لە ئەنجامدا هەر دێنە لای من... دێنە وەیل...»

شێخیش دارکارییەکی چاکی کردم و لەگەڵ هەر لێدانێکدا هاواری بۆ جددی دەبرد. دەڵێن گوایە جددی ئەو، دەگەڕێتەوە سەر ئیمامی هەمزە. لێدە و لێدە!... کە شێخ لێیدەدام، دەبوو باوکم، بە دەستی خۆی بمگرێت. هەردوو دەستمی لە پشتەوە تێکدەپەڕاند، هەردوو چۆکی لە پشتم گیر دەکرد و شێخ لێیدەدام. باوکم بۆم دەگریا، بەڵام بەری نەدەدام. دڵۆپە ئەشکی بە چاودا دەباری و بۆ شێخیشی دەگرتم. دەیگرتم و بە کڕووزەی ناو دڵیەوە هاواری دەکرد: «گیان! گیان! بە قوربانت بم کوڕە چاکەکەم!... گیان! چی بکەم چار نییە ڕۆڵە! چار نییە هەر دەبێ دارکارییەکی پیرۆز بکرێیت!» دەگریا و توند دەستیشی دەگرتم تا شێخ چاکم لێ بدا. منیش بە ناچاری چاک بوومەوە! تڕحێو! چاکبوونەوەی چی؟! هەموو شەوێ ئەو فریشتەیە دەهاتە سەردانم و جێی لێدانەکانی بۆ تیمار دەکردم. دەستی نەرم و فێنک و شیدار بوو. دوای لێدانەکان، ئیدی چ قسانم نەدەکرد. ئەو، خۆشی پێی گوتم باسم بکەیت، شێخ چوارمێخەت دەکێشێت... ناووم نەیەنی ها!. ئەوەی ناوی وەیل و ئەهلی وەیل بهێنێ، لە هیچ کوێ جێی نابێتەوە! ئەهلی وەیل، پیاوی خۆیان ناردۆتە ئێرە و کل لە چاوان دەدزن! چاودێرانی وەیل لێرە تەراتێن دەکەن و کەس پێیان نازانێت! نەکەی باسم بەکەی، نەکەی، ها! منیش کە لە نێوان «باسی بکە!»ی شێخ و «باسی مەکە!»ی ئەودا بڕیاری گردەبڕم هەبوو، گوتم: بە چاوان گوڵە کێوییەکەم! بەڵام ئەگەر لێشت تووڕە بووم، هەر وەرەوە سەردانم. من تازە بە بێ تۆ هەڵناکە. تۆ بە ناو خوێنەکەمدا دەسووڕێیتەوە! من لێرەش بم، هەر لەگەڵ تۆدا لە وەیلم. زۆر سوور بوو لە سەر نەدرکاندنی دیدارەکانمان. کە دەیگوت، لای کەس باسم نەکەیت، چاوی زەق دەکردنەوە! چاوەکانی هێندە جوان بوون، ڕۆحم لە ناو گلێنەکانیدا دەتوایەوە. چاوی گەش... گەش بوون.

دەیگوت: من زۆر لە چاودێرانی وەیل دەناسم هاتوونەتە ئێرە! ئەوانە بوون ئێمەیان نارد... ئەوانە بوون ئێمەیان لە کلۆرە دار و نێوان تاشە بەردەوە دەرهێنا و سواری پاسیان کردین! نەکەی ها! منیش، کە هەموو جەستەم بەنج دەبوو، سەرم بە دەم لەرزەوە ڕادەوەشاند و پێم دەگوت: بە چاوان... بە چاوان... هەرگیز نایدرکێنم! من لە تۆ زیاتر کەسم نییە و تۆش تەنها منت هەم! بەڵێنی دا جارێ دەسبەردارم نەبێ. چەند جارێک تووڕە بووم و تووڕەم کرد و بە جێی هێشتم، بەڵام دوای یەک دوو شەو، قیت دەهاتەوە! بە خۆی و چاوە گەشەکانییەوە... بە خۆ و بە مەمکە قیتەکانییەوە دەهاتەوە! دادەنیشت و بە باڵە شینەکانی، جەستە خرت و تورت و ڕووتەکەی خۆی دادەپۆشی. ها! بە خێر بێیتەوە گوڵی وەیل. بە جووتە پێدەکەنین... قاقامان تێکەڵ دەبوون... دەبووین بە یەک بوونەوەری لە هیچنەچووی بەدگۆڕاو... ناومان لە خۆمان دەنا خوێنی سەربازە پەستەکلەبەرەکانی سەلاحەددین... تەپوتۆزی سمی ئەسپی سوارەی حەمیدی... پەتی ملی سێدارەی ئەندامانی پەرلەمانەکەی ئەتاترک... ئاردی ئەنفال.... ئاردی نەوت... تەپوتۆزی شۆڕش... خوێن و خۆڵەمێشی شەهید... شوێنەواری ئەنفالکراو... قنچکە بەردی ناو پێڵاوی پێشمەرگە... لاقی شکاوی مێزی گفتوگۆ. ئەو نیوەشەوەی کە دوای تۆران و تووڕەبوون دەگەڕایەوە، تا پێش بەرەبەیان، قەدەرێ دوای کەڵەشێری پیرەژنتۆران پێدەکەنین. بەرەبەیانیش، لە شەقەقەی باڵی دەدا و دەڕۆیشت. بەر لە ڕۆیشتن دەیگوت: عەزیزم، من نابێ خۆر لێم بدا و ئاشکرا بم! دەبێ تا هەتایە بە نهێنی بمێنمەوە! دەبێ من هەر لە تاریکیدابم. ئێستاش، دەبێ بڕۆم... بە هیوای دیداری نیوەشەوێکی تر! دەمگوت: بۆ نابێ کەس بتبینێ؟ با هەموو دنیا بتبین و بتناسن! با بزانن تۆ لە وەیلیت. ناوی ئەوانە بڵێ کە ناردیانیت.

دەیگوت: «شێتوویت! من خۆم نهێنییەکم و نابێ کەس بمزانێت. من مەتەڵێکم نابێ کەس هەڵمبێنێ. من خۆم بەرهەمی ڕێکەوتنێکم نابێ

ئاشکرا بکرێ و نابێ ئاشکرا بکرێم. من کارێکی سەسوڕهێنەری جیهانم و نابێ کەس تێمبگات... « ئەوجا لێی دەدا و دەڕۆیشت... ورشەی باڵی دەهات... کوکوختی بان دارەکەش هەڵدەفڕین و تا بەیانی هێڵانەواز دەبوون.

لە دوایەوە هاوارم دەکرد: «باشە، بەڵام هەر نەبێ کەمێ زووتر وەرەوە!» هێدی هێدی بە سەر سەرمدا دەخولایەوە. دەیگوت: ناتوانم، نا!... ڕێیەکەم گەلێ دوورە! هەموو کەسێک لەوێوە ناگاتە ئێرە!... منیش، لە بەر ئەوەی هێشتا خوێنم تەڕە، دەتوانم بێم! کە خوێنم وشک بێتەوە، منیش ناتوانم! هەموو سەرەتایەک کۆتایی هەیە و کۆتاییش سەرەتای شتێکی ترە. سەرەتای شتێکی نوێ. سەردان، کە دەستی پێ کرد، بە ماڵاوایی کۆتایی دێ. کۆتایی دەست پێ دەکا و سەرەتایەکی دی دێ.

ئەو دەڕۆیشت و من نیوە عومر دەبووم. هێند هاوارم دەکرد و دەگریام تا قوڕگم دەگیرا و چاووم سوور هەڵدەگەڕان. لە سەرەتاوە، باوکم دەهات و بە دەنگێکی گڕ و بە (لاحەولەوەلا لاحەولەوەلا و بیسمیلڵا بیسمیلڵا) سەری بادەدا و بە دەورمدا دەهات و فووی دەکرد: «پففففف.... بیسمیلڵا... پففف» بەڵام لە ئەنجامدا، ئەویش بێزار بوو و وازی لێ هێنام. بە تەنها، تا خۆرهەڵات، بۆ پەریزادەکەم وەک سەگ دەملووراند. کە خۆر هەڵدەهات، خەمەکانی منیش بە تیشکەکانی خۆردا هەڵدەگەڕان و دەڕۆیشتن. ئیدی بە هیواوە، چاوەڕوانی نیوە شەو دەبووم و لە بەر خۆمەوە پێدەکەنیم و قسانم دەکرد: هۆ تۆزی سمی ئەسپی سوارەی حەمیدی!... هۆ تەپوتۆزی پاسی ئەنفالکراوەکان!... هۆ سەفتە دۆلاری سەر مێزی قومار و گفتوگۆ!... دە وەرەوە هۆ گولیلکە سوورەکەی وەیل!... دە وەرەوە چاوەستی مەمک قیتی باڵشین! دە وەرەوە بە داوەوەبووی ئامۆزا و برا! دە وەرەوە خوشکە دەزگیرانە دایکە نازدارەکەی هەموومان!

بەڵام هاوارم بێ سوود بوو! قەت بەر لە نیوەشەو نەدەهات. کە

دەشهات، بە دەم بزەیەکی شیرینەوە، لە بەر دەرگاکە خۆی دەتەکاند و باڵی ڕادەوەشاند. تۆزێکی مەیلەو زەردی لێ دەتەکی. هەندێ جار خۆڵەمێشیش بەو ناوەدا پەرت دەبوو. ئەو شەوە، بزەیەکی جوانی کرد:
ها شێتەکەم! ئەمڕۆ بۆ ئەوەندەت بانگ کردم؟ خۆ لێنەگەڕای ملوانکە پچڕاوەکەی هاودەمەکانم بهۆنمەوە! لێنەگەڕای دوو چپەیان لەگەڵدا بکەم و ڕازی دڵی خۆیانم بۆ ئاشکرا بکەن! ئەوەندە بانگت کردم، لێنەگەڕای پشوویەک بدەم! خۆ لێنەگەڕای سەعاتەکەم میقات بکەم! سەعاتەکەم، یەکەم دیاری بوو لە چەکدارێکی چڵکنم وەرگرت... دوادیاریش بوو.
لەگەڵ هەنگاوەکانیدا، مەمکەکانی بە ئاستەم دەلەرانەوە. دەتگوت هەرگیز دەستوپەنجەی کەسیان بەر نەکەوتووە. چاوە گەش و ڕەشەکانی، ڕۆحی منیان بەرەو ناوەوەی خۆیان هەڵدەمژی. هەرچیم لە بیر بوو، بیرم دەچوو و پێدەکەنیم!. ئەویش دەستی بە پێکەنین دەکرد... بە جووتە پێدەکەنین. ئەو پەرییە باڵشینە دەبوو بە هەموو کەسم: خوشک و دایک و دەزگیران!
چەند شەوێک لەمەوبەر کە هات، گوتی: شێتە خۆشەویستەکەم! ئەمە دواجارە دێمە سەردانیت. خوێنی منیش وشک بووەوە! وەیل، ڕێیەکەی گەلێ دوورە و کەوتۆتە لای خۆرئاواوە. حەوت فەرسەخ لە بن زەوییە. تا تۆ نەیەیتە ئەوێ، ناتبینمەوە. ئەمشەو دوا شەوە لە لات دەبم.
هەستم کرد زەوی و ئاسمان پێک کەوتن و من لە نێوانیاندا پڵیشامەوە. گریام... هاوارم کرد. پێم گوت: کە دەزانی چی دی نایەیتەوە سەردانیم، مەڕۆ! هەر لێرە بە! دەستم دامێنت مەڕۆ!
گوتی: نابێ، نا! من لێرە بم، خوێن سەر دەبا. من لێرە بم، دەبێ برای خۆم ئاشکرا بکەم! من لێرە بم، لووتکە دەکەوێتە ژێر پێڵاو! نابێ من لێرە بم. لێرە، تەنها تۆ دەمناسیت... باوکی خۆم نامناسێت... برای خۆم نامناسێت. بە هەموویان منیان دۆڕاند. تۆش، شێتە شیرینەکەم، ئەگەر شێت نەبیت نامناسیت! با ئەمشەو باسی خۆمت بۆ بکەم، ئەوسا بڕۆم.

باش گوێم لێ بگرە... بەڵام بۆ کەسی نەگێڕیتەوە، ها!. کە شێخ لێی دای تا ناووم بڵێی و باسم بکەی، درۆ بکە. ئەگەر ڕاستییەکان بڵێیت، بە داوێکەوە دەبیت لێی دەرنایەیت. شێخەکەت، شێتە جوانەکەم، بە دەستی خۆی منی ناردە وەیل. شێخەکەت، شێتە قنجەکەم، بە قەڵەمی خۆی سەفەری وەیلی بۆم ئیمزا کرد. نەکەی، ئامان نەکەی ناووم بەری!
گوتم: چاکە! ناوت نابەم. بۆم باس بکە با لە خوێنمدا ڕەگ داکوتیت... بۆم باس بکە فریشتە باڵشینە چاو ڕەشەکەم! چت بە سەردا هاتووە، بیخەرە دەمارەکانی خوێنمەوە با وەک تلیاک هۆگرت بم... با وەک ئاین بچیتە مۆخەکانمەوە. بۆم باس بکە ئازیزەکەم! چۆن شێخ تۆی گەیاندە وەیل؟ شێخ! ئەدی من چ کارەبووم؟ براکانت و دەزگیرانت چییان دەکرد؟ ئەدی کەس نەبوو لەوێ لە وەیلت بپارێزێت؟ گوتی: من...
گوتم: ئێ!
گوتی: برایەکی نازداری منیان لە پەنا دیوارێکدا ڕاگرت تا دەسڕێژی لێ بکەن. پاڕامەوە نەیکوژن. دەستی پیس و پێڵاوی چەپەڵ و بۆگەنم ماچ کرد تا نەیکوژن. پاڵێکیان پێوەنام، بە سەر دایکمدا بەربوومەوە و لنگم نیشانەی سەرکەوتنیان دروست کرد. وەی لەو سەرکەوتنە! ئەوجا پاڕامەوە: توخوا بەر لەوەی بیکوژن، با ئامێزێکی پێدا بکەم! تەنها ئامێزێکی پێدا دەکەم و بەس!. ئەمنەکە خستمی و قۆندەرەکەی خستە بان دەمم. گوتی: قەحپە واز دێنی یا تۆش لەگەڵیدا بتۆپێنم؟
براکەمیان لە بەر چاووم کوشت... دەنگی تەقەی پیاوانی وەیل کاسی کردم. ئا ئا، پیاوانی وەیل بوون! ئەمنەکە، بە کوردی پێدەکەنی... بە کوردی. ئا، پەڵەی خوێن، بە قەد دیوارەکەوە مایەوە. وەک پەڵەخوێنی کچێنی فریشتەکان بوو... بەو خوێنە دەچوو لە یانەی ئەفسەران لە بەر من چوو. ڕەنگەکەی هەر بە گوڵ دەچوو. شێوازی گوڵیشی گرتبوو. براکەم بووە گوڵێک و بە دیوارەکەوە نووسا. وەک گەوهەر دەچروسکایەوە. جەستەی براکەم، دارمایە سەر خۆڵەکە... دەمی لە زەوی چەقی.

دەتگوت نزرگەی گرتووە. ڕۆحەکەشی، کە وەک پەلکەزێڕینە ڕەنگاو ڕەنگ بوو، بە تیشکێکی باریکی هەتاودا هەڵگەڕا. نازانم بۆ کوێ! گوتم: ئەو ئەمنە کێ بوو؟

گوتی: واز بێنە شێتوویێتی نەگبەت! ئێستا گەورەیە! لە ناوی مەپرسە! منیش، لەگەڵ کەسەکانمدا دامانە شاخ. ئێهـ ! گوتمان ئێرە پاکە. کەچی لەوێ بە داوەوە کراین. منیان لە کونەفیرار دەرهێنا. سواری پیکاپێکی داپۆشراویان کردین. هەموومان کیژی منداڵکار بووین. من، سێوە، شلێر، بەهار و بەهرە... دەرپێی منیان کردە بەیداغ و بەرەو یانەی ئەفسەران ئاژاوتیان. لەو ڕۆژەوە دەستەیەک پەیدا بوون ڕازی نابن کەس باسی شەرەف بکات. بۆ ئەوەی ئێمە نەبینە ماڵ بە سەریانەوە، ئێمە بە شەرەفی خۆیان نازانن.

کەمێ داما. دوو دڵۆپ ئەشک بە چاوە درشتەکانیدا هاتنە خوارێ. دڵۆپەکان بە زیو دەچوون. بەردەوام بوو: بردیانین بۆ یانەی ئەفسەران. شەو... نا، بە سەر ئەمەیاندا باز دەدەم. بەرگەی گێڕانەوەی ناگرم... یەکەم هەنگاوی وەیل لەوێوە بوو. خوێنی وەک پەڵە خوێنی براکەم دووبارە بووەوە و بووە گولیلکێکی سوور و کەوتە بن جووتێ کڵاشی کوردییەوە. ڕەنگی خوێنی کچێنی من و ئەو دەستە کیژۆڵانە بووە ڕەنگی فەرشی بەر پلیکانەی فرۆکە. من نازانم کێ بە سەریدا وەک تاوس خۆ بادەدا، بەڵام هەست بە جووتێ پێڵاو دەکەم کە بە سەرمدا دەگوزەرێن. با بگوزەرێن!... ئەوەش پێچی مێژەرێکە. ڕەنگی فەرشەکە، خوێنی کچێنی ئێمە و زامی براکەمە. تان و پۆی فەرشەکە، پەراسووی دانیشتوانی وەیلە. کە ئەو جووتە پێڵاوە بە سەرماندا دەگوزەرێن، پەراسووەکان خرمەیان دێ و خوێن زچەی دێ. ئەو خرمە و زچەیە لە گوێی دانیشتوانی وەیلدا دەنگ دەداتەوە... هەموان دەست بە گوێی خۆیانەوە دەگرن و دەناڵێنن... شێتە شەیداکەم! تۆ گوێت لە خرمەی پەراسوو نییە؟ مەگەر هەر تۆ بیبیستی، شێتۆکەکەم!

گوتم: گوێم لێیەتی... لەگەڵ باسەکەی تۆدا دەیبینم. بە سەر یانەی ئەفسەرانیشدا باز مەدە.
گوتی: ئاخر ئەو باسە لای زندەوەرانی ئەم دەڤەرە ئابڕووچوونە. دوایی، شەرەفیان لەکەدار دەبێ.
ئەوەی گوت و پێکەنی. منیش پێکەنیم. بە جووتە پێکەنین و قاقامان تێکەڵی یەک بوون. لەو ساتەدا گوێم لە دەنگی باوکم بوو کە بە بێزارییەوە هاواری کرد: هوویها سەگە شێت! ئەوە بە چ پێدەکەنیت؟
من کڕ بووم بەڵام فریشتەی باڵ شین هەر پێدەکەنی. گوتم: وس بە! با باوکم گوێی لە دەنگت نەبێ!
گوتی: نا، ئەوەی شێت نەبێ دەنگی من نابیستێ. تۆی شێت گوێت لێمە و بەس! کەسی تر نا!
گوتم: ئێ؟ بەردەوام بە!
گوتی: ئا، دوایی سواری پێکاپە داخراوەکەیان کردین. بەر لەوەی سواربین، دیتم لە قەد دەرگاکەی نووسرابوو: وەیل!... نا نا، نووسرابو: بەرەو وەیل! من پێشتر بیستبووم وەیل چییە. دەیانگوت دۆڵێکە لە تەپان بنی دۆزەخ. وەیل بۆ ئەوانەیە کە چاو دادەگرن وقرچۆکی دەکەن... من لە ژیانمدا یەک جار چاووم داگرتووە ئەوەش لە چەکدارە چڵکنەکە. ئەوەی کاتژمێرێکی کچانەی بە دیاری دامێ... ئێستاش زوو زوو میقاتی دەکەم. ئێرە و وەیل کاتی جیاوازیان هەیە و دەبێ هەموو شەوێکی سەفەر بیگۆڕم. وێنەی دڵێکی سوور بە پشتەکەیەوە بوو. ئەو دڵە، ئێستاش ماوە. دەیانگوت قەت میقات ناکرێ. بەڵام با، دەکرێ. ئێ خۆ پارەشەم نەبوو هەتا قرچۆکی بکەم و شیاوی وەیل بم. نا هەرچۆنێ بم، هەر دەبێ ئەوێ جێم بێ. تۆش... ئەوانەی ماون هەمووتان... ئەوە جێتانە!
ئیدی هەر ئەوە بوو... بەرەو وەیل چووین. دە کەسی تریش بوونە هاوڕێی سەفەرمان. ڕێگەی وەیل نەدەبڕایەوە نا. ڕشانەوە و میزمان دەکردە بنی

خۆمان و لە ناویدا دەگەوزاین و بۆنی خۆمان خۆمانی دەتاساند... یەک درزێکی بچووک کەوتبۆوە نێوان دوو پارچە چینکۆی پیکاپەکەوە و هەر جارە و یەکێکمان تەماشای دەرەوەمان دەکرد. دەرەوە کارەسات بوو، بەڵام ڕووناک بوو. دەرەوە بیابانێکی بێ سەرەتا و کۆتایی بوو. لە ئەنجامدا گەیشتینە وەیل. وەیل، چاڵێکی قووڵ بوو... بەژنە زەلامێک دەبوو... دوو شۆڤلی لێ بوون... کە دابەزین، لە سەرەتاوە چاومان هیچی نەدەدی. تیشکی خۆرەکە وەک دەرزی بە چاوماندا دەچەقی. دوایی، وردە وردە بە دەم ڕێوە بەر چاومان ڕوون بووەوە. بینیم دوو هەندەی ژمارەی ئێمە چەکدار وەستابوون. هەموویان، چاویان وەک چاوی کەر گێل بوو. شەفرەی بەراز و سمی گامێشیان هەبوون. هەموویان کێنتاور* بوون.

گوتم: شێخەکەی منیش لەو بابەتەیە. سمی کەر و کلکی سەگ و سەری بەراز و پشتی بارگیر و دڵی گورگ و سیمای بەشەری هەیە... شەوان دەبێتە دەڵە سەگی بەبا و بە ڕۆژیشەوە شێخە.

گوتی: ئا ئا، خۆیەتی... هەمان بابەتن. دەیانمڕاندەوە. لە دەم چاڵەکە بە ڕیز ڕایانگرتین... یەکێکی شەفرە درێژیان، کە کەمێ دوور وەستابوو، هاواری کرد: دەستڕێژ!

ئیدی جەستەم، لە هەموو لایەکەوە تۆزایەوە. لە بەر ماندوێتی و برسێتی هەستم بە ئازارێکی ئەوتۆ نەکرد. هەرچۆنێ بێ، هێندەی ئازاری یانەی ئەفسەران ئازارم پێ نەگەیشت... تۆزانەوەیەکی سووک، لە بن پێستی جەستەم بوو... خۆ ڕەنگە ئازاریش نەبووبێ. ڕەنگە لەزەتی لەکۆڵبوونەوەی باری گرانی سەفەر بووبێ. ئیدی گەیشتمە دوا قۆناغ: وەیل.

گوتم: وەیلی دواقۆناغ چی لێ بوو؟

گوتی: دوو کیژ، سەریان پێکەوە نابوو و لە شتێ ورد دەبوونەوە. پێم گوتن: «کیژەکان ئەوە خەریکی چین؟» یەکێکیان سەری هەڵبڕی و بە

دەم بزەیەکی شیرینەوە گوتی: «ئەو کابرایە ملوانکەکەی لێ پساندم و میروەکانی پێوە دەکەم». گوتم: «کام کابرا؟» گوتی: «ئێستا لێرە بوو... پێم وایە بۆ تاڵان گەڕاوەتەوە ئاراپخا... سێ خوشکیشی بردم بەرەو... نازانم ئەو کاولەی خوارێ. لە جەلەولاوە بۆ فرۆشتنی هێناین و من لەیرە، خۆم لە دەستی ڕاپسکاند و ئەویش تیرێکی لە ناوشانم دا»
گوتم: پەریزادە باڵشینەکەم! تۆ باسی چی دەکەیت؟ جەلەولای چی و ئاراپخای چی؟
گوتی: توائهووو... ئەو کیژانە لەو ڕێیە دوورەدا ملوانکەیان پساوە و وا خەریکی پێوەکردنی میرووەکانین. یەکێ دەستی بۆ مەمکیان بردووە و ئەوانیش خۆیان ڕاپسکاندووە. هەر کەسێ بچێتە وەیل، میرووییەکیان بۆ پێوە دەکا و هێشتا بە نیوەش نەبووە. دوێنێ شەو، من میرووی خۆمم بۆ پێوە کردن. کە تۆش بێیتە ئەوێ، میرووییەکیان بۆ پێوەکە!
دەنگی کەڵەشێری پیرەژنتۆران هات و وەک کوتەک بەر کەللـەی سەرم کەوت. تەزووی سارد، یەک بە دوای یەکدا بە جەستەمدا گەڕان. دەبوو بڕوات و من ئیدی نایبینمەوە. بزەیەکی شیرینی کرد و گوتی: وەرە سەرت بخەرە سەر ڕانم. کەمێ پشوو بدە، ئەوجا من دەڕۆم... وەرە خەمخۆرە شێتەکەم، وەرە!
لار بوومەوە و سەرم خستە سەر ڕانی. بە باڵێکی داپۆشیم و دەستێکی خستە سەر سەرم. دەستی بە سەرمدا دەهێنا. زۆری نەبرد، چاووم قورس بوون... خەو لوولی دام. وەک هەڵم، بە ئەسپایی بەرز و نەوی دەبووم و ئەملا و ئەولام دەکرد. نازانم چەندی پێ چوو... چەند خەوتم؟ نازانم. باوکم و دوو خەلیفەی شێخ بەژوور کەوتن.
- جەنابی شێخ دەتیەوێت. دەبێ هەر ئێستا لەگەڵماندا بێیتە خزمەتی.
گوتم: جەنابی تەڕەماش منی بۆ چییە؟ ئەو دەڵە بەبایە چ کارێکی بە منە؟
بردیانم. بە حەیزەران هەموو جەستەم شین هەڵگەڕاوە. باوکم توند

گرتمی تا نەبزوێم. باوکم دڵسۆزانە گرتمی و دەگریا. یاشێخ، بیکەم بە قوربانی یەک شاپەڕی باڵی فریشتەکەم، دەنەڕێنێ: ناویان بڵێ!... ناوی ئەو کافرانە بڵێ!

نایڵێم! هەرگیز ناوی ناڵێم... بە کەس ناڵێم فریشتە ها لە وەیل! با کەس نەزانێ، نا! ئەگەر بزانن هەردوو گۆی چاووم دەردێنن، تا خوێن سەر نەبا... نا، خۆ ئەگەر بشزانن، خۆیانی لێ بە خاوە ناکەن... بۆ بیزانن؟ یا شێخ دەڵێ: جنۆکەی کافر چوونەتە پەڕەی دڵییەوە. ئاخر جنۆکەش کافر و موسوڵمانیان هەن... ناوی ئەو کافرانە بڵێ هەی کافر! ناویان بڵێ هەی زەندیق!

قەت نایڵێم! هەرگیز باسی فریشتە باڵشینەکەی وەیل بۆ شێخ ناکەم. هەرگیز باسی وەیل و ڕێگای وەیلی بۆ ناکەم... هەرگیز باسی ملوانکەی پساوی کچانی ڕفێندراو و فرۆشراو ناکەم. ئەو باسانە هەر بۆ خۆم چاکن. نە باسی چاوەکانی فریشتە بۆ شێخ دەکەم، نە باسی شاپەڕە شینەکانی. خەلیفەکانی شێخ، خەریکی بۆیاغکردنی سمێڵ و قژیانن و کوا دەپەرژێنە سەر باسی وەیل! با دانیشتوانی وەیل هەر لە دڵی مندا بن و کەس پێیان نەزانێت! با تەنها دڵی من وەیل بێت، دڵی من! جێیەکەیان گەرموگوڕە... با شێخ، قەت بە جێیەکەیان نەزانێ نەک لێیان بڕووخێنێت! با کەس بە جێیەکەیان نەزانێ نەک لە لای شێخ بیدرکێنێ. شێخ هەزار سەرەداوی بە دەستەوەیە... شێخ... تەپڵێکی ڕەشی دووسەرەی دوو ئاوازی هەیە. کە پێیدا دەماڵێ، شەیتان و کێنتاوری قوللەی قافی لێ گرد دەبنەوە و دەکەونە بەزمی سەرگەرمی... شەیتان و کێنتاورەکان، هەر یەکە و لە بن بنچکێکەوە دێنە دەرێ و بەزم دەگێڕن. منیش چاوەڕوانم بەرەو وەیل، بەرەو چارەنووسی خۆم گلۆر ببمەوە... چاوەڕوانم میروویەکی ملوانکەی کیژە تاڵانکراوەکانی جەلەولا پێوە بکەم...

***کێنتاور: گیانەوەرێکی ئەفسانەییە، نیوەی جەستەی ئەسپە و نیوەکەی دی مرۆڤە.**

# پۆستەر

ئێدی ئەوە ڕۆژگارە و ئامانی نییە. ڕۆژێ لە ڕۆژان، خاوەنی ئەم پۆستەرە، کە ساوا بوو، ئاوها گڕوگاڵی دەکرد: «گغغ...غ... قاابیت.... دااا... بڤڤ...» ئیدی تۆش ئازا بە و وەریبگێڕە سەر زمانی تەڵەکەبازان. بە ساوایی، سەر بە هیچ قەومێک نەبوو. وەک کورد پیتی (گ) دەگوت و وەک عارەب (غ) و وەک ئینگلیز (ڤ).

لە بەر خۆیەوە دەدوا. نا، بۆ من و تۆ دەدوا. ئێستاش هەر وا بۆمان دەدوێ. خاوەنی پۆستەرەکە نا، بەڵکو ئەوەی باسی پۆستەرەکە دەکا بۆمان دەدوێ. دەزانێ خۆشی زۆری نەماوە ببێتە پۆستەر. دەدوێ: «تەمەنێکە چاوەڕوانی گوێزانێکم لە ناو قاڵبە سابوونێکەوە لێم پەیدا بێ و لە کاتی خۆشوشتندا، ناولەپم یا جێیەکی لە ناولەپم هەستیارتر و ناسکتر شەقوپەق بکات و هاوارم لێ هەستێنێ. کزەی گوێزان ئازارێکی بەسوێیە. چۆن دەشێ لووسیی سابوون بە بێ سزا بە سەر بچێت؟. نابێ!. بۆ ئەو هاوارە ماووم و بۆ ئەو هاوارە دەژیم!. تەمەنێکە چاوەڕوانم لە کاتی بۆنکردنی گوڵێکی پەمەیی بۆنخۆشدا، زەنگەسوورەیەک، یا هیچ نەبێ

هەنگێکم لێ پەیدا بێ و بە نووکی لووتمەوە بدا، یا لەگەڵ هەڵمژینی بۆنی گوڵێکدا، مێشوولەیەک بە بۆڕی هەناسەمدا بچێتە سییەکانمەوە و وەک ترشەی ناتریک بیسووتێنێ. چاوەڕوانم لە ناو خەوێکی قووڵدا چەقۆیەک بە بنی دۆشەکەکەمدا بێ و بیسمێ و قەبەرغەم لەگەڵ خۆیدا کون بکات. چاوەڕوانم لێم ئاشکرا بێ کە دارا دوو داری نەدیوە و دەی دیوە و ئێدی هەرچیم لە سەر ئەو دوو دارە نەفرەتیەی پۆلی یەکەمی سەرەتاییم بنیات نراوە، درۆ دەرچێ و دارمێ و لە پۆلی یەکەمەوە، ئەمجارەیان لە دە دارەوە دەست پێ بکەم. دەبێ دیسان فێری پیتی (ە) ببمەوە. دەبێ دارا چەند داری دیبێ! کەس نازانێ دارا چەند داری دیوە. چاوەڕوانم گوللـەیەک بە سەر هێلێکی ڕاستدا بێ و کەللـەی سەرم بسمێ و لە چاوتروکانێکدا، هەموو جەستەم هەرەس بهێنێ... سەرم بە سەر شانمدا و شانم بە سەر بڕبڕەی پشتمدا و هەموانیش بە سەر چۆکمدا دارمێن و هەردوو چۆکیشم بچەمێن. چاوەڕوانم وەک تۆپەڵە قوڕێک دازایەمە سەر زەوی. چاوەڕوانم ئەستێرەیەک داچۆڕێ و چەقەکەی لێرە، لە سەر پێخەفەکەم جێگیر بێ، یا بروسکەی هەوری ڕەشی بەهار لە تەوقی سەرم بدا و بمکاتە خەڵووز. چاوەڕوانم بەیانییەک لە خەو ڕاپەڕم و بە چۆکی خۆمدا بکێشم: ڕووخانی سەددام و چوونەوەم بۆ کەرکووک، چ خەونێکی خۆش بوو!. خەون لە حەقیقەت خۆشترە، خەون تاکە شتێکە بە بێ چاودێر و ڕەزامەندی دەقە دەقگرتووەکان و چاودێرە چاوزەقەکان ئارەزوو جێبەجێ دەکات. چاوەڕوانم منداڵە کۆرپەیەکی چوار پێنج مانگان چاوە خڕ و گەشەکانی ببڕێتە ناو چاووم و تا دەمی دەگرێ تفێک بکاتە چارەم. چاوی منداڵ، هەموو ئەو نهێنیانەم دەدرکێنن کە لە خۆشم شاردراوەن. بەڵا کە گەورە دەبن، بیریان دەچێتەوە چییان لە ناخم دیوە. چاوەڕوانم... بەیانییەکی فێنکی هاوین هەردوو گۆی چاووم بەربنەوە سەر مێزەکەم و بەرەو ئەوسەری مێزەکە غل ببنەوە و منیش پەلاماریان بدەم تا نەکەونە سەر زەوی و ئەوجا بەرەو مەنهۆڵەکە گلۆر ببنەوە و بۆ هەمیشە بزر

بن. كە دەیانگرمەوە و لە جێی خۆیان دایاندەنێمەوە، هەر تاكەوتاك دایاننەنێمەوە بەڵكو نیوەی ڕەشێنەی ڕاستم لە لای سەرەوە دیار بێ و ئەوی دی لای خوارەوە. یا ڕەشێنەی یەكێكیان بكەوێتە لای پشتەوە. چاووم ئاوهاش بن، لە قرپۆكییان چاكترە. خۆ كەس پێم نالّێ: یا خوا پیرۆزت بێ، چاوی شووشەت كردووە! یا: چاوە شووشەكەت ناخورێ؟ یا ناسورێ؟ یا سەد پرسیاری قۆڕی دی، كە مەگەر هەر چاوشووشە بزانێ وەڵامیان بداتەوە. چاوەڕوانم لە بەهەشتێكی ئارامدا كە تیایدا، جەستەی ڕووتی لووسكە و نازداران، وەك گەوهەری پەرتكراو، بن دارەكان و دەم جۆگەكان تیشكباران دەكەن، لە هەورێكی تەنكەوە، كە وەك تارا ڕوو و ڕوخساری خۆری بەهاری جیهانی بەهەشت دادەپۆشێ، دووپشكە ببارێ و بە سەر ئەو جەستە نازدارانەدا بكەون... دەترسێم بە سەر جەستەی ڕووتی منیشدا بكەون. بە سەر سەرمدا بكەون و هەر یەكە و لە لایەكەوە چزەم لێ هەڵسێنێ. دووپشكە! ترسهێنەرترین خەلقەندەیە. لەبەر ژەهرەكەی ترسهێنەر نییە، بەڵكو هەر شێوەی ترسهێنەرە. ناشیرینە و لاقی زبرە و ختووكەیەكی تۆقێنەر دەگەیەنێتە پێستی مرۆ. دەڵێن دووپشكە و مشك و مار و سیسرك دەسكردی ئەهریمەنن نەك ئەهورامەزدا. چۆن دەبێ ئەهورامەزدا شتی وەها خراپ دروست بكا!. تەنانەت هەندێ نووسەر و بیرمەندیش، ڕەنگە دەسكردی ئەهریمەن بن. وا نەبێ، ئەو سیسرك و دووپشكانە چین لە زاریانەوە دێنە دەرێ و ختووكەی تۆقێنەر بە هزر و هەستی مرۆ دەگەیەنن؟ ئەهورامەزدا گوڵ دروست دەكا و ئەهریمەنیش زەنگەسوورەی لێ پەیدا دەكا. ئەو، سابوون دروست دەكا و ئەم گوێزانی تێ دەهاوێ. ئەو سەر دروست دەكا و ئەم گوللـەی بۆ دەنێرێت. ئاخ كە لە كاتی دەمودوومدا لەگەڵ ئەهورامەزدادا، چۆن ئەهریمەنیش بە گاڵتەپێكردنەوە لێم پەیدا دەبێ و چاو دادەگرێ! لێناگەڕێ بە دڵی خۆم قسان بكەم و بڵێم: ئەی بەخشندە مەزنەكە، بمبەخشە!. لێ ناگەڕێ لە یەك كردەی ناشایستەی خۆم ژیوان ببمەوە و بۆ كاری ناشایستەتر،..

پشتم دەگرێ و هانم دەدا تا گۆزەکەم لە ڕێی کانیدا بشکێت و ئەوجا تا دەمی دەگرێ، جرتێکم لێ بکێشێت. بەرەو دیوی تاریکی بوون هانم دەدا و لە ئێزدانم دوور دەخاتەوە. بەرەو لەزەتی جەستەم دەبا!. لێ ناگەڕێ دڵنیابم کە (هەرچی نەفس ویستی، بۆ بنیادەمەکە خۆی، زەرەرە). لەزەتی هەموو تەمەنی جەستە کۆ بکەیتەوە و لە یەک چرکەدا بیانتەقێنیتەوە دەتکوژێت. لەزەت کوشندەیە. بە ددانهێشەیەکیش، هەموو ئەو لەزەتانەی تەمەن، کە دەستت پێیانەوە گرتووە یا لە بیرت ماون، لە بیر دەچن و دەسڕێنەوە و دەبنە هیچ... هیچ... ئەوجا بەنجێک، دەبێتە سەروەری هەموو لەزەتەکان. نا، لەزەتی هەموو دنیا ئەوەندە ناهێنێ ددانهێشەیەکی پێ بدەی!. ددانهێشە، یەکێکە لە ئازارە بچووکەکانی ژیان.

چاوەڕوانم لە ئازادیدا، بە هەناسەبڕکێ، بە دووری بەندیوانی خۆمدا بگەڕێم و بە عەشقێکی ئاگرینەوە دیواری بەندیخانەی خۆم دروست بکەم و زنجیری پیلم خاوێن بکەمەوە. من کەی دەتوانم بە ئازادی، بەو هەموو شەقامە زۆر و درێژانەدا بڕۆم و بگەڕێم و کەس نەبێ پێم بڵێ کێوە دەچیت یا نابێ لێرەوە بڕۆیت!. من لە کوێ دەتوانم بە ئازادی ئەو هەموو سەیرانگە و باخچە و شوێنە جوانانە بگەڕێم و بیر لە بەندیخانە و ددانهێشە و ئازاری گورچیلە نەکەمەوە!.

من دەترسێم لە هەموو (خۆش)ێک و لە هەموو (ئارام)ێک و لە هەموو (جوان)ێکدا، ناخۆشی و بشێوی و ناهەمواریم لێ پەیدا بن. لە جیهانێکی لووسدا دڕک و گوێزان بە مۆخ و خەیاڵمدا دەچن و لە ماچکردنی نازدارێکدا بەردبارانم لە بیرە. لە گەشتوگوزاردا دەربەدەری و لە ئاهەنگدا شیوەن و لە ماچی ناو دەمدا خیانەت و لە شۆڕشدا جاشایەتی و لە سەر بەرماڵ قومارخانە و لە چارەی پیردا قومار و لە هاویندا بەستەڵەک و لە بەهاردا پایز و لە ڕۆژی ڕووناکدا شەوەزەنگ و لە بزەی منداڵدا گەڵبەی گورگ و لە ڕدێنی شارەزایانی ئایندا شارەئەهریمەنم بیر دێنەوە. بۆ دەبێ بەرانبەر جوانیی ئەهورامەزدا، ئێسکی گرانی ئەهریمەن هەبێ و لێنەگەڕێ جوانی

ئەهورامەزدا، لە هەموو شتێکدا ڕەنگ بداتەوە؟. بۆ؟.
کامیان چاکترە: ئازاد بم و هەترەشم لە دیلێتی چووبێ، یا دیل بم و هیوای ئازادی لە دڵمدا گۆپکە بکا و پێی بژێم؟. هەمبێ و وەک شێت بەرگری لە هەبوون بکەم یا نەمبێ و خەونی خۆش بە بوونەوە ببینم؟ لە ڕۆژی نیوەڕۆدا لە شەوەزەنگ بترسێم یا لە شەوەزەنگدا گزنگی خۆرم لە بیر بێ!. سەرزەمینێکی پڕ دووپشکە و گوێزان باشترە کە تیایدا، لە قووڵایی ڕۆحەوە بیر لە گوڵزار و چەمەن بکەمەوە یا چەمەن و گوڵزارێک کە هەمیشە بترسێم توولەمارێک یا دووپشکەیەک لە بن بنەگوڵێکەوە لێم دەرکەوێت!. لە ناو لەشکری ئێزدان بم و لە ترسی لەشکری ئەهریمەن ئۆقرەم نەبێ یا سەربازی ئەهریمەن بم و بە نیازی بەخشندەیی ئێزدان بم؟. چەندین چاودێری شێتوێت لە ناخمدان! ئەم چاودێرانە، ئەرکی ڕاستەقینەی خۆیان بەجێ ناگەیەنن... یا هەر دەبێ ئاوها بە جێی بگەیەنن!. ئەمانە، وەک کەڵەشێری ناوەخت، لە ناوەختدا ئاگادارم دەکەنەوە. لە بری مژدەی بەیان، لە بەیاندا هەواڵی شوومی شەوەزەنگی شەوی داهاتووم دەدەنێ. ئەمانە لە هەنگ دەمترسێنن تا لەزەت لە بۆنی گوڵ نەکەم. لە ڕاستەڕێدا، جەردەم لە بیرە و لە پێکەنیندا قوڵپەی گریان. من نازانم ئازاد بم. من ناتوانم خۆم بڕیار بۆ خۆم بدەم. چەند ڕێی هەڵبژاردنم پتر بن، داماوترم. من هەم تا کەسێک پێم بڵێ: ئا ئەمە جێتە و ئەمە ئەرکی سەر شانتە!. دەبێ کەسێ هەبێ پێم بڵێ: ئەرکی تۆ ئەوەیە قۆندەرە بۆیاغ بکەیت! بڕووخێ ئەو ئازادییەی کە لە داهێنانی مرۆڤە فێڵبازەکانە!. ئازادی پێچەبەدەورەیەکی زۆرزانانەیە بە دەوری کۆیلایەتیدا... گۆڕینی کۆت و زنجیری کۆیلەیە، لە قەید و ئاسنی ژەنگنەوە بۆ زیو یا زێڕ!. ئازادی ئاواتی خەڵکە لاواز و ترسنۆکەکانی کۆمەڵگەی سەرزەمینی گورگستانە!. ئەوانەی گۆشتنەخۆرن خەونی پێوە دەبینن. ئەوەی نەتوانێ ملی کەس بشکێنێ، بۆ ملنەشکاندنی خەڵکی، ملی خۆی بە شکاندن دەدا. لەوەتەی مرۆ هەیە، ئەوەی ویستبێتی کەس

هەڵنەواسرێ، یا هەڵواسرا، یا دەستی کرد بە هەڵواسینی ئەو خەڵکانەی لەگەڵیدا بۆ نەهێشتنی هەڵواسین دەژیان و دەمردن. بێ دینترین کەس ئەوانەن کە دین دەکەنە ڕێبازی بەشەر. ئاخ لە دەست مرۆڤی قومارباز... هەر خۆی بەزەیی هەیە و هیچ دڕندەیەکیش ناگاتە دڕندەیی خۆی. بە هەردوو باردا، زێدەڕۆیی. دەیەوێ لە بەزەییدا بگاتە ئەهورامەزدا و لە دڕندەییدا بگاتە ئەهریمەن. چۆن ئەم دووە دژ بە یەکە، لە یەک ڕۆح و یەک جەستە و یەک جیهاندا پێکەوە دەبن؟. چۆن کار ناکەنە سەر یەکتر؟ کفرم کرد مەمکێکی توندم گرت، ئیدی مەمکی توندم لێ بوونە نارنجۆکی پڕ لە بزمار و لەتە گوێزان و گڕی فۆسفۆر.: هەر دەستی بۆ بەرم، پێمدا دەتەقێتەوە. کفرم کرد بۆنی گوڵێکی جوانم کرد، ئیدی هەموو گوڵێک پڕ بوو لە ئەژدیهای حەوتسەر و گەردنیان بۆم بەرز کردۆتەوە. کفرم کرد جارێ بە گوێی ئەهریمەنم کرد، ئیدی چاودێری ناخم ئاگادارم دەکاتەوە: گوللـەیەک دێت، بە سەر هێڵێکی ڕاستدا بە تیژی دێت و کەللـەی سەرت دەسمێ. دەبێ خۆشی و ئارامی و ئازادی و جوانی هەڵبێنمەوە. نابێ هیچیان لە ناو ئەم قاوغەدا بمێنێ کە دەبێ تەنها بۆ ڕۆح و جیهانی جنۆکان چۆڵ بکرێ و لە خزمەتی ئەهورامەزدادا بێ. دەبێ ئەم جەستەیە وەک سەگی بەرەڵا لە سەر زبڵدان وەرکەوێ و بستێک زمانی شۆڕ بکاتەوە تا بیر لە سێبەر و تەڕایی زەوی بکاتەوە. کامیان بەهەشتە؟ لە سەر نوێنێکی پاک، لە بەر کۆندیشن پاڵ بکەویت و لە ترسی لەدەستدانی ئەوەی هەتە خەو نەتباتەوە، یا لە سێبەری ماڵێکدا کە ژنێکی دڵنەرمی تێدایە و تا سەعات سێی دوای نیوەڕۆ چاوەڕوان بیت بە منداڵێکدا دۆڵکەیەک بەفراوت، بە خێری کێری مێردەکەی بۆ بنێرێ؟. کامیان باشە: نازدارێک هاونوێنت بێ و لەوش بتۆقیت خیانەتت لێ بکا، یا دەڵەدێوێک هاونوێنت بێ و بیر لە خیانەت و نازداران بکەیتەوە؟. ئاخر خیانەت تێکەڵی خوێنی مرۆڤە. هەستت بەوە نەکردووە کە بەفراوی بەر کۆندیشن وەک بەرد بە گەرووتدا دەچەقێ و ئاوی مەیلەو ساردی بەر گڕە و

گەرما، لە کاتی ماندوێتی و تێنوێتیدا، مەڵهەم ئاسا، هەر دەڕوا و دەمار بە دەماری ناوەوەت نەرم و تەڕ و ئارام دەکاتەوە؟ دەنگ و هەرای شەقامەکە لایلایەت بێ و خەو بە شێوەیەک سواری سەرت بێ ئاواتەخواز بیت گەرما و دەنگ و هەرا کۆتاییان نەیات. خەوبینینی ئەو سێبەرە لە خەوزڕانی بەر کۆندیشن و ئامێزی نازدارێک خۆشتر نییە؟!. خۆ گڕە و گەرمای خۆرت لە دەست ناچن. خۆ دەڵەدێو خیانەت ناکات. مەترسیی خیانەتکاری لە نازداران دەکرێت... هەمیشە هەوڵیان لەگەڵدا دەدرێ تا بە داوی خیانەتەوە دەبن. ئەوجا ترۆ دەکرێن. خەیاڵ و حەقیقەت بوونی ڕاستەقینەی منن. جەستە و ڕۆحمن. کێشەی من لەوەدایە کە نازانم حەقیقەت حەقیقەتە یا خەیاڵ. کە لە دەست بکوژان ڕامدەکرد بە هیوای دەربازبوون بووم و هەوڵم بۆی دەدا و دەمار بە دەماری جەستەم لە پێکەنین و خۆشیدا بوون، کەچی کە دەرباز دەبووم، دەترسام مار پێمەوە بدا، یا لە شاخێکەوە هەڵدێرێم. یا دیسان لێم پەیدا بنەوە و ئەو جارەیان دەسگیرم بکەن. دەترسام، لە پێچێکی ڕێگای سەفەری نێوان هەموو سەرەتایەک و کۆتاییەکدا، هەر سەرەتا و کۆتاییەک، کە درێژایی بوون دەگرێتەوە، لێم پەیدا بێ: لە ڕەبییەی سەر گردێکەوە، گوللـەیەک بە سەر هێڵێکی ڕاستدا بەرەو ئەو دۆڵە بێ کە خۆم تێیدا، وەک مشک حەشار داوە، بێت و کەللـەی سەرم بسمێ. ئەوجا پروشکەکانی مۆخم وەک هێلکەی ئەهریمەن، بترووکێن و دنیا پڕ کەن لە ئەهریمەنی ماندەری خیانەتکاری. ئەهریمەن دەتەرەکێ یا هێلکە دەکا!. هەیە دەڵێ دەترەکێ و هەیە دەڵێ هێلکە دەکا، هی واش هەیە دەڵێ: هیچیان!. من چوزانم کێ ڕاست دەکا!. تۆش بۆ خۆت ڕمڵی بۆ لێدە و بەڵگە بهێنەوە: ئەهریمەن، وەک جاسووس، کە لنگی پێکدا دەدا، هەر جارە و چل بەچکەی دەبێ!. بەڵام ئایە ئەهریمەن ئامێری مێیاتی هەیە یا نێراتی؟!. ئایە ئەهریمەن دەمیزێ؟. خۆ گومانکردن لە بوونی ئەهریمەن، گومانکردنە لە کردگار، گومانە لە ئێزدی زەروانی و سەرمەدی. گومانکردن لە بوونی ئەهریمەن،

گومانکردنە لە بوونی ئێزد و ئەمەش خەتایە. خەتایەکە، سەرچاوەکەی باوەڕە بە هەقخوازی و ڕاستگۆیی. گومانکردن لە ئازار، گومانکردنە لە لەزەت. گومانکردن لە مەرگ، گومانکردنە لە ژیان... پێچەوانەکان بە بێ یەک هەڵناکەن بۆیە بە بێ جاسووس، پێشمەرگە واتای نییە و بە بێ گوێزان سابوون نرخی خۆی لە دەست دەدا و بە بێ ئەهریمەن، ئێزدان بێ کار دەمێنێتەوە.
ئەوەی بیر نەکاتەوە شێت نابێ. قەت شێت نابێ، بەڵام بۆی هەیە هار بێ! بۆی هەیەی چی!. ئەوەی بیر نەکاتەوە هار دەبێ و خەڵکی تریش هار دەکا.قسەی منداڵ گڕوگاڵە و قسەی شێتیش وڕێنەیە. لە نێوان ئەو دووەشدا فەلسەفە هەیە. نا، قسەی ئەو نێوانە، وەک هێستر، کە نە کەرە و نە ئەسپە، لەدایک دەبن. قسەی ئەو نێوانەش نە وڕێنەن نە گڕوگاڵ!. هەر وشەیەک کە دەگوترێت، بۆمبێکە و بە بابەتێکدا دەتەقێتەوە. پلانێکە بۆ بەدەستهێنانی شتێک و ملشکاندنی کەسێک. هەر وشەیەکی نێوان گڕوگاڵ و وڕێنە پیلانە، درۆیە، قومارە، گزی و فێڵە و ئەم لەوی دەکات و ئەو لەم. تەڵەیەکە و بۆ دەسکەوتێک دەنرێتەوە. بزەی ئەو نێوانە، گەورەترین پلەی پێگەیشتنی خەتی ئەهریمەنە. قسەی ئەو نێوانە فەرمانی سەربازییە بۆ قڕکردن و سووتاندن و بەرەڵاکردن و دەسبەکاربوونی دێوی گڕکان و ئەنفال. ئەنفال، ئا ئەنفال... ئەنفال. هەر هەنگاوێک کە دەینێین، دەیان هەنگاو لە لایەکی حەقیقەتی خۆمان دوورمان دەخاتەوە... بەرەو ئەهریمەن. نا، ئەوەی بیر نەکاتەوە شێت نابێ و ئەوەی شێت نەبێ ئاینی خۆی ناگۆڕێ. منداڵ و شێت بێ ئاین و بێ بنەما و بێ وڵات و بێ نەتەوە و بێ مایە و سەرمایەن بۆیە ئەویان گڕوگاڵ و ئەمیان وڕێنە دەکا. تۆ، کە نە گڕوگاڵ دەکەیت نە وڕێنە، لە ئاینی خۆت بێزاریت و کرکەوتنت بە دیارییەوە ڕەت دەکەیتەوە، ئەوانەی لە لووتکەی پیشکەوتندان و بیر دەکەنەوە، ئاینەکەی تۆ لە مل دەکەن. ئەوانە شێت نین؟. تۆ کە وڵاتی خۆتت ناوێ، ئەوان دێن ئاوەدانی دەکەنەوە و جوانی دەکەن، یا دەیکەنە زبڵدانی

خۆیان. ئەوان، ئەوەی نیانە گەرەکیانە و تۆش ئەوەی هەتە گەرکت نییە. جیاوازی تۆ و ئەوان هەر ئەوەیە. بەڵام خۆ ئەوانیش بێزارن لەوەی کە هەیانە، کەچی بە دەست و ددان گرتوویانە و نایانەوێ لە دەستی بدەن. نایانەوێ کەس لێیان زەوت بکا. لە دەستی نادەن تا ئەوەکەی تۆی لە سەر بروێنن. هەر ئەو باوەڕەی کە تۆ وێران دەکا، دڵ و دەروونی ئەوان ئاوەدان دەکاتەوە. چ سەمەرەیەکە ئەم بڕوایە!. چ کۆڵانێکی تەنگەبەری فەلسەفە ها لە مەتەڵەکانی ئەو بڕوایەدا؟.

کە هاوار بۆ ئێزدان دەبەم، ڕاستەوخۆ وەڵامم ناداتەوە. ئێدی لێی یاخی دەبم. دوای چل ساڵ دەبینم چاکی کرد وەڵای نەدامەوە. وەڵامی منی دابایەوە، دەبوو ئێستا وەڵامی زەریای خوێن بداتەوە. ئەوەی کە لە هەرزەکاریدا ئێزدان وەڵامی دایەوە و بە دەنگیەوە چوو، ئێستا داوای بەلەمێکی لێ دەکا تا لەو زەریا تاوان و خوێنە پێی بپەڕێتەوە کە خۆی بۆتە هۆی بەرپاکردنیان. لە هیچ کوێ جێی نابێتەوە. ئەگەر ئێزدان بە دەنگیەوە نەچووبا، ئێستا وەک من و تۆ لە کونە ڕێوییەکدا جێی دەبووەوە. ئێستا دەیتوانی بە بازاڕدا پیاسە بکا و لەگەڵ ڕۆحی خۆیدا بدوێ و لە بەر گڕە و گەرمادا، لەزەت لە ئاو بکات و بە دڵی خۆی بنوێ. یا لە چلەی زستاندا، بە غازاتی خۆی، جەستەی خۆی گەرم ڕابێنێ و تێر بنوێ. سەرما بەرهەمهێنەری غازاتە. جێی گەرموگوڕی زستان، وەک جێی فێنکی هاوین، خەوزڕانی بە دواوەیە.

ئەمە هێڵی نێوان گڕوگاڵ و وڕێنەیە یا یەکێکە لەو دووە. من گەرەکمە بە سەر ئەو هێڵەدا بڕۆم و بە پاکژیش بمێنمەوە. دەبێ؟. شتی وا دەشێ؟. هەر کە لە سنووری گڕوگاڵ دەرچوویت و یەکسەر نەچوویتە ناو مەملەکەتی وڕێنەوە، بە پاکژی نامێنیتەوە. فێری بزەی درۆ و قسەی درۆ و پێداهەڵدانی درۆ دەبیت. من گەرەکمە لەو سنوورە دەرچم و نەشچمە ناو مەملەکەتی وڕێنەوە و پاکژیش بم. ئەمە دەبێ؟. ئەوەی زانی بە ڕووی کەسێکدا بزە بکا کە ڕقی لێیەتی، ناتوانێ پاکژ بێ، ناتوانێ لە سنووری

گرۆگاڵدا بمێنێتەوە و ناشتوانێ بچێتە سنووری ورێنەوە. ئەوە ناتوانێ پاکژ بێ، نا».

بۆ من و تۆ دەدوێ. دەنگی لە بن باڵی هەورەکانەوە دێ. تۆ گوێت لە دەنگی نییە؟. ئەو فەقیرە شەهید بوو. لە شەهیدبوونی خۆی ژیوان بۆتەوە. ئەو فەقیرە، نە لەیلای هەیە نە کارتێک، کە بیکا بە هەموو کونێکی قەدەغەدا. کونی قەدەغەش زۆرن... زۆر زۆرن. هەموو کونەکان، لە هەموو شەهیدەکان داخراون. شەهیدەکان خەریکی خۆرێکخستنن بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕەحەتبوونی سەرەتای ئەم سەدەیە. بەڵام مادام نازانن لە ڕێی ئینتەرنێتەوە ڕەحەت بن، ڕێی گەڕانەوەیان نادرێ. بێ خەم بن. با ئەوانەش بێ خەم بن کە لە گەرمەی شۆڕشدا وەرەقەی موخابەراتیان لە کەتتافییەی شانیاندا قایم دەکرد. با بێ خەم بن، فایلیان لێ ئاشکرا نابێ. ئەوەی ئاشکرایان دەکا، خۆی سەد فایلی هەیە. دەیگوت:

من خۆم و ئێزدان، ئەگەر زمانی نێوان گرۆگاڵ و ورێنە لێکەڕێین، پێکدێین. دەزانم بە توندیی، لە سەر بچووکترین تاوانێک کە ئەنجامم دابێ، خۆم سزا بدەم. زمانە درێژەکان و یاسا لاستیکەکان چییان لێم دەوێ و بە چ مافێکەوە سزام دەدەن؟. ئەوەی بڕیاری سزا بە زاریدا دێ، لەو ساتەوەختەدا بیر لە تاوانە گەورە و گچکەکانی خۆی ناکاتەوە؟. کە ژنێک لە سەر داوێنپیسی سزادەدا، بیر لە خۆی ناکاتەوە لە هەڕەتی هەرزەکاریدا دەستدرێژی دەکردە سەر پشیلە و سەگ و تەماحی دەچووە دایکی خۆی؟. لە بیری چوو کە بابی، گەورەترین دوژمنی بوو؟ خۆ بڕیاریش کەوتۆتە نێوان گرۆگاڵ و ورێنەوە. بڕیاریش، بڕیاریش، بڕیاری دادگاش، لە ناو بازنەی درۆ و قۆڵبڕیندا دەخولێتەوە. کەس ناتوانێ لە وردە داوی یاسا و دادگا دەرباز بێ. هەناسەدان بێ یاساییە. دەیگوت:

بەردێک، لە جێیەکی ئەم جیهانە پان و بەرینەدا کەوتووە. ملیۆنان ساڵ لەمەوبەر، ئەو کاتەی هێشتا زەوی هەڵمی لێ هەڵدەستا، لە قوڕگی ئاگراویی گڕکانێکەوە، بە تواوەیی دەرپەڕیوە و بە ئاسماندا چووە. لە

ئاسمان خڕ بۆتەوە و کەمێ سارد بۆتەوە و وەک گونکە هەویری کەمێ توند، بەربۆتەوە. نابینن زۆرینەی ئەو بەردانە بە شێوەیەک لە شێوەکان پانن؟ ئێدی ئەو بەردە، ئەوە جێیەتی. ئەوە چارەنووسێتی. تۆش بە نووکە شەقێک جێیەکەی پێ لەق دەکەیت و چارەنووسی دەگۆڕیت. تۆ بۆ ئەوە هەیت، ئاوها جێ تێکبدەیت و بەرد لە جێی خۆی هەڵکەنیت. تۆ ئەگەر بە خۆت بەرد نەبیت پلانی ملیۆن ساڵەی سروشت تێکنادەیت. کە بەردیش بیت، تۆش بەر نووکە شەقێک دەکەویت و لە جێی خۆت هەڵدەکەندرێیت. شەقی گەورە، بەردی گەورە هەڵدەتەکێنێ. شەقی گەورەی ڕەها، هەموو شتێک لە جێی خۆی، بە تۆشەوە، هەڵدەتەکێنێ.
من چیم؟ من بەردم. من شەقم. من، مندالم. من گڕوگاڵکەر و تەماشاکەری شەڕی نێوان سەردەمی گڕوگاڵ و وڕێنەم. سام و حام چ قوڕێکیان گرتەوە؟. قابیل چ میراتێکی بە جێهێشت! ئوتنەپشتیم، ملی بشکابا و ئەو کەشتییەی دروست نەکردبا کە لە لافاوی دەرباز کرد. خواناس، لە ئەهریمەن پتر ئازار بە بەندەکانی ئێزدان دەگەیەنێ. من خەریکی ماتماتیکی نائیکلیدی و هاوکێشە ئالۆزەکانی بۆشایی ڕەها و مەحاڵبوونی هاوتەریبیی دوو هێڵم، تۆش لە بڵندگۆیەکەوە دەشرێنی: بابم، بەردی گوشیبا ئاوی لێ دەردەهێنا. ئیسرافیل بە قامچی بەربۆتە گیانی هەور، ئاگر و بلاچە و گرمەی لێ هەڵدەستێنێ و ئەویش ئەشک دادەبارێنێ. ئەم قسەیەت لە کوێوە هێنا؟. ئەمە وڕێنەیە یا گڕوگاڵ؟ تۆ پەڕوباڵی هەرچی فڕۆکەی جەنگی هەیە، بە یەک قامچی ئیسرافیل دەسووتێنیت. بیسووتێنە، بی!
ئەو ڕۆژەی، خاوەنی ئەم پۆستەرە ویستی خۆی لە سەرباز و جاش بشارێتەوە، بە زگەخشکێ بەرەو بن دارتوویەک ڕۆیشت. زۆر بە چڕیی بیری لە ژیان و مانەوە دەکردەوە و دەخشا... بە چڕ و پڕی دەژیا و هەر چرکەیرکی ڕووداوی ساڵێکی لە خۆ گرتبوو. تاڵە مووەکانی سەریشی، لەو ساتە پڕ مەترسییەدا بە خێرایی درێژ دەبوون. دەیزانی جاش و

سەرباز چاو دەبڕنە دارە چڕەکانی دۆڵەکە و کەس بیر لەو تاقە دارە تەریکە ناکاتەوە، کە کەوتۆتە لێوارەوە. چۆلەکە و کوکوختی سەر دارەکە هەستیان پێ کرد و هەموویان بە جارێ هەڵفڕین. نەدەکرا یەکەیەکە، بە تەگبیر هەڵفڕن؟ بە زیقەزیق و هاژەی باڵیان و شەپەشەپی گەڵاکان، ڕاپۆرتیان لێ دا و سەرباز و جاشیان لێ ئاگادار کردەوە. لە بەر خۆیەوە گوتی: چۆلەکەکان جاسووسن... کوکوختییەکان جاسووسن... گەڵاکان جاسووسن و خەبەرم لێ دەدەن! یەکێ لە جاشەکانیش، بە هاوڕێکەی خۆی گوت: زەڵام لە بن ئەو دارە خۆی شاردۆتەوە. با بچین بیگرین. ئەوی تر وەڵامی دایەوە: نا، زەڵام نییە. کەرێک لەو نێزیکە بەستراوەتەوە و لەگەڵ پرمەیدا چۆلەکەکان هەڵفڕین. کە خاوەنی پۆستەرەکە گوێی لێیان بوو، تووڕە بوو: من کەرم؟. هەستایە سەر پێ و تا تینی تێدا بوو هاواری کرد: «خۆت کەر و کوڕی کەریت!» بە ڕاستی کەربوون و مردن کامیان چاکترە؟. خاوەنی پۆستەرەکە چ بەڵگەنامەیەکی لە کەتافییەی کراسەکەیدا نەشاردبۆوە، بۆیە دەبوو بمرێ. دەبوو ببێتە پۆستەر. کە تەماشات دەکرد، لەمڵا و ئەوڵای سەریەوە گوڵت دەبینی و ناوی حیزبت لە سەر سینگی دەدی و لە سەری سەرەوەش، دروشمی حیزبەکەی. بەڵێ هەر بۆ ئەوە ڕاگیرابوو ببێتە پۆستەر و لە هەموو لایەک هەڵواسرێ. یەکێ لە جاشەکان ویستی ڕێبزری بکا تا ئەو زەڵامەی بن دارەکە دەرباز بێ، بەڵام ئەو خۆی دەیویست لە چاوترووکانی مەرگدا، لە سەر پەتی سێدارەدا، بە چرپی و بە لەزەتەوە بیر لە ژیان و بەپۆستەربوونی خۆی بکاتەوە. ڕەنگە ویستبێتی لەوێ بیر لە لەزەتی دەربازبوون بکاتەوە. یا خۆی نەیدەویست دەرباز بێ. بۆ دەرباز بێ؟ بۆ ئەوەی نووکە شەق لە بەرد بدا و جێی ملیۆنان ساڵیان لێ تێک بدا. تاوێرەشاخێکی قوڕبەسەر، ساڵی یەک هەناسە دەدا. زستان هەڵیدەمژێ و هاوین دەریدەپەڕێنێ. دڵیشی ساڵی یەک جار لێ دەدا. ئەو تاوێرە گیاندارە وایە بۆیە تەمەنی درێژە. ئەویش بچێ بە دینامیت هەڵیکەنێ و هەناسەی ببڕێ، تا کۆشکێک، بە

کۆندیشنەوە دروست بکا و لە بەریدا خەوی بزڕێت؟. نا، ئاوهای باشترە.
ئەو وا لە سەر دووڕیانێکدا: یا دەبێ بکرێتە پۆستەر و بە شان و باڵیدا
بگوترێ، یا دەبێ لە بەر کۆندیشن خەوی بزڕێ و بە لێشاو نەفرەتی بۆ
بچێت. چاکتر وایە بمرێ و نە بەر نەفرەت بکەوێ نە کەر بێ!. چاکتر
وایە لە ناو جیهانی مەرگەساتدا بیر لە ژیان بکاتەوە. با خەڵکی دی لە
گەرمەی ژیاندا بیر لە مەرگ بکەنەوە... با کەتافیە ئەستوورەکان، لە
ترسی ئاشکرابوونی فایل، هەموو ڕۆژێکیان مردن بێ و هەموو ڕۆژێ بگەنە
لێواری مەرگ و بەرەو ئازاری ژیان بگەڕێنەوە.
کە گڕوگاڵ دەکەیت، سەرنجی هەموان بۆ لای خۆت ڕادەکێشیت و هەموان
خۆشیان دەوێیت. خۆ هیچیش ناڵێی. خۆشویستنەکە هەر لە بەر ئەوەیە
کە هیچ ناڵێیت و هەمووشتێکیش دەڵێیت. کاتێ دەبی بە خاوەنی ڕستەی
تەواو، ئیدی ئێسکت گران دەبێ. چەند ڕستەکانت چڕ و پڕ و ڕەوان بن،
ئەوەندە ناحەزت زیاد دەبن، جا ناحەزی گەورە گەورە!. کە وڕێنەش
دەکەیت، بەزەیی هەموان دەبزوێنیت. خۆ وڕێنەش بە دەگمەن ڕستەی
تەواوی تێدا دەبێ. هەر لەبەر ئەوەی نازانی وەک هەموان ڕستەی درۆ
دارێژی، بەزەییان دەبزوێنیت. لەو نێوانەشدا، لە نێوان گڕوگاڵ و وڕێنەدا،
قێز و ڕق و گومان هەموو دەورووبەرت دەگرنەوە. کە سەردەمی گڕوگاڵ بە
سەرچوو، چاکترین شت وڕێنەیە. وڕێنە وەک گڕوگاڵ پاکژە و لە پاکژییەوە
سەرچاوە دەگرێ. خاوەنی ئەم پۆستەرەش لە سەرەمەرگدا و بە دەم
دوا ئازارەکانی ژیانەوە، وڕێنەی دەکرد. خاوەنی پۆستەرەکە دەیگوت:»
چۆلەکەکان جاسووسن. جاسووسەکان چۆلەکەن.
کوکوختییەکان جاسووسن. جاسووسەکان کوکوختین.
من چۆلەکە و کوکوختیم هەڵفڕاند. کوکوختی و چۆلەکە منیان هەڵفڕاند....»
کە چاویشی لێکنان و باری گران و ئازاری بەسوێی ژیان لە سەر شانی
لاکەوتن، بزەی بەختەوەری کەوتە سەر لێوی و حەسانەوە لە سیمای
دەباری. دەتگوت بە بەنجێک، ددانهێشەی لەکۆڵ کراوەتەوە.

# ماستی ڕەش

منداڵەکە بە ئامێزی دایکیەوە بوو و تەماشای دواوەی دەکرد. چاوی چەپی لە سەر ڕوومەتی بوو و چاوی ڕاستی بە لای ڕاستی تەوێڵیەوە بوو. پێکەوەی دەکردنەوە و پێکەوەی دەترووکاندن. لە بری ئەوەی هەردوو باسکی لە ملی دایکی بێ، باسکێک و لاقێکی لە ملی کردبوو و باسک و لاقەکەی تری، شۆڕ ببوونەوە. باسکی ڕاستی و لاقی ڕاستی جێگۆڕکێیان کردبوو. لە سەر ئەو بەدگۆڕانەشەوە، لوویەکی ڕەش و گەورەی هێندەی هێلکەیەک، یا گەورەتر، بە لاملیەوە بوو و نەختێ بەرەو بن قورگی دایدەشکاندەوە. پێستی لووەکە، چرچولۆچی زۆری تێدا بوون و بە بەریەوە هەبوو هێندەی سەرینێک گەورە ببێ.

ژن و مێردەکە، بە منداڵەکەیانەوە بەرەو شەقامی (حەکیمان) دەچوون. کە لەل فلکەی (ئاتا) تێپەڕین، بە ڕاست و چەپدا دەیانڕوانی و ناوی حەکیمەکان و شادە و پسپۆڕییان سەح دەکردنەوە: نیعمەت درزەیلی - برینکاری لووی ماستی ڕەش. نەجدەت مەخموورلی - گۆڕێنێ کۆئەندامی زاوزێی نێر بۆ مێ. مەلا سوڵتان دارەتوو ئۆغڵو - مارەبڕێنێ دایک لە کوڕ

و کیژ له باب. کۆمپانیای ناشتن و تەقەتکردنی خۆکوژە بەکۆمەڵەکان. کۆمپانیای بەرزەوتکردنی شێتەکان...

خەلقەندەی سەیر و سەمەرە بە سەر شۆستەکاندا دەهاتن و دەچوون: یەکێ هەردوو چاوی لە پشتەسەری بوون و هەندێ جار لابەلا و هەندێ جار بەرەوپشت رێی دەکرد. یەکێکی دی، زمانی وەک بۆینباغ بە بەرۆکیدا شۆڕ ببۆوە و تک تک لیکی پێدا دەهاتە خوارێ. یەکێکی دی جێی لاق و باسکی گۆڕابوون و وەک پێچکەی عارەبانە بە سووڕاندنەوە رێی دەکرد. یەکێکی دی، لە بری ئەوەی دەستی منداڵەکەی بگرێ، لاقێکی گرتبوو و پەلەکێشی دەکرد.

هەموو ئەو خەڵکە شێواوە، ژیانی مەیلەو ئاسایی دەژیان، کەچی هەر هێندەت دەزانی خۆیان دەکوشت. فرۆشیاری گەنمەشامی و شۆفێرەکان و پۆلیس و پزیشک و دەرمانفرۆش و شەربەتفرۆش و شەربەتخۆر، دەگمەنیان نەبێ، خەلقەندەی شێواو و بەدگۆڕاو بوون، بەڵام هەر یەکە و بە جۆرێک و هەر یەکە و نەخۆشییەک یا پتری هەبوو: ماستی ڕەش، چپسی پیتپۆت، ئاردەگان، ڕۆنی میز، مریشکی لامل، قرنیقاز و قرنیسۆنە، کوێربوونی شکولاد، ژاهراویبوون بە پێنووس، شیرپەنجەی گۆرەوی و قۆندەرە، شیرپەنجەی کتێبی تیشکداری ناوکی، خوێنکەمی چاکەت و زۆری تر و هەر یەکەش لەو نەخۆشییانە، پزیشکی تایبەت و شارەزای خۆی هەبوو و زۆربەی ئەو شارەزایانەش لە ئاسیای بچووکەوە بۆ چارەسەرکردن هاتبوون.

ویستیان لە شەقامەکان بپەڕنەوە... تەکسییەک وەستا تا مەودای پەڕینەوەیان بدا. شۆفێرەکە، هەردوو لاقی خستبوونە سەر فەرمان و لابەلا تەماشای دەکردن. هەردوو چاوی کەوتبوونە ئەملا و ئەولای گوێچکەی چەپی و گوێیەکیش بە سەر لووتیەوە شۆڕ ببۆوە. منداڵەکە، کە لووی ماستی ڕەش لە ملی هاتبوو و باسکێک و لاقێکی جێی خۆیان گۆڕیبوو و چاوێکی لە سەر ڕوومەتی بوو و ئەوی دی لە سەر تەوێڵی

بوو، لە ترسی دیمەنی شۆفێرەکە دەستی بە گریان کرد و توند خۆی بە دایکیەوە نووساند، شوفێرەکەش، سەرێکی لەقاند و لە بەر خۆیەوە گوتی: ماشەڵڵا خوایە لە کاری تۆ! ئەمە چییە دروستت کردووە!

باوکی منداڵەکە، کە بە دووی ژنەکەیەوە بوو و چاوێکی هەر لە منداڵەکە بوو، کە گوێی لە قسەی شۆفێرەکە بوو، دەستی کرد بە پێکەنین و لە بەر خۆیەوە گوتی: «قەل بە قەلی گوت ڕووت ڕەش...» لەگەڵ قسەکەیدا، زمانی لە دەمی بەربووەوە و تا کەمێ زۆور ناوکی شۆڕ بووەوە. بە پەلە خستیەوە ناو دەمی. زمانی، بە دەمارێکی بارێک بە ناو دەمیەوە بەند بوو.

ژنەکەی، ئاوڕێکی لێ دایەوە و گوتی: «ئاخر خوا کێو دەبینێ و بەفری تێ دەخا» ئەویش دەمی کەوتبووە خوار گوێچکەی چەپیەوە.

هەر کەسێک دوای ساڵی ۲۰۱۰ی زاینی لەو شارەدا لە دایک بووبێ، بە شێوەیەک لە شێوەکان گۆڕانی بە سەردا هاتبوو یا هۆکاری گۆڕانکاری لە کرۆمۆسۆمدا هەڵگرتبوو. بەڵێ خەڵک هەبوون بە ڕواڵەت چ عەیبیان نەبوو، بەڵام ڕێی تێدەچوو پیاوێکی ڕێکوپێک کە بەرانبەرت دەهات، لە ژێر جلەکانیەوە ژن بێ یا ژنێکی جوان، کەرەسەی زاوزێی پیاوی هەبێ یا لە بری هێلکەدان جووتێ گونی پێوە شۆڕ بووبێتنەوە یا پیاوێک بە ئامێری زاوزێی پیاوانەوە ئاوس بێ...

هەندێ لە پزیشکەکان، بەخۆشیان دووچاری ئەو دەردانە ببوون و تیایاندا هەبوو دەمی ببوو بە دەندووک و لە بری ئەوەی قسان بکا، دەیبیاڕاند. هی وایان هەبوو، کلکی مەیموونی لێ ڕوابوو و پەنجەکانی پێی وەها کورت ببوونەوە هەستیان پێ نەدەکرا. تاکوتەرا خەڵک بە شەقامی (حەکیمان) دا ڕەت دەبوون کە سپوساغ بوون بەڵام ڕوخساری خۆیان هەڵپێچابوو و تەنانەت تیایاندا هەبوو جلی گەشتیارانی بۆشایی ئاسمانیان لە بەر کردبوو.

چوونە ژووری چاوەڕوانیی یەکێ لە پزیشکەکانەوە. یەک مانگ بوو کاتیان

لای ئەو پزیشکە ئانکەرەییە گرتبوو تا لووی ماستی ڕەشی منداڵەکەیان چارەسەر بکا. «من ڕقم لێتان نییە. من برای ئێوەم. بەڵام لە زمانی کەر شارەزاییم نییە. ئەمجارە کە هاتنەوە، کەسێک لەگەڵ خۆتاندا بێنن زمانی بەشەر بزانێ. ئێستا لووەکیتان بۆ دەردەدەم تا مانگێکی دی بێنەوە و بیبرم». دەرگاوانەکە، کە ئەویش هەردوو چاوی چووبوونە جێی هەردوو گوێی، قسەکانی بۆ وەرگێڕان. بێ ئەوەی هیچ بڵێن، منداڵەکەیان لە سەر تەختێک درێژ کرد. منداڵەکە دەترسا. دەستی بە گریان کرد. ناو دەمی دیمەنێکی تۆقێنەری هەبوو. زمانی دووفاقانە و درێژ بوو و ددانەکانی، هەر یەکە و ڕووی لە لایەک کردبوو. یەکێ لە ددانەکانی، بە نێوان هەردوو لێویدا هاتبووە دەرێ. یەکێکی لای چەپی، بەرەو لای ڕاست درێژ ببۆوە. حەکیمەکە گوتی:

«بۆ ئەم کەڵبە سەگانە هەڵناکێشن؟ هەر ئێستا کە من لووەکەیم دەردا، بچن هەمووی هەڵکێشن... بە هەمان بەنج». چاودێرەکە، قسەکانی بۆ وەرگێڕان و ئەوەشی بۆ زیاد کرد: «ئەوەتا دانسازەکە بەرانبەرمانە!»

لەو ڕۆژگارەی ساڵی ۲۰۵۰ی زاینیدا، گۆڕهەڵکەندن برەوی زۆر بوو. یەکێ هیچ کارێکی دەست نەکەوتبا، ئەو کارەی مسۆگەر بوو. ڕۆژ نەبوو پەنجا کەس بە نەخۆشی ماستی ڕەش و ئاردەگان و ڕۆنی میز و ژاهراوییبوون بە پێنووس و نەخۆشیەکانی تر نەمرن، جگە لەوەی هەموو ڕۆژێ بیست سیی کەس خۆیان دەکوشت یا یەکتریان دەکوشت. جاری وا دەبوو، پۆلێکی تەواوی قوتابیانی سەرەتایی، تەگبیریان دەکرد و وێکرا خۆیان دەکوشت. کیژ و کوڕ پێکەوە خۆیان دەکوشت. بە پێی ڕاپۆرتی وەکالەتی ئەنەدۆڵ، کە کۆمپانیایەکی سەربەخۆی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە بوو و حکوومەتە یەکگرتووەکان پشتیان دەگرت، زۆربەی ئەو نەخۆشییانەی بڵاو ببوونەوە، لەو خۆراکانەوە پەیدا ببوون کە سیی - چل ساڵ پێشتر بۆ ویلایەتی موسڵ نێردرابوون و بەر لەوەی لە سنوورەوە ئاودیو بکرێن، بە مەودایەکی ڕادیۆئەکتیڤدا تێپەڕ کرابوون. هەموو خۆراک

و کەرەسەیەک ئاوهای لێ دەکرا ئەوسا دەنێردرا.
ئەو ڕێکخراوە نووسیبووی: «لە بەر ئەوەی خەڵکی ئەو دەڤەرە لەو ساڵانەدا ببوون بە ئامێری بەرهەمهێنانی پیسایی و فەلسەفە، هەرچییەکی بۆیان دەچوو لووشیان دەدا و دواتر وەک پەین هەڵیاندەڕشت، هەرچییەکیان دەخوێندەوە، دوایی وەک فەلسەفە دایاندەنایەوە و ئەنجامی ئەو دوو بەرهەمەش شرپوشکڵی سەیروسەمەرەی ئێستای خەڵکەکەیە... کەچی مانگای بێ شیر و بزنی قسری بێ بەرهەمیان سەردەبڕین».
ماستی ڕەش، یەکێ بوو لە نەخۆشیە ترسناکە باوەکان. زۆربەی منداڵان کە دەهاتنە دنیاوە، جگە لە جێگۆڕکێ و شێواویی ئەندامەکانی لەشیان، کیسەیەکی ڕەشیش بە ملیانەوە بوو. دەیانگوت ئەوە بە هۆی ماستێکەوە پەیدا بووە، باوک و دایک یا نەنک و باپیری ئەو منداڵانە، کاتی خۆی خواردوویانە. کیسەکە، وردە وردە گەورە دەبوو تا وای لێ دەهات، ئەگەر دەرنەدرایە ئەو منداڵەی دەخنکامد. لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکەدا، کیسەکەش گەورە دەبوو.
دوای ئەوەی پزیشکەکە چەندین سرنج ئاوی لە کیسە ڕەشەکە دەرهێنا، منداڵەکەیان گەیاندە لای ددانسازەکە و هەر ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو، هەموو ددانەکانی دەرهێنان.
«دە ئەوجا بیبەنەوە نەوەک لە بازاڕ بە هۆش بێتەوە و بیکاتە ڕۆژی خۆی!» چوونە دەرێ. تاکسییەکی بێ شوفێر بۆیان وەستا. دەمێ نەبوو ئەو جۆرە تاکسییانە پەیدا ببوون بەڵام زوو ژمارەیان زیادی کرد و خەریک بوو تاکسی بە شوفێر ببێتە دیاردەیەکی دەگمەن. باوکی منداڵەکە، کارتێکی خستە کونی نەفەراتەوە و دەرگای بۆ کرایەوە. بەو شێوەیە، هەم ناونیشانیان بۆ تۆمارگەی تاکسییەکە ئاشکرا بوو هەم پارەی تاکسیەکە لە حیسابی بانکەکەی دەرهێندرا. تاکسیەکە دوو نەفەری تری تێدا بوون کە لە پێشەوە دانیشتبوون. یەکێکیان گوێیەکی لە تەوقی سەری بوو و چاوێکیشی کەوتبووە خوار گوێیەکەوە. ئەوی

تریان هەردوو چاوی کەوتبوونە لای گوێی چەپی و سەری، بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بچووک بوو.

دایک و باوکەکە دانیشتن. منداڵەکە لە باوەشی دایکی، وەک مردوو درێژ ببوو. دایکەکە بێ ئاگایانە ڕایدەژەند و باوکەکەش تەماشای دەکرد و دەستی بە دەستەکەی جێی لاقیدا دەهێنا.

دووەکەی پێشەوە بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد. بابەتەکەیان فەلسەفی بوو و زۆر توندڕەوانە قسەیان لە سەری دەکرد. ڕایان جیاواز بوو و بەرپەرچی یەکتریان دەدایەوە:

- کورد حەیوانە یا ئینسانە؟

- کورد ئینسانە... حەیوانی چی!

- چۆن؟

- چاک!

- دە فشەفش!

- خۆت فشوفش!

باوکەکە تەماشای کردن و پێکەنی. زمانی لێ بەربووەوە کۆشی. بە پەلە هەڵیگرتەوە و نایەوە جێی خۆی. یەکێ لەوانەی پێشەوە گوتی:

- کە حاڵی زمانت وایە، بۆچی پێدەکەنیت؟

- بۆ ئەوەی بیسەلمێنم مرۆڤم، با شێواویش بم.

ماوەیەک بوو تاکسییەکە بەڕێوە بوو. دووەکەی پێشەوە کەمێ کڕ بوون. ئەوجا یەکێکیان گوتی:

- گۆڕانی چەند بۆ چۆن، هەر دەبێ بێتە دی!

- وایە. لووەکەی لاملت گەورە دەبێ و دەتخنکێنێ.

- ئەوە حەقیقەتە! ئەوە ڕاستییەکە وەک سپێتی ماست. بابەتێکی جوان لەم بارەیەوە لە حەفتەنامەی (دانتیزم)دا نووسراوە. خوێندتەوە؟

- نا.

- ئەدی ئوستاد تۆ چۆن ڕۆشنبیرێکی؟!

- من خەریکی مێژووم. مەبەستم ئەوەیە کە زیاتر بە لای مێژوودا دایدەیشکێنمەوە. دەزانی؟
- چی؟
- ئەگەر هەندێ ڕووداوی مێژوو فەسرپدرێنەوە و شتی تری بۆ زیاد نەکرێ، دین نامێنێ! فەلسەفەش دەمرێ!
- دین نا، بەڵام فەلسەفە نا!
- دین خۆی فەلسەفەیە!
- نا، فەلسەفە نییە!
- با!
- نا!
بابەتەکەیان گۆڕی. ئەوەی گوێچکەی لە تەوقی سەری بوو گوتی:
- زانست زۆر پێشکەوتووە. لە ترشەی ناوکی شانەی لەشدا، کەرەسەیەک دۆزراوەتەوە کۆدی نەتەوایەتی تێدایە. دەتوانن بە دەسکاریکردنی ئەو کۆدە، سەرجەمی نەتەوەیەک قڕ بکەن... دەشتوانن نەتەوایەتییان بگۆڕن.
- کاکە دەمێکە ئەوە دۆزراوەتەوە... پەنجا تا شەست ساڵ پێش ئێستا ئەوە زاندراوە و لە سەر میللەتان خراوەتە بواری پراکتیکەوە... نابینی ئێمە خەریکە نامێنین؟! هەندێکمان، بە یەک هاوکێشەی کیمیایی کرانە ترک و هەندێکیشمان کرانە عارەب. ئەوەی ڕاستی بێ زاناکان سەریان لە جیاوازی نێوان کۆدی کورد و کۆدی فارس دەرنەچووە. دەڵێن یەک لە دە ملیۆن جیاوازییان هەیە، ئەوەش لە بواری دۆزینەوەی ڕێگای ماڵەوەیانە!
- شتی وا نییە! ئەوەی من باسی دەکەم تازە دۆزراوەتەوە...
- نا!
- با!
تاکسیەکە گەیشتە جێ و بەر لەوەی بوەستێ باوکی منداڵەکە بەو دووەی پێشەوەی گوت: دەزانن چوارڕێیانی ئەتا، بە پێی بڕیارێکی حکوومەتە

یەکگرتووەکان کراوەتە چواررێیانی (مەلیک)؟
یەکێکیان، ئەوەی گوێی لە بان سەری بوو، بە دەم پێکەنینێکی گاڵتەئامێزەوە ئاوڕی دایەوە و گوتی:
- ئەتا بێ یا مەلیک چ لە قڕنیقاز و ماستی ڕەش دەگۆڕێ؟ بەشەر هەر بەشەرە! دایک و باوکەکە دابەزین و منداڵەکە هێشتا بێهۆش بوو. باوکەکە زمانی خۆی گرد کردەوە و خستیەوە ناو دەمی. دووەکەی دی، بە هۆشدارییەوە لە سەر دەمەتەقێی خۆیان بەردەوام بوون.
- ئەتا بێ یا مەلیک جیاوازی نییە!
- با هەیەتی!
- نا نیەتی!
قسەیان دەکرد و زیادەگۆشت و کیسەی ماستی ڕەشی لاملیان و گوێچکەی بان سەریان و لووتی قەد گوێیان دەلەرانەوە...

# عەریف عۆدە

«ڕۆژگار ئەمەی بە سەردا هێنام... ڕۆژگاری چی!. بە ئیمامی عەلی ئەم سەگبابانە لێ ناگەڕێن پەنجەرەی بەزەیی لە دڵ و دەروونی هیچ کەسێکدا کراوە بێ. لێناگەڕێن نابەعسی وەکو مرۆڤێکی ئاسایی بمێنێتەوە... ئاخر چیم کردبوو؟!. هەر لە بەر ئەوەی ئەو ساوایەم لە ناو بێشکەی گڕگرتوودا دەرهێنا و نەمهێشت بسووتێ؟!. هەر لە بەر ئەوەی مزگەوتەکەم نەسووتاند؟!. ئاخر چیم کردبوو؟!. ئەی خوا و ئاسمان من مرۆڤم و مرۆڤیش بەزەیی هەیە... پێم دەڵێن تۆ لە سەنگەری چەتەکاندای... ناوەڵڵا ڕەپ و ڕاست دەڵێن تۆ لەگەڵ کورددای. بۆ کورد چین؟!. خۆ ساوای ناو بێشکە چەتە نییە!.

ئاخ خۆزگە بۆ جارێکی تریش چاووم بە چاوە گەشەکانی نەرمین بکەوتبایەتەوە. من بەهەشتی خواوەند لە دیمەنی ئەودا دەبینم... هەرچەندە تەنها یەک وشەی کوردی دەزانم ئەویش (حەیاتم)ە و ئەویش هەر ناوی من بە عارەبی دەزانێ، بەڵام نیگامان داستانی خۆشەویستی بۆ یەکتر دەگێڕنەوە... ناخی پڕ لە سۆزی نەرمین، لە ترپەی دڵە گڕگرتووەکەم

دەگا. ئاخ کە دەنگی دەنگێکی فریشتانەیە کە ناووم دەبا و دەڵێ (عەودە) و هێندێ شتی تریش دەڵێ کە هەر وشەی (خێر)یان تێدا دەناسمەوە. ئەی دیواری کۆنکریتی ساردوسڕی لە ڕوخاندننەهاتووی زیندان، دەتڕوخێنم!... ئەی دەرگای پۆلاینی لە شکاندننەهاتوو، دەتشکێنم!. باڵ دەگرم و تا بەر پێی نەرمین ناوێستمەوە... نامەوێ نەرمین فێری عارەبی بکەم. ئەگەر عارەبی بزانێ لەزەتە هەرە خۆشەکەی نامێنێ. ئەگەر فێر بێ هیچی وای لە (×بحە)ی ئامۆزام پتر نابێ. ئای چەند خۆشە تەنها لە ڕێگای هەستەوە، لە ڕێگای چاوەکانیەوە، لە... لە... لە ترپەترپی دڵیەوە لێی حاڵی بم. دیواری زیندان دەتڕووخێنم و باڵ دەگرم و تا کوردستان ناوێستمەوە. کوردستان!!. بەڵێ، بەڵێ، ئەی بۆ نا؟!. من وڵاتی خۆمم خۆش دەوێ و ئامادەم بۆی بمرم بەڵام خەڵکی وڵاتی شاخیشم خۆش دەوێن. وڵاتی شاخ و بەفر، وڵاتی کوردم خۆش دەوێ... من کوردم خۆش دەوێ، هەموو شتێکی کوردم خۆش دەوێ، تەنانەت سەگەکانیشیان. تەنها جاسووسە سووکەکانیانم خۆش ناوێن. ئەی هەش بە سەرم!. لە سەر ئەو منداڵە ئەمەیان پێ کردم و پێم دەکەن، ئەی ئەگەر بیانزانیبا من پێشمەرگەیەکم لێ حەشار داون و نەمهێشتووە بکوژرێ چییان پێ دەکردم؟!. ئەی ئەگەر بزانن فیشەکم بۆ ناردوون چیم پێ دەکەن؟!.» دەنگی دەرگا و زرە و تەقەی زنجیر و قوفڵی دەرگا، زنجیرەی بیری عۆدەیان پساند. دوو زەلامی بازوو ئەستوور و سمێڵ بابڕ دەرگایان کردەوە: عۆدە!... هەستە پێشمان کەوە!... هەستە دەی!...

عەریف عۆدە دەستێکی بە دەم و سمێڵی خۆیدا هێنا و بە زۆر جەستەی خۆی لە زەوییە چیمەنتۆرێژکراوەکە هەڵبچڕی و ڕاست بووەوە. سەر چۆکەکانی ڕچیبوون. پەنجەکانی تەزیی بوون. ڕدێنی هاتبوو و تەواو ڕەنگی بزڕکابوو. ڕوناکی و گەشی تەنیا لە چاوەکانیدا بەدیدەکران. چاوی ڕەش و درشت بوون، خاڵێکی قاوەیی بچووک بە تەنیشت ڕەشێنەی چاوی چەپیەوە، لە ناو سپێنە زۆر سپییەکەی چاویدا دیار بوو. خوێنی وشکەوەبوو، پەڵەی گەورە و وردیان لە سەر بیجامە زۆر چڵکنەکەی

پێکهێنابوو و له ئاستی هەر پەڵە خوێنێکیش بیجامەکەی لۆچی تێ کەوتبوو و کرژ ببوو.
تەزووی ترس جەستەی داگرت. بیری جارەکانی پێشووی کردەوە کە چۆنیان ئازار دەدا. جارێ بە لاقێکی هەڵیاندەواسی و جارێ بە باسکێکی. ئاوی ساردیان پێدا دەکرد و بە دوو ملئەستوور، بە سۆندە بیرازیان دەکرد. ئازاری پێرێ ئێوارەی هێشتا بە تەواوی بەری نەدابوو، کە بە پەتێکی ڕەش هەردوو گونیان شەتەک دا و دەیانجەڕاند. «ئای چ ئازارێک بوو!. چاویان دەرێ، چی ترم لێ دەکەن؟!. چییان لە دەست دێ با درێغیی نەکەن!. بەخوا من ئەوان دەپسێنم!».

* * *

عەریف عۆدە، بەرەو ژوورێکی فەڕاح و ڕێکوپێک پەلەکێش کرا. ئەفسەرێکی سەرڕووتاوەی سپیلکانە، لە پشت مێزێکی گەورەوە دانیشتبوو. هەر کە چاوی بە عۆدە کەوت، هەستایە سەر پێ و بە پەلە بەرەو ڕووی چوو: ـ ئاااای!... ئەوە ئەو بێقیمەتانە بۆ وایان بە سەر هێناوی؟!. دە قەیدی نییە دەی، بیرت دەچێتەوە. فەرموو دانیشە.
عۆدە لە سەر کورسییەکی بۆیە سەوزی دارینی ڕەق کە بەرانبەر مێزەکە دانرابوو، دانیشت. دڵی خێرا لێیدەدا و ئەوەندەی دی ڕەنگی بزڕکابوو و ترس جەستەی داگرتبوو. ئەفسەرەکەش بە دەم جگەرەکێشانەوە، ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەکەی دەکرد... لە پڕ لێی هاتە پێشێ و دەستێکی خستە سەر شانی و دەستەکەی دی بە جگەرەکەوە خستە سەر مێزەکە و چاوی لە چاوی بڕی. ئەمیش چاوی نەدەتروکاند. لێی هاتە زار و لە سەرخۆ گوتی:
ـ کوڕی باش!... تۆ وەچە و ڕۆڵەی ئەبا عوبەیدەی. تۆ لە نەوەی عەلی و حەسەنی... تۆ پاشماوەی ئەو قارەمانانەی کە (ئەندەلوس)یان گەرت. باشە نابێ هەروا تۆزقاڵێ لە ڕەوشت و پیاوەتی ئەوانت تێدا بێ؟!. شەرم نییە کوڕێکی وەکوو تۆ ئەمە حاڵی بێ؟!.
ئەفسەرەکە، سوتووی جگەرەکەی تەکاند و بە گورجی ڕاست بووەوە.

هەردوو دەستی خستنە پشتەوە و بە دەم هەڵێنانی هەنگاوی وردەوە، لە سەری ڕۆیشت:

- باشە پێم بڵێ، بۆ فەرمانی ڕائید (وەتبان)ت شکاند؟!. کاتێ پێی گوتی ئا ئەوە چەتەیەکە لەو پەنا شاخە، بۆ نەتویست بیپێکی؟!. کە پێی گوتی یەکێ لە بارەگای چەتەکان بسووتێنی، بۆ فێڵ و گزیت کرد و لە پەناکە ئاگرت کردەوە تا سەربازەکان دوکەڵەکە ببینن و بڵێن: ئەها عۆدە سووتاندی!. بۆ چەتەیەکت لە ناو ئاگر دەرهێنابوو؟!. تۆش تیرباران دەکرێی!.

- قوربان!... بە سەری سەرۆک و بە شەرەفم ئەوەی کە ڕائید (وەتبان) پێی پیشاندام چەتە نەبوو، پیاوێکی پیری گۆپاڵ بە دەستی چەماوە بوو. ئەوەی کە دەبوو بیسووتێنم، بارەگا نەبوو، مزگەوت بوو... منیش لە ترسی خوا نەموێرا بیسووتێنم. ئاخر قورئان و کتێبی زۆری تێدا بوون. ئەوەی کە دەڵێن چەتە بوو و من لە ناو ئاگر دەرمهێناوە، بە سەری جەنابتان و بە شیری دایکم و بە گۆڕی باوکم ، منداڵێکی بێ خاوەنی ناو بێشکە بوو. بێشکەکەی گڕی گرتبوو و ئەویش تێیدا شەتەک درابوو، زۆری نەمابوو بسووتێ... دەگریا... دەیزریکاند و منیش دڵم پێی سووتا و دەرمهێنا. «ئای بەستەزمان! چۆن خۆی پێوە نووساندم و هەنسکی دەدا و جار جارێ تەماشای لای ئاگرەکەی دەکرد و بە گورجی ڕووی خۆی وەردەچەرخاند!». ئێ خۆ ئاخرێکەی پیاوە پیرەکەیان کوشت. یەک ڕیز دۆشکەیان لەو کابرایەدا سەرف کرد. مزگەوتەکەشیان سووتاند و پەڕە قورعانی نیوە گڕگرتوو با دەیبردن. منداڵەکەش... منداڵەکەش هەر کوژرا.

- هەتیوی سەگ، شێت بوویی؟!. منداڵی چی و تەڕەماشی چی؟!. مزگەوتی چی و گووی سەگی چی؟!. ئەو سەگبابانە مزگەوتیان کوا هەیە؟!... هەشیانبێ، بۆ بنکە و بارەگایانە.

لێی هاتە پێشێ. دەستی خستە سەر شانی و دەمی نا بە پەنا گوێیەوە و لە سەر خۆ گوتی: «دایکت لە ژوورەکەی سەرەوەمانە. ژوورەکەی ئەو ڕۆر لەوی تۆ خۆشترە و قەرەوێڵەی دوو نەفەریشی تێدایە». بە گورجی ڕاست

بووەوە و بە دەنگێکی بڵند گوتی: «خەمت نەبێ ناترسێ. هەر شەوە و پیاوێکی لەگەڵدایە. قەت نایەڵین بە تەنها بێ. باشە پێم بڵێ، پەیوەندیت بە چەتەکانەوە چییە؟!».

ـ قوربان، دایکم؟!. دایکم بە سەری سپییەوە بۆ گەیشتۆتە ئێرە؟!.

عۆدە هەستایە سەر پێ. کابرا بە سەریدا شیڕاندی: دانیشە هەی دایکحیزی خۆفرۆش!.

زۆری پێ نەچوو، ئەو دوو زەلامەی کە عۆدەیان پەلەکێش کردبووە ئەو ژوورە. دایکیشیان هێنا. ژنێکی باریکەلەی کەڵەگەت، شپرزە و ترساو، سەری بە پارچەپەڕۆیەکی ڕەش پێچابۆوە، قژە ئاڵۆزکاوەکەی لە هێندێ لاوە سەری سپی خۆیان لە پەڕۆ ڕەشەکەوە دەرهێنابوو. چاوی دەگێڕا و هیچی نەدەدی. چاوە ڕەشەکانی وەک فرفرۆک دەسوڕانەوە و هەراسانی و ترسیان لێ دەباری. عۆدە هەستایە سەر پێ و بەرەو ڕووی دایکی هەنگاوی نا: دایە!!...

یەکێ لە پیاوکان باسکی گرت و وەک پەلی منداڵێکی گرتبێ، لە سەر کورسییەکە داینایەوە. بە پەتێک، توند بە کورسییەکەوە شەتەکیان دا و دایکیان بەرانبەری ڕاگرت... فۆتە ڕەشەکەیان لە سەری داماڵاند. ئەویش دەستی بە پاڕانەوە کرد. کڕوزایەوە، پاڕایەوە، خوا و پێغەمەران نەما بە گژیاندا نەکا و سوودی نەبوو. چاوەکانی عۆدە هێندەی دی کرانەوە. بە دەم نەرمە گریانەوە پاڕایەوە: «ئەو چی کردووە؟!. ئەگەر من شتێکم کردووە دە بمکوژن!. ئەو چی کردووە؟!.

چاکەتە قەدیفەکەیان لە بەر داڕنی. هاواری کوڕ و دایک بەرز بووەوە. کراسیان لە بەر داڕنی... عۆدە چاوی نوقاندن، لێوی خۆی دەکرۆشت و متەقی لێ بڕا. سوور هەڵگەڕا... ڕەنگی مۆر بووەوە... چاوی وەک دوو گۆمی خوێنی هەڵبڕین و دایکی بە ڕووتی بینی و گورج چاوی داخستنەوە... وێنەی ڕووت و قووتی دایکی هەر لە بەر چاوی بوو کە هەردوو دەستی توند گیرابوون و نەیدەتوانی هیچ شوێنێکی خۆی داپۆشێ. چاوی توند توند نوقاندن و هەر سوودی نەبوو. تازە چاوەکانی، جەستەی

ڕووتی دایکیان هەڵلووشیبوو و گوێچکەکانی هاوار و قیژەیان دەقۆستەوە و تێیاندەگەیاند کار بە کوێ گەیشتووە و بە کوێی تر دەگا.

- چاوت بکەرەوە کوڕی قەحپە!... دەڵێم چاوت بکەرەوە!.

بە زۆر چاویان پێ دابچڕی. دیمەنە تازەکەی جەستەی دایکی، ئەوی پێشووی سڕییەوە. ئەمجارەیان، جەستەی ڕووت و قووتی دایکی لە سەر زەوی درێژ کرابوو. هەردوو لاقیان لێک دوور خستبوونەوە و بەرەو ڕووی ئەویان ڕاگرتبوو. عۆدە هاتە زار: ئەی خواااا!...

❊ ❊ ❊

«ئەی دیواری کۆنکرێتی لە ڕوخاندن نەهاتوو! ئەی دەرگای پۆلایین!. دەتانڕوخێنم!... دەتانشکێنم و باڵ دەگرم و تا لوتکەی چیای ئەو خەڵکە ئازایە ناوێستمەوە!. دەستی دایکم دەگرم و دەڕۆم. کۆشک و تەلاری ئەم زۆردارانە تەفروتونا دەکەم. . ئەی خوا!!. ئەو منداڵە زۆڵەم بۆ نەکوشت؟!. بۆ ئاگرم لەو مزگەوتە بەر نەدا؟!. بەڵام منداڵی ساوای بێ تاوان، ئەم دڕندانە نەبێ کێ دەتوانێ بیکوژێ؟!. ئەم جارە سەرفراز بم دەگۆڕێم، بەڵێ دەگۆڕێم... لە دوو منداڵ، یەکێ دەکوژم. لە دوو مزگەوت یەکێ دەسوتێنم. لە دوو پیر یەکێ تیرباران دەکەم... ئەی چی لە شەرەفی لە دەستچووم بکەم؟!. چۆن تۆڵەی شەرەفی خۆم بکەمەوە؟!. خوایە گیان، دایکمیان هەر لە بەر چاوی خۆم هەتک کرد. دەستم بڕوا، دار و بەردی ئەم دڕندانە گڕ دەدەم.

ئاخ، نەرمین ئاخ!. خەریکە ڕەفتاری ئەم دڕندانە، شێوەی چاوەکانی تۆم لە بیر بەرێتەوە... ئاخ نەرمین!... خۆزگە چاوێکم پێت بکەوتبایە!...»

خڕەی کلیل و قوفڵ و زڕەی زنجیری دەرگا زنجیرەی بیریان پساند. دەرگای خڕ داخراو کرایەوە و دوو زەلامەکەی گۆڕین بە گورجی بۆی هاتن و لە مەچەکی نەوین و پەلەکێشیان کرد. بەرەو هەمان ژووریان بردەوە. ئەفسەرە سەرڕووتاوەکە لە جێی خۆی دانیشتبوو، سمێڵی خۆی دەکرۆشت. بە بینینی، عۆدە لە جێی خۆی ڕاست بووەوە: باشە؟!. ئاخر دەڵێم کوڕی باش بە!. باشە بۆ نایەی دانی پێدا بنێی و پێمان بڵێی چ

پەیوەندییەکت بەو کوردە سەگبابانەوە هەیە و کێی ترت لەگەڵن و شێوەی پەیوەندیت بە چەتەکانەوە چۆنە؟!.
عۆدە فزەی لێوە نەهات. ملی خوار کردبوو و لە بەر پێی خۆی دەڕوانی.
- چییە، لاڵی؟!.
- هیچ نییە بیڵێم... بڵێم چی؟.
- ناوی گەوادە هاوکارەکانت بڵێ! ئێوە چین و نیازی چیتان هەبوو؟. شیوعین؟!... ئیخوانن؟!. خۆ ناشێ لە حیزبە کوردییەکاندا کار بکەن!.
- هیچ شتێک نیم. تەنانەت مرۆڤیش نیم. نازانم من چیم. هەر خۆت دەزانی!.
- وایە من دەزانم، دایکحیزێکی وڵاتفرۆشی خوێڕیت.
- من بێتاوانم!!.... خوایەگیان من بێتاوانم!.
- دایکت بانگ کەینە خوارەوە و ژەمێکی...؟!.
- ...
- وەرن خوێڕینە... وەرن سواری بن!.
- خێرتان دەگا لەوە زیاتر شەرەفم مەشکێنن... لە ڕیزی سوپای ئەم وڵاتەدا تۆک و لۆچم چوو و ئەمەش پاداشتەکەمە؟!.
زەلام بوون بە پێنج. دەست و پێی عۆدەیان توند گرت. بە دەستیانەوە دەلەرزی. ڕووت و قووتیان کردەوە. هاواری دەگەیشتە ئاسمان و لە ژوورەکەش بەولاوە نەدەبیسترا. جنێوی دەدا، دەگریا، بانگی خوای دەکرد، ئەوانیش بە دەم شەق و سۆندەوەشاندنەوە، یەک لە دوای یەک زاری خۆیان هەڵڕشت و هەوەسی خۆیان دامرکاندەوە.
«ئەی خوا!!... ئاسمان!!... شەیتان!!... من چیم کردبوو چی؟!. نەخێر، دیارە کارێکی زۆر خراپم کردووە و بە خۆم نەزانیوە. منداڵی کورد گەورە بن بە چی دەبن؟!. خۆ نابنە مەلایەکەت!. دەبنە چەتە. کورە ڕەنگە هەر بە چەتەیی بێنە دنیاوە. مزگەوتیان بۆ نوێژ و خواناسیی نییە، مزگەوت دەکەنە بنکە و بارەگا. ئەو پیاوە پیرە سەگبابەش، یا کۆنە چەتەیەکی پیاوکوژ بوو یا باوکێکە و چەتەی پەروەردە کردووە. ئاخ!... بۆ وام بە

خۆم کرد؟!. نایبعەریف زیاب لە بری بەندیخانە، هەر بە فشە، جووتێ شاخەتی تریشی لە سەر باسکی چەسپ کرد. عەریف نایف جبووری، خەت و مەتی لێ فڕە دا و یەک تەختەی سەوزی بە لاملی خۆیەوە نووساند. منیش، ئەوەی هەشمبوو لە دەستم دا... خەت، شەرەفی دایکم، پیاوەتی و کەرامەتی خۆم... بۆ؟!. بەڵام سەید زۆر جاری فەرمووە منداڵ، ئەگەر هی دوژمنیش بن بێ تاوانن. کوشتنی خەڵکی بێدەسەڵات و بێتاوان گوناهێکە قەت ناشۆرێتەوە. مزگەوت ماڵی خوایە. چی بکەم؟!. چیم بکردایە؟!. ئەمانە بێشەرەفن، دڕندەن... ئاخ نەرمین!... خەریکە دیمەنت لە بەر چاووم تەڵخ دەبێ. دیواری ئەم بەندیخانەیە لە ڕوخاندن نایە، دەرگاکەی لە شکاندن نایە تا باڵ بگرم و نەرمینی خۆم لە باوەش بگرم. نەرمینی خۆم فێری عارەبی دەکەم. نەرمین کێی خۆش بوێ ئەویش فێر دەکەم. لە مەترسی دووریان دەخەمەوە و لە کوشتن ڕزگاریان دەکەم. زۆریش سوپاسم دەکەن... چیا و بەفریان پێ بە جێ دێڵم...»

تەقە تەقی قوفڵ و زڕەی زنجیری دەرگا، زنجیرەی بیری عۆدەیان پساند. بۆی هاتنە ژوورێ. پەتێکی بە قوڵفەیان لە ملی کرد. یەکێ لەو سێ زەلامە زەبەلاحانەی بۆی هاتبوون، پەتەکەی ڕادەکێشا و عۆدە سووک لەگەڵ دەستیدا دەڕۆیی.

- حیزی کوڕی حیز، بکەوە سەر چوارپەل!.

- ... شەقێکی بە پۆستاڵی تێ سرەواند. عۆدە کەوتە سەر چوارپەل. یەکێکیان سواری پشتی بوو و ئەوی تریان پەتەکەی ڕادەکێشا و سێیەمیشیان لە دواوە تێی هەڵدەدا...

- هەچچە برۆ...

- بەخوا کەرێکی دێزی سەگبابخێوە. بەڵام بۆ باداری چاکە. ئەوانی دی قاقا پێکەنین.

- بوەڕە دایکحیز!...

- کورە ئەمە کەرە خۆ سەگ نییە.

- کەریش بێ دەبێ بوەڕێ.

عۆده، جارێ دەزەڕی و جارێ دەوەڕی، جارێ دەیبۆڕاند و جارێ دەیقوقاند. هەر جارە و یەکێکیانی بە کۆڵەوە دەگرت و ژوورەکەی پێ دەگێڕا. زەوییە چەمەنتۆڕێژکراوە گرنجگرنجەکە ناولەپ و سەر چۆکی ئازار دەدان. بەڵام بە گوێرەی فەرمانی ئەوان دەنگی لێ بەرز دەکردەوە. وای لێ هات بە بێ فەرمانیش دەنگی لێ هەڵدەبڕی... دەزەڕی... دەوەڕی...

- تۆ چیت؟.
- من کەرم.
- نەء!.
- هینم... سەگم... پشیلەم... عاااو... عاااو...

پێکڕا دایانە قاقای پێکەنین. ئەفسەرە سەر ڕووتاوەکە بە دەم قاقای پێکەنینەوە گوتی:

- وا نا... باشتر...
- عاااو... عاااو... حەپ... حەپ...
- باشتر...
- عەپ... عاااپ... حاااو... حیاو....
- بەسە... زۆر باشە. دە پێم بڵێ دەی، تۆ چیت؟!.
- هینم... سەگ!... نا، نا، کەرم... نەء... کەر و سەگ...
- نەخێر تۆ ئەوانە نیت. تۆ قارەمانی!.
- من قارەمانم.
- تۆ پیاوی!.
- من پیاوم!.
- تۆ...
- من...
- هینی هین...
- هینم هین...
- تۆ سنووری وڵات لە چەتە و پیاو خراپان دەپارێزی.
- من سنووری وڵات لە چەتە و پیاوخراپان دەپارێزم.

- تۆ...
- من...
- تۆ گڕ لە هەموو شتێکی چەتەکان بەر دەدەی.
- گڕی تێ بەردەدەم!.
- تۆ دەست لە هیچ کەس و هیچ شتێ ناپارێزی!.
- ناپارێزم!.

❊ ❊ ❊

عۆدەیان لە گەرماوی بەندیخانەکەوە هێنا. دەستێ جلی بەڵەکی سەربازی لەبەردا بوو، پاک و تەمیز خۆی شوشتبوو، جوان ڕیشی تەراشیبوو و پێڵاوی بۆیاغکراوی لە پێدا بوون. عۆدە، عۆدەی جاران نەبوو. زەلامێکی چاوکزی گرژ و مۆن بوو. چوار خەتی ڕەش بە سەر بازوویەوە بوون. ئەو دووەی کە هیچ نەما پێی نەکەن، بە حورمەتەوە بە تەنیشتییەوە بەرەو ژووره فەڕاحەکە ڕێیان دەکرد.
- فەرموو ڕەیس، فەرموو دانیشە!.
عۆدەی گرژ و مۆن، بەرانبەر ئەفسەرەکە دانیشت.
- ڕەیس!... بەر لەوەی تەشریف بێنیتە ئێرە، لە کوێ بووی؟!.
- قوربان لە گەرماو بووم.
- مەبەستم ئەوەیە بەر لەوەی بتهێننە بەندیخانە.
- بارەگای گشتیمان لە کەرکووک بوو و فەوجەکەشمان لە (هەیبەسوڵتان) بوو.
- دەتەوێ بگەڕێیتەوە شوێنەکەی خۆت؟!.
- نەخێر قوربان... دەمەوێ بەرەو سەرەوەتر بڕۆم... بۆ ناوجەرگەیان!.

# گابەرد

وەڕس بوو. لە سەرکەوتنی شەڕی مەفرەزانە وەڕس بوو. لە شێوەی یاخیگەرێتی وەڕس بوو و دەیویست لێی یاخی بێ. پشتاو پشت و نەوە دوای نەوە، هەزاران ئازایەتی و سەرکەوتن بە ئاگری گفتوگۆ و بە بەنزینی بەڵێن، لە چاوتروکانێکدا سووتابوون. ئازایەتی و سەرکەوتنی مەفرەزانە، پێکهێنەری نووچدانی گەورە بوون. ئەو، ئەو ڕاستییانەی دەزانی بەڵام وەک حەوت پشتی پێش خۆی دەسبەرداری نەدەبوو. بەخۆی نەبوو، پێی خۆش بوو هەموو دەستوورێکی ئەو بێ دەستوورییانە بشکێنێ و کەی هاوڕێکانی ئاهەنگ بگێڕن ئەم پرسە دانێ. بەخۆی نەبوو، لە سەرکەوتن وەڕس بوو. بە دزییەوە، تەنانەت بە دزی خۆشیەوە، حەزی دەکرد چنگ لە سەر شان هەڵیبڕن. پێی خۆش بوو پێی خۆش بوو هێند لە مەرگ نزیک بێتەوە، بە چاوی خۆی ببینێ... هەستی پێ بکا... سەرەزمانی پێدا بێنێ و تامی بکا... ئەمدیو ئەودیوی بکا. لە یەک بابەتە ژیان وەڕس بوو: «بڕۆ بۆ شەڕ! سەرکەوە! دیل بگرە! بەرەڵای کە! بیکوژە!... ئەوەندە چەکەمان دەسکەوت بوون!... ئەرێوەڵڵا گفتوگۆیە... چەوڵە لێدە!... قوڕ بپێوە!».

خۆی پێ مەکۆی جۆلا بوو و بە یەک ڕێدا دەهات و دەچوو.
ڕۆژژمێری ئەو قەمەریی بوو. مانگی جارێک، کە مانگ دەبووە چواردە شەوە، پاڵەپەستۆی خوێنێ ئەمیش زیادی دەکرد. گێژ دەبوو... پەرکەم دەیگرت... پەرکەم دەیگرت... وڕینەی دەکرد و خەون و زیندە خەونی لێ دەبوونە ڕاستی. ساڵی جارێکیش کە پاقلە گەڵی دەکرد، ئەمیش ماوەی یەک حەفتە گێژ دەبوو و وەک گای ناو گاقۆڕان دەیبۆڕاند.
خەپەشێت و لەشکری دەوڵەتی فشە و خەپە تەپتەپە، ناو و نازناوی (بەختیار) بوون. بەو نازناوانە قەڵس نەدەبوو. ئەو، شەیدای دیمەنێکی کاڵ بوو و دەمێ بوو دنیای بە دوودا پەی دەکرد.نەیدەزانی لە کەنگێوە ئەو دیمەنە خۆی بە کەللـەسەریدا کردووە. ناتۆرەی وا، شتگەلێ نەبوون کاری تێ بکەن. ڕاستیان دەکر دەوڵەت بە دەست و تفەنگی ئەم پێک نەدەهات. ڕاستیان دەکرد لە ئاخافتندا وەک تەپتەپە تەتەڵەی دەکرد و تا ئەو نیوە ڕستەیەکی دەگوت خەڵکی دی هەزاریان دەڕێسی و هی ئەم دەبووە بنەوە. ئەم شەوداڵی دوای دیمەنی خۆی بوو و تەنانەت ئەوەشی لەبیر چووبوو کە ئەشکەوتیان پێ دەگێڕا: «بیگێڕە خەپە گیان بیگێڕە!. بیگێڕە تا دڵۆپە دەبڕێ!.» ئەوەیان دەگوت و قریوە و مڕەمڕی پێکەنینیان لە ناو ئەشکەوتەکە دەنگی دەداوە و بە عاستەم بەر گوێی خۆی دەکەوتن و تێیان دەگەیاند کە بابەتی پێ ڕابواردنی یاخیەکانە.
ئەوان پێدەکەنین و ئەم، خەریکی دیمەنی خەیاڵی خۆی بوو: دار باڕوویەک بوو و بە دیار گابەردێکەوە ڕوابوو. دارەکە، چنگی لە حەوا گیر کردبوو و ڕەگەکانی کرتەکرتیان لە زەوی بەرز دەکردەوە. دیمەنێکی کاڵ بوو و بەشە پێکهێنەرەکانی بۆ نەدەچوونەوە سەر یەک. لە ناوەڕاستی هەموو مانگێکی قەمەریدا، دیمەنەکە تۆختر دەبوو و گابەردەکەش دەبووە پەیکەری ژنێکی ڕووت. بە تۆخبوونی دیمەنەکە، خەپەشێت پەرکەم دەیگرت. گەلێ جار لە گەرمەی شەڕدا خۆی لە پەنای گابەردەکەدا دەدی... بە دارەکەدا هەڵدەگەڕا... قەدی دارەکەی لێ سواخ دەدرا و ڕێی داگەڕانی لێ پیس دەبوو.

بەختیار گەرمێنی بوو. ناوچەکەیان، گابەردی لەو تەرحەی لێ نەبوون. گوێز و بەڕووی لێ نەدەڕوان تا دیمەنەکە بۆ سەردەمی منداڵی بگێڕێتەوە. یادگاری منداڵی ئەو، لە حەوشە و حەسارێکی گەورەی پڕ لە کەیبانوو و منداڵ و سەگ و مەڕدا مۆڵ درابوو. یەکە یەکە، شێوە و ناو و دەنگی لن و منداڵ و تەنانەت مەڕ و مانگاشی لە بیر بوون. گابەردی چی و دارگوێزی چی؟!. ئەدی بۆ ئەو دیمەنەی لێ بۆتە قیری کەوای سپی خەیاڵی؟!.

- هاوچارەنووسە ئازاکان!.

حەوت پشت بوو هەمان ڕستە دەگوترا و دەگوترایەوە: هاوهێنە ئازاکان!. فلاّنە لایەن دوژمنی سەرەکی فلاّنە عەشرەت یا چینە!. فلاّنە لایەن شەڕفرۆشە و لە بەلێنان ژیوان دەبێتەوە و فیسارە لایەن ڕێکەوتننامەی مۆر نەکرد. ئەی ڕۆڵە نازانم چییەکانی فلاّنە هین. با دوژمن شارەکانمان کاول کەن، ئێمە بزنەکێوی بە سەرماندا دەبانێ... ڕیخۆڵەکوێرەی خۆمان دوو گەز درێژ دەکەین و گیا دەخۆین. هۆ کوڕە ئازاکانی... دەبێ ناچاری گفتوگۆی کەین.

- ت... ت... تا جارێکی تریش پاشگەز ب... ب...

خەپەشێت قسەی پێ نەکرا. پێکەنین شەپۆلی دا. هێندێ دەنگ زووڕەزووڕ بوون و هێندێکیان نەڕڕەیان دەهات و لێرە و لەوێ باقەی بزن دەبیسترا. دەنگەکان بوون بە مڕەمڕ. ددان چیڕ کرانەوە و لالغاو کەفیان دەردا. یەکێ گوتی: خەپە تەپتەپە هەبێ بلیمەتی وەک (زاریهۆن) و دانای وەک (پێدرۆ)مان ناوێن. ئەو ناوانەش پشتاو پشت دەهاتن و دەگۆڕان و کەس نەیدەزانی چۆن و لە کوێوە. هەر بە بیری بەختیار چوار جاران گۆڕابوون و پێش (زاریهۆن)ی ئەفریقیا و (پێدرۆ)ی ئەرجەنتینی ، ناوی دوو کەڵە جوولەکە باو بوون کە قوربانییان بۆ دەدرا.

خەپە شێت، ددانی لێ گڕ کردنەوە. دەنگی وەک دەنگی هاوڕێکانی لە ناو سینگییەوە دەهات بێ ئەوەی بە قوڕگیدا ڕەت بێ: «بێچووە...» نەیزانی بڵێ بێچوە چی!. کەمێ ڕاما و بیری هاتەوە کە ئەو سەردەمە ناوی (شالووم)ی جوولەکە کە حەوت ساڵان خەڵک بۆ ناو و یاد و بەرهەم و

کاری دەکوژران، لە هەموو ناوێ بەدتر بوو. گوتی: «بێچووە شالووم!. هەر ڕۆژە و خێوێکمان بۆ دروست دەکەن و هەر ڕۆژە و بتێک...»
هەموو کڕ بوون. ئەوە یەکەم جار بوو بەختیار توورە بێ و یەکەم جاریش بوو قسەی ساف و لووس و بێ تەتەڵە بکات.
- بەسە بەختیار... کڕ بە. ئا ویستم بڵێم...
دیسان ڕستەکانی حەوت پشت لەوەبەریان گوترانەوە: «نابێ بەچکەی سەرکردە گەردی پێ کەوێ. ئیدی هەرچی دەبێ با ببێ. کوڕینە! گەورەپیاوی بێ ورگ گەورە نییە. کە قسان دەکەیت، جارێ بزە بکە و جارێ هەزار لۆچ بخەرە ناوچەوانتەوە... دەستێ بەرەو حەوا ڕاوەشێنە و دەستێ بە گونانەوە بگرە. دەست بوەشێنە و جنێوی حەوت باتمانە بدە... درۆی گەورە گەورەی شاخدار بکە... قسە بکە، هەر لەخۆڕا بڵێ وام کوشت و وام لێ دا و وام شکاندەوە. ئا ئەمانەن نیشانە و پێناسەی گەورەیی... وا بن، هەموو جەماوەر بۆتان دەبن بە بزن و چییان لێ دەکەن بیکەن و چۆنیان داڕوون باڕوون...
مانگ چواردە شەوە بوو. گێچی سەرەگێژکەی بەختیار لە گەڵ بەرزبوونەوەی مانگدا بەرز دەبووەوە. دیمەنی گابەردەکە، تۆختر و ڕوونتر دەبوو. دەنگی گەورەکە، بوو بە دەنگی بۆقێک و لە بنی بیرێکەوە دەهات. هەستی دەکرد بووە بە دەنکە جۆیەک و کەر خرم خرم دەیهاڕێ. کە مانگ بەرزترین جێی ئاسمانی کردە شار، دوو وایەری سارد و گەرمی ناو کەللـەسەری بەختیار بەر یەک کەوتن و بەر چاوی بلاچەی دا و شریقە لە سەری هەستا و ڕما... کەمێ هەڵپلکا. بوو بە چەقی بازنەیەک و خۆی بە دەوریدا دەخولایەوە... ئازار و حەز و ترسی تێ زان... کەفی کڕاند...
- کوڕە ئازاااا...ا...نی ووووو و و...و...
گەورەکەیان سوور هەڵگەڕابوو. لەپی بە ورگیدا هێنا و وەک پشتاوپشتی خۆی وتەکەی وا تەواو کرد: سەری ڕاستەقینە ها لە مەفرەزەی ئێوەدا... ئێوەن هیوای پاشەڕۆژ و باقی فت.
بەخە خاو ببۆوە. دەستێکی بۆ ناولنگی خۆی برد. وەک هەموو جارێکی

دوای پەرکەم، دەستی تەڕ بوو. هاورێکانی بەرەو پەنای گابەردێکیان برد. ئاو و پرۆتین و چەکیان بۆ دانا. پەتوویەکی پفدراویان بۆ ڕاخست و یەکێکی تریان پێدا دا: بنوو.... تا سبەی بنوو...

بەخە نوست. نوست و تا بەیانی نەبزووت. بەیانی، تیشکی خۆر، وەک دەرزی لە پێستی پێی دەچەقی. وەئاگا هاتەوە. نمێ عارەقەی دەردابوو. ئازای لەشی ڕەق هەڵگەڕابوو. بە کاوەخۆ چاوی گێڕا: گابەردێکی گەورەی بە دیار خۆیەوە دی. تەزووی پێدا هاتن. هەستا و بە لای چەپیدا ڕوانی. دەوەنێکی دی کە سێ هەنگاو لەولای بەردەکەوە بە دەم کزباوە دەلەرایەوە. تاوێ لە دەوەنەکە ڕاما و تاوێ لە بەردەکە. لەرەی دەوەنەکە، چیرەچیرێ بە ئێسکی دەگەیاند: ئەمەیە!... ئا... ئەمەیە! ئەم دیمەنەیە!... خۆیەتی... ڕوح و گیانم پێی ئاشنان!. بەڵام دەوەنەکە زۆر گچکەیە و بەردەکە زۆر گەورەیە. لە بری ئەوەی ئەم لە پەنای ئەودا بێ ئەو وا لە پەنای ئەمدا. ئەها باری گیانم سووک بوو. ئەها ڕیشاڵی خۆمم دیتەوە. بنی ئەم بەردە چەقی گۆی زەوییە... نا... ناوەڕاستی هەموو گەردوونە.

بیری شەڕ و شۆڕشی نەما. گەشکەدار بوو: سەد حیزب، هەزار زاریهۆن، هەزار و یەک یەزدانۆکە و سەلک و پەلکی حیزب دەکەمە قوربانی ئەم بەردە و ئەم دەوەنە. بەڵێ من لادەرم... لە باوەڕی زاریهۆن و حیزب لادەرم. یەک... دوو... ها ئەه! دەوری بەردەکەم هەشت هەنگاوە. ئەها سێ مەتر بڵندە!... بڵندە!... بڵندە!... دەوەنەکەش گەشە!... دەبێتە دار و پەنای بەردەکە دەدا.

خەپە دەدوا. بە بێ تەتەڵەکردن دەدوا. ئاگای لە کردنەوەی زمانی خۆی نەبوو. ترس و سام سواری کۆڵی بوون و لەرزاندیان. بە دەم ترسەوە حەزیشی بزوا. حەز و ترس جمک بوون... وەک منداڵ و وێڵداشەکەی بە بێ یەک نەدەبوون. چۆڵایی و تەنهایی و پەنا، داک و باب و مامانی حەز و ترس بوون. ئارەزووی چووە بەردەکە. بەردەکە، بوو بە ژنێکی ڕووتوقووت و کەڵەگەت. دەستێکی خستبووە سەر هەردوو مەمکی و دەستێکی خستبووە سەر عەیبی. خەپە، لە کونی لوولەی تفەنگەکەی خۆی ڕاما. ئارەزووی

چووە خۆی. خۆی نووساندە بەردەکەوە و دەیویست خۆی بکا بە کونی بنیدا. دەیویست بە دەوەنەکەدا هەڵگەڕێ. دەیویست بچێتە ناو بەردەکەوە و ببێتە بەشێکی. پێدەکەنی و دەگریا و هاواری دەکرد. بە زمانێکی نەبیستراو دەدوا. کەوتە بڵمەبڵم و توند خۆی بە بەردەکەوە نووساند...

تۆپەڵێ تیشکی شین بە دیار سەریەوە، لە مۆلەق وێستا. تیشکەکەی لێ هاتە زار: «ئەی خەپە شێتی هەڵبژاردەم!... (شێتی هونەرە) شێتی و لادانت لوتکەی زانستن و سەرت بە زانست بڵند بێ. لێرەوەڕا تێهەڵچۆ! گوێت لە دەنگی ئارەزووت بێ و بنی دێری کتێبان بخوێنەوە! بوێرە ناوەڕاستییەکەی (ئەبو جەهل) بڵێی. بوێرە کون و کەلەبەری ئەشکەوتی (حەڕڕا)بپشکنی و لە کەللە سەری حەشاردراو بگەڕێی. بوێرە بیر لە توێی نوێنی مریەم بکەیتەوە و بابی عیسا وەدۆزی!. خەپە! گومان یزدانی ڕاستییە و بۆ سەپاندنی بوونی خۆت گومان لە بوونت بکە!. کێ و چی ڕووی پێی پێ کردنە دواوە، ناویان بەرە. کامە قومارباز لە دەم چەمەوە بۆ پاراوکردن بەرەو بیابانت دەبا، ناوی بڵێ!. تا ناوە ڕاستییەکان نەڵێی ڕووی پێت لە دواوە دەبێ و چەند خێرا بڕۆی، بە خێرایی بەرەو دواوە دەچیت تا دەگەیتە سەردەمی بڵمەبڵم و ئێسکت وەک ئێسکی دایناسۆر پلیتی تەماشاکردنی بۆ دەبڕدرێ. بەرەو دواوە دەڕۆی تا دەبیتە سەگسار و لە پێناوی بژێوی خاوەنتدا هەڵدەپەڕیت. بەخەکەم!... خەپەکەم!... تۆ لە درزی ئەو بەردەوە نەبێ لە هیچ درزێکەوە نەهاتویی... باوکی تۆ ئەو دەوەنەیە کە هەزار جار گەورە بووە و بڕدراوەتەوە و سەری هەڵداوەتەوە. ئەم جارە ببڕدرێتەوە ناژێتەوە... تۆ تاکە چرایەکی و... تۆ...

بەخە گوێی لێ نەما. چوبووە ناو قاوغی تەڕ و لیچی شەیتانۆکەیەکەوە و لەگەڵ حەشاماتێکی چەند ملیۆن کەسیدا ئاهەنگی ڕاگەیاندنی بەڵێنی دەگێڕا... قورگی نووسابوو و بە پێچەکانی ناو شەیتانۆکەکەدا دەڕۆیی و شەیتانۆکەکەش، بە عاستەم بەرەو بنی بەردەکە دەبزوا و ڕێچکەیەکی زیوینی بریقەداری لە دوای خۆیەوە جێ دەهێشت.

# توێکڵە هێلکە

وا دەزانی دوێنێ بوو کە بەتاڵ بوویتەوە: لەگەڵ قوڵپی یەک بە دوای یەکی تێکەڵاوبوونەوەی ئادەم و حەوادا، هەستی بەتاڵبووەنەوە لە ژیان، جوانیی، ڕەوایەتی و مرۆڤایەتیت پێدا دەهات. لەگەڵ دوا قوڵپەشدا، هەستت بە چۆکی مەرگ کرد کە لە سەر پشتت بێ و لێت نەگەڕێ ڕاست بیتەوە و ئەو پەراسووە زیادەت لێ جودا بێتەوە کە هەموو بوونتی هەلمژی. هاوسەرەکەت، لەگەڵ (ویش!)ێکدا، لەپی بە سینگتەوە ناو بە لای ڕاستەی خۆیدا هەرەسی پێ هێنای. کە وەڵاکەوتیت، چاوت بڕییە بن میچەکە. هەستت بە بەتاڵییەکی کوشندەی ناوەوەی ناخی خۆت دەکرد. ئەوە قوڵپەی تێکەڵاوبوونەوە بوو یا ئاڵقە پێکەوە بەستراوەکانی ڕوحت بوون و بە دوای یەکدا دەرهاتن؟!. هەستت دەکرد توێکڵە هێلکەیەکی و زەردێنە و سپێنەت لێ دەرهاتوون و خواست و هەست و نەستت تێدا نەماون. تەنها هەستت بە بێ هەستیی خۆت دەکرد کە لە پەنای زەخیرەی هەموو بووندا، دوای بەکارهێنان و بەتاڵکردنەوەت لە بوون، فڕە دراوی. ئەوەی بە لاتەوە بوو، ئەوەندە مەزن و ڕوناک و پیرۆز بوو، ڕەنگی پێچەوانەکانی خۆیان لە

بۆشایی تۆدا دەدایەوە کە بچووکی و تاریکی و نەفرەتی بوون...
هەر بەو بەتاڵی و بێ قەوارەییەوە، وەک کۆیلەیەکی زەلیل کە دەست و دامێنی مەولای خۆی دەکەوێ، بێ ئاگایانە خۆت بە لای هاوسەرەکەتدا وەرچەرخاند و دەستت خستە سەر زگی. لە سیمای ڕامای: چاوە پرشنگدارەکانی لە بن میچەکە بڕیبوون و ڕوناکایی گوڵەستێرەیان تێدا هەڵببوو. بزەی بەختەوەری کەوتبووە سەر لێوە بە خوێن ئاوس و بە ماچ سوورهەڵگەڕاوەکانی. ئەوەندە بەختەوەر هاتە بەر چاوت، دەتگوت هەر ئێستا خودا مژدەی گەڕانەوەی بەهەشتی پێ داوە و لە تاوانی سێوخواردن و هەڵخڕاندنی (ئادەم)ی کەللـەپووت لێی خۆش بووە. لە ژێر دەستیشتەوە، هەستت بە گەرماییەک دەکرد کە وەک پاشماوەی ژیلەمۆی تەنوور، مۆریژانەی بە دەست و باسکت دەکرد.
ئیدی نە خۆت ئەو پیاوە لەسەرپێیە لە ژیان پڕە گورجوگۆڵە وریا و بە ئاوەزەی پێش گەمەی ئادەم و حەوا بووی نە هاوسەرەکەت ئەو کەندووە بەتاڵ و بێ دەسەڵاتەی پێش ئەو ساتە وەختە بوو. هەموو شتێ ژێر و ژوور ببوو: ئەو، بوو بە هەموو بوون و تۆش بوویتە ئامێری بنیاتنانی ژیانێکی لە هی خۆت بەرزتر... پیرۆزتر... تەواوتر... پاکتر... چاکتر، و بەکار هێندرایت و وەک توێکڵە هێلکە، لە پەنای خەرمانی پاکژیی هەموو بووندا تووڕ درای.
هەموو شتە پیرۆزەکانی بوون، بە سەر یەکدا کۆمەڵ ببوون و گرد و بچووک ببوونەوە و لە ژێر ناوکی هاوسەرەکەتدا بوون. دڵت ڕێی نەدەدا دەستت وەلا نێی یا توانای خۆ بزواندنت نەبوو؟. ناولەپت عارەقەی دەردا. هاوسەرەکەت بە سۆزەوە، بە کاوەخۆ، ماوەیەک دەستی بە دەستتدا هێنا، ئەوسا لای برد. ئاوڕێکی لێ دایەوە و ماچێکی کردی. بە هەردوکتان ناوکی ماچی دوای گەمەی ئادەم و حەواتان بڕیبوو و ناوتان لێ نابوو «ماچی پێزانین و سوپاسگوزاری». وەرچەرخا و بۆ نوستن پشتی تێ کردی.
وا دەزانی دوێنێ بوو: دوای شەوی بەتاڵبوونەوەت لە بوون، بە سێ حەفتە،

دواکەوتنی بێنوێژی هاوسەرەکەت زانی. دەتگوت قومارچییەکی و ئایە و مایەت لە سەر یەک ژمارەی ڕۆلێتدا داناوە... دەخولێتەوە و هاکە تۆپەکە لە سەر ژمارەیەک وێستا... ژمارەکەی تۆیە و دەبیتە خاوەنی هەموو شت یا هەو نییە و هەرچیت هەیە دەیدۆڕێنی؟!. بێنوێژ دەبێ و بوونی خۆت لە دەست دەدەی یا نابێ و دەبیتە ئامێری خولقاندنی پیرۆزترین بوونەوەر؟.
ڕۆژی دوایی و دواتر و دواتر، بوومەلەرزەی سووری مەرگهێنەری بێنوێژیی هاوسەرەکەت نەبوو... نەبوو... نەبوو. ئیدی باسی بێنوێژیی نەما: وردە وردە چاڵی ناوکی هاوسەرەکەت پڕ دەبۆوە. وردە وردە، دومەڵانی ژیان زۆری بۆ ئەو زگە پیرۆزە دەهێنا و بەرزی دەکردەوە. وردە وردە، خونچەی مەمکی هاوسەرەکەت دەپشکوت و گۆی مەمکی زیادی دەکرد و ڕەنگی دەگۆڕا. وردە وردە، هەموو بوونی، خۆی بۆ پێشوازیکردنی ژیانی نوێی لە هی خۆی پیرۆزتر ئامادە دەکرد. تۆی گەشکەداریش بەرانبەر شکۆی بوونی مەزن، سەرسام... حەیران... واقوڕماو و بەختەوەری مژدەپێ دراو، چاوەچاوت بوو.
وا دەزانی دوێنێ بوو: هاوسەرە نوورانیەکەت، جوانیی هەموو بوونی لە خۆیدا کۆ کردبۆوە. پێستی زگی تەنک، هەموو جەستەی نەرم و شلی بێ نیازی گەمەی نێر و مێ، بزوان و هەڵسوکەوتی ئارام و جمکی ترس و بەختەوەری لە چاوانی دەباریین. تۆش، هەمیشە لە سەر زارت بوو: «ئافرەت، ئاگاداری کوڕەکەم بە. ئازاری نەدەی ها!». لەپت بە زگیدا دێنا و بانگت دەکرد: «کوڕە هۆ هۆ کوڕەکەم هۆ!... دە دەرچۆ کوڕی خۆم!».
دەڵەمەی تازە خولقاوی ناو هەناوی هاوسەرەکەشت کە دەتگوت ئاشنایەتی لەگەڵ دەنگتدا هەیە، لە وەڵامدا، خۆی دەبزواند. هاوسەرەکەشت بە نازێکەوە کە زۆر جوانی لێ دەهات، پێی دەگوتی: «کوڕەکەت بە لەقە کوشتمی!... خۆ ساتێ داناساکێ... نازانم یاری بە چ دەکا...» بە جووتە پێدەکەنین و ئامێزتان پێکدا دەکرد و بە بێ نیازی گەمەی ئادەم و حەوا، دەمولێوی یەکترتان دەمژی. هاوسەرەکەت، ڕیزە ماچی دەپچڕاند و بە

نازەوە چەپۆکی بە زگی خۆیدا دەدا: «داکاسرێ کوڕە...»
وا دەزانی دوێنێ بوو: بەرەژانی مژدە هات... ژانی مژدە هات... کاتی پەیدابوونی پیرۆزترین ئەرکی سەر شانت هات. وەک کۆیلەی بەردەمی پەیکەرێکی پیرۆز، لە بەردەم پەیکەری هاوسەرەکەتدا کەوتیتە سەر چۆکان. پێت وا بوو دەستت دەگاتە بەرۆکی یەزدان و بۆ پاراستنی جووتێ ژیانی پیرۆز ڕایدەتەکێنی. ژان زۆری بۆ هێنا و تۆش پتر بە چۆکدا چووی. پشتی مامانەکەت دەدی کە بەر دەرگای پیرۆزی بوونی لێ گرتبووی. شەرمت کرد... بە خۆتدا شکایتەوە و خۆت لەو دیمەنە دزییەوە. واقەی بوونەوەرێک تێکەڵاوی دەنگی ژنانەی مامانەکە بوو: «کوڕە... وەڵڵا کوڕە...» هەناسەیەکت هەڵکێشا و پشتت بە دیوارەکەدا دایەوە. لە بۆشاییەکی بێ بن و بێ سنوور ڕامای. هێمن و بێدەنگ، وەک ئەوەی کتوپڕ گەوهەر و مەرجان و زێڕی هەموو جیهانت پێ بەخشرابێ و دەستت بە سەر سامانی سلێماندا گرتبێ، گەشکەدار بووی.
وا دەزانی دوێنێ بوو: چوویتە دیوانی کوڕەکەتەوە. بە بزەی بەختەوەرییەوە دەڕۆیشتی. هەموو شانەکانی جەستەت، بۆ ئەو چەند هەنگاوە، داوای ڕاکردنیان لێ دەکردی. فریا نەکەوتی بڕیاری ڕاکردن بدەی، گەیشتیتە حزووری ئەو بوونەوەرە پیرۆزە. بە دیارییەوە، کەوتیتە سەر چۆک و لێی ڕامای: کۆرپەیەکی بچکۆلانەی بێ دەسەڵات، هێزێکی ئەفسووناوی وای تێدا بوو، جەستە زەبەلاحەکەی تۆی بە لای خۆیدا ڕاکێشا و بە سەریدا چەمایتەوە... بە ئاستەم لێوت بەر ناوچەوانی کەوت. بزە لێوی بەر نەدەدای. زۆرت لە خۆت کرد و سەرت بەرەو هاوسەرە پاڵکەوتووەکەت هەڵبڕی. دەتویست بۆ ئەو جوانترین و بەنرخترین و پیرۆزترین دیارییەی کە پێشکەشی کردی، سوپاسی بکەی. کە ئەوت دی، بزەی سەر لێوت وەک ڕەوە چۆلەکەی ترسێندراو، هەڵفڕی. مات و سەرسام بووی: هاوسەرەکەت بە پاکەتە جگەرەی .بەتاڵ و قوپاو دەچوو. دەتگوت توێکڵەهێلکەیە و زەردێنە و سپێنەی لێ دەرهێندراوە و ئەو ناوەی لێ پیس کردوویی. ڕوناکایی

له سیمایدا نەمابوو... بۆر و ناشرین و باریک و شکاو و قوپاو و سەقەتبوو، لە ژێر پەتوویەکی تەنکدا وەک مردووی بۆنکردە ڕاکشابوو. هەستت دەکرد لە بوونی بێزاری. بێ ئەوەی بە کەڵکی هیچ بێ بۆشاییەکی لە ماڵەکەدا پڕ کردبۆوە. بۆنی دەهات... بۆنێکی ناخۆشی وای لێ دەهات کە بەرگەت نەدەگرت. ڕووت بە لای کۆرپە تازە مێوانەکەدا وەرچەرخاندەوە: تیشکی ڕوناکایی لێ بەرز دەبۆوە. لە ناخی خۆتدا، خۆت دەدواند: «دەبێ ئەو توێکڵە هێلکەیە فڕە بدەم... بۆنساردیی، ئەم کۆرپە ناسکە دەتاسێنێ».

زەینت دایە کۆرپەکەت. بە کاوەخۆ، زۆر بە کاوەخۆ، چاوە خۆڵەمێشییە بچکۆڵانەکانی بە بۆشاییدا دەگێڕا. بزە کەوتەوە سەر لێوت. لە سەیرکردنی تێر نەدەبووی و نەدەبووی. تۆش وەک ساواکەت بە دەم مەلایەکەتانەوە پێدەکەنیت. جارێکی دی سەرت بەرەو هاوسەرەکەت هەڵبڕی و بزەی سەر لێوت تارا. بە بیرتدا هات ڕاپەڕی و بە کۆڵیدا بدەی و بیبەیتە سەر زبڵدان... وەک توێکڵەهێلکە و ترشیاتی بۆنکردە و کاڵەکی هەتاوبردە فڕەی دەی. بەڵام خۆت ڕاگرت: «ئەدی ئەم کۆرپەیە چۆن بژی؟!... ئەو جەستە ڕزیوە، سەرچاوەی ژیانی ئەم بوونەوەرە پیرۆزەیە... تا ئێستا ناوکی بە هەناوی ئەوەوە لکابوو و ئێستاش دەمی بە مەمکیەوە دەلکێ.»

ڕۆژ بە ڕۆژ کۆرپەکەت خڕ و خەپان و جوانتر و سەرنجڕاکێشتر دەبوو و ڕۆژ بە ڕۆژیش هاوسەرەکەت زیاتر و زیاتر لە کەڵک دەکەوت و لە بوونی بێزارتر دەبووی. هەستت دەکر نابێ هیچ بوونەوەرێک لەگەڵتدا بەشدای ئەو سۆز و خۆشەویستییە بێ کە تا ئەوپەڕی تاساندن تاساندبووتی. پێت وابوو خۆشەویستی ئەو کۆرپەیە بە قەوارەی هەموو جیهانیش بێ، ئەو توێکڵە هێلکەیە نیوەیت لێ زەوت دەکا... هەموویت بۆ خۆت دەویست. تۆزقاڵەکەی یەزدان بوو لە بوونتدا یا بەشەکەی ئەهریمەن بوو کە بوو بە هێزی ڕوخاندن و بە ڕەتبوونی یەک ئارەزوو بە ناختدا، ژنەکەت مرد. مرد و بەشەکەی خۆی لەو کۆرپە ئازیزەدا بۆ تۆ، بە بەتاڵی جێ هێشت. خۆت بۆ پاراستن و گەورەبوونی تەرخان کرد. ناخت کڕنۆشی بۆ دەبرد و پێت

وا بوو، ئەو گڕە و تۆ گڕپەرست، ئەو بتە و تۆ بتپەرست، ئەو خۆرە و تۆ خۆرپەرست...

وا دەزانی دوێنێ بوو: خۆت بە براوە دەزانی و هاوسەرەکەت دۆڕاو. خۆت بە پاکژ دەزانی و هاوسەرەکەت بۆگەنبوو، خۆت بە یەزدان دەزانی و هاوسەرەکەت ئەهریمەن، خۆت بە چەقی چاکە دەزانی و هاوسەرەکەت چەقی خراپە. بیرت دەکردەوە: «هەموو مردووەکانی جیهان شێوەیان بە یەک دەچێ. هەموو ساوایانی جیهان بە یەک دەچن... هەموو نەخۆشە مەنگۆلییەکان بە یەک دەچن... سیمای هەموو ڕەدووکەوتووەکان بە یەک دەچێ... هەموو پیاوکوژان بە یەک دەچن... بەڵام هەموو باوکان بە یەک ناچن».

ئێستا، وا لە پەنا بەردێکدای. جارێ تەماشای پێش خۆت دەکەی تا خۆت لە فیشەکی نەیارەکانت بپارێزی، جارێ ئاوڕی ئەو لایە دەدەیتەوە کە کوڕەکەت سەنگەری لێ گرتووە و جارێکیش بە بزەوە لە باسکی چەپت دەڕوانی کە پەڕۆیەکی پێوەیە. بیر لەوە ناکەیتەوە چزەی گوللـەیەک بتپێکێ. لەوەش ناترسێی کوڕەکەت بپێکێ... پێت وایە ڕووحت چەپەرێکی پۆلاییە و لە بالای ئالاوە و دەیپارێزێ. هەموو حەواست نوقمی بەختەوەرییە چونکە کوڕەکەت بە «هەڵۆ» ناوی دەرچووە و سەرکردەی دەستەیکی وەک خۆی «هەڵۆ»یە. بزە کەوتە سەر لێوت و خەیاڵ لوولی دای: «هەر خۆم دیتم چۆن وردە وردە گەورە بوو. کەوتە سەر پێ، دەڕۆیشت و بە لادا دەهات و بەر دەبووەوە. هەر خۆم یەکەم وشەم لە زاری بیست کە (باوە) بوو. هەر خۆم فێری بەستنی دۆخین و قەیتانی پێڵاووم کرد. هەر خۆم فێری پیتی (ئەلف)م کرد... هەر خۆم زەینم دەدایە گەندەمووی سمێڵی کە هێواش هێواش زیادی دەکرد... کە گۆی مەمکی وەخروو کەوت، ئەو ڕازەی هەر بە خۆم گوت... هەر خۆم هەستم کرد دڵی کردوە و کچان بۆی بە عەزرەتەوەن... یەکەم جار، هەر خۆم درکم بە (هەڵۆ)ییەکەی کرد. دایکی، لە هەموو ئەوانە بێ بەش بوو... هیچی نەدی... نەیدی

چۆن هێواش هێواش گەورە بوو و گەشەی کرد. ئەگەر لە بەهەشتیش بێ هەر چەتیوەی هیچ نەدیوەیە. من گەشەکردن و گەورەبوونی جوانترین بوونەوەری خودام دی».

شلّپەی گوللە لە بەردەکەی بەردەمت هەستا و خەیالّتی سمی. لە کەلێنێکەوە ڕوانیت: لاوێکی باریکەلە، لە پەنا بەردێکەوە بۆ پەنابەردێکی دی، کەلّئاسا بازی دەدا. لە هەر پەنا بەردێک، جارێک، لە پەڕۆکەی باسکی چەپی خۆی دەڕوانی کە دژ... نا... پێچەوانە... نا نا، دوژمنی ڕەنگی پەڕۆکەی باسکی تۆ بوو. هەر لە تەمەنی کوڕەکەی خۆتدا بوو... وەک ئەویش گورجوگۆلّ و نەترس و \»هەلّۆ» بوو. هەمان شێوە بەرگی پۆشیبوو. جیاوازی هەر ئەوە بوو کە بە بەر چاوتەوە گەشەی نەکردبوو و ڕەنگی پەڕۆکەی باسکی ئەوە بوو کە لێی بەلەسە دەبووی. بە دلّ سێرەت لێ گرت... بە ڕقێکەوە سێرەت گرت کە بەشی سووتاندنی هەموو ئەو بەدانەی دەکرد کە کوڕەکەت لە دژیان تاو دەدا و تیژ دەکرد. بە خۆتت گوت: «یەک ئازا هەیە و نابێ بە دوو... یەک کوڕ هەیە و نابێ بە دوو». یەک فیشەکت تەقاند و کەلّە نەیارەکەت پێکا. لە بەر خۆتەوە بزەت هاتێ. دەتگوت گیانی هاوسەرەکەت بە دیارتەوەیە و بە بەخیلی پێبردن بەختەوەرت دەکا.

شەڕ بڕایەوە و ئێوە براوە بوون... وەک هەمیشە براوە بوون... هەمیشە هەر خۆتان براوەن و کەسی تر نا... بەرەو ئەو بەرەیە وەڕێ کەوتی کە کوڕەکەت سەرکردەی بوو. لە سیمای دەستەکەیدا زانیت شتێکی لە قەومان نەهاتوو قەوماوە. خورپەیەک، وەک خزەی چەقۆ بە دلّتدا هات. تەوژمی هێزێکی موگناتیسیی، لە سینگتەوە دەرچوو و پێشت کەوت و هەوساری هەموو حەواس و خەیالّتی گرت... ڕایکێشای تا گەیشتیتە پەناکە:

کوڕەکەت: هەر کۆرپەلّەکەی جارانە و بە بێ دەنگیی ڕاکشاوە. بە دەم مەلاّیەکەتانەوە بزە ناکا. سەر سینگی شەلاّلی خوێنە. خوێنەکەی، لە گەلّ ئەو کۆسکەوتنەشدا، ئەوەی بیر خستیتەوە کە دەمێکە ڕەنگی سوورت

نەدیوە... دوو ڕەنگ نەبێ هیچ ڕەنگێکی ترت نەدەدی... یەکێکیانت بۆ کرنۆش بۆ بردن بوو، ئەوی تریان بۆ نەفرەت لێ کردن و جنێو پێدان و خۆ بەتاڵکردنەوە لە ڕق. دەتگوت ئەو ڕەنگە، دۆستێکی دێرینە و پاش عەیام و زەمانێکی دوور و درێژ هاتۆتە سەردانت، بەڵام هەواڵی مەرگی جگەرگۆشەکەتی پێیە بۆیە وەختە وەک ڕەنگە نەیارەکە لات دزێو بێ. لە کاکۆڵە خۆڵاوییەکەی کوڕەکەت ڕوانی: دیمەنێکی تری بێ هاوتای جگەرگۆشەکەتە: نەرم... نەرم... لەگەڵ کزەبای ئەو دەمەو ئێوارە فێنکەدا، بە دەم هەوەسی سەرکەوتنەوە دەلەرێتەوە. کوڕەکەت، پشدێنەکەی ترازاوە و نازانێ بیبەستێ. جارێکی دی بوویتەوە توێکڵە هێلکەی بێ زەردێنە و سپێنە. بەڵام ئەم جارەیان پڕی لە گڕی ئارەزووی بە توێکڵکردنی هەموو باوکان... بە توێکڵکردن بووە ئامانجت... ئاینت.... باوەڕت... بووە جگەرگۆشەت و جێی کوڕەکەی بۆ گرتیتەوە. دەڕوانیتە قژی کۆرپەکەت و لە بەر خۆتەوە دەڵێی: « خۆ دایکی، ئەمەشی نەدی... ئەە کە جوانە!.»

# دابڕان

وەک بادەم، ڕەق و وشک و چیڕ و چاوقایم بووی. وەک بادەم پڕبووی لە ژیانی شاردراوە و نوستوو. پەنجەی پێت، لە ڕەگی نادیاریانەوە، خۆشاوی زەوییان دەمژی و ژیان بە دەمارە وردیلەکانی جەستە بچکۆلە لاوازەکەتدا دەکشا. بە زەوی دەژیایت و زەوی پێت دەژیا. لەگەڵ خاکە خۆڵەمێشییە هەزار جار سووتاوەکەی ئاواییدا تێکەڵاوی یەک دەبوون. تەن و گیانتان تێکەڵ بە یەک دەبوون. تۆ دەبوویتە خاک و خاکیش لە تۆدا خۆی دەنواند. ڕەنگی یەکترتان دەگرت... وەک (قەبرسان گەورە) و (قلینج) و (قومساڵ) بووی بە بەشێکی ئەو خاکە و وەک دار توووەکەی دەم جۆگە ئاوەکە ڕەگی نادیارت تێدا داکوتا.

خەڵکی دێ، لە دوورەوە لوتکەی هەیبەسوڵتان و پیرەمەگروون و خاڵخاڵانیان پیشانی یەک دەدا تۆش لە قنچکە بەرد و دەنکە زیخ و سەر و ملی قالۆنچە وسەری بزێوی مێش و پێی هەزارپێی بن بەرد ورد دەبوویتەوە. دەنکەزیخت وەک دانەی گەوهەر دەهاتە بەر چاو و لە چەند لاوە دەچروسکایەوە. بەردت هێندە لە چاوت نزیک دەکردەوە تا بە

بارتەقای پیرەمەگروونی بەر چاوی گەورەکانی لێ دەهات. خەتوخاڵ و دەمار و ڕەگی بەردی پڕ مشتت بە پاڵوپەسێو و پەڵەبەفری خاڵخاڵان دەچواند. بەردی پڕ بە مشتە بچکۆلەکەت کلۆری وەک ئەشکەوتی چیای تێدا بوون. بەردی وات خۆش دەویست. زمانت پێدا دەهێنا و تامی خۆڵت دەکرد. بەردی خڕ و لووست بەلاوە پیرۆز بوون و بەختت پێ دەگرتنەوە. تەمەنت گەورە دەبوو. ڕۆژگار یەکیان دەشێلا و ساڵ سواری سەری یەک دەبوون. کەچی جەستەت وەکی خۆی دەمایەوە. سەرت قایل نەدەبوو بەرەو سەرێ بکشێ و لە زەوی دوور کەوێتەوە. چاوت ڕازی نەدەبوون لەو دانە گەوهەرانە دور کەونەوە... بەلام هۆشت، وردە وردە فراوان بوو. هۆشت، کە لە دوو کۆلان پتر بڕی نەدەکرد، سنووری کۆلان و عاقاری زەویوزاری ئاوایی بەزاند و تا دوورتریش بڕی دەکرد. ولاتی خۆت ناسی. ولاتی تۆ چوار پێنج گوند بوون کە جاروبارێ، ژنیان لێک دەخواست و بە شایی و شینی یەکەوە دەچوون. گوندەکانی ولاتەکەت، لە یەکەوە دیار بوون و بە بازنەیەکی خڕی گردی خۆڕسک دەوریان گیرابو. لەملاوە، کەمەی کەلی کوردەمیل و سێکانیان بوو. لەولاوە، گردەکانی دارەمان بوو کە ئێوارەیەک نەبوو خۆر قووت نەدا. لای ژووریشەوە، هێندێ گرد و گردۆلکەی دی باوەشیان بۆ دێیەکەت و دنیاکەت کردبۆوە. ئەوە دنیای تۆ بوو و گوندەکەشت چەقی ئەو دنیا بازنەییە بوو.

بەهاران، گوڵەزەردەت لە ناو زەوی لماوی شێداردا هەڵدەکێشا. هەرچەندە سووک بە دەستە بچکۆلانەکانتەوە دەهاتن بەلام لەگەڵ هەڵکێشانی هەر تەڵێکدا، زەوی نرکەی لێوە دەهات. نرکەی زەوی بە نرکەی کێلانێ دەچوو کە خەنجەرەکەی بۆ خۆسوورکردن هەڵکێشێ. نرکەی زەوی بە نرکەی دایکێک دەچوو کە منداڵ لە منداڵدانیدا ترازابێ. گوێچکەت بە زەوییەوە دەنا، گوێت لە وژەوژ دەبوو. گوێچکەت دەخستە سەر بەردێکی خڕی پڕ بە مشتت کە نیوەی لە ناو خاکدا چەقی بێ. گوێت لە چپەچپی گوڵەزەردەی شەرمن و فەریکە جۆی تازە شیر تێپەڕیو

دەبوو. چپەیان تێکەڵاوی هاژە و وژەی لافاوێکی نادیار دەبوو. لە ڕەگی گوڵەزەردەی دەستی خۆت ڕادەمای. هەر ڕەگێکی سەدان دەنکە زیخی شێداری پێوە بوو. ڕەگی گوڵەزەردە سپی بوو. بە ڕەگی ترپە بەغدایی بێ سەرک دەچوو. گوڵەزەردەت دەچنی و دەتکرد بە کڵاقۆڕی. تۆ و هەموو منداڵانی ئاوایی ، بەهاران کڵاوقۆڕیتان دەچنی. هەموو جارێ کە کڵاوەکەت دەنایە سەرت، بالۆرە نەمرەکەی منداڵانت بیر دەهاتەوە و لە بەر خۆتەوە دەتگوت:

- گوڵەزەردە گوڵی کردووە دایک حەسەن دوو شووی کردووە. لەبەر ئەوەی دایکی تۆ فریای ئەوە نەکەوتبوو دوو جاران مێرد بکا، دڵت خۆش دەبوو.

- دایک بمرێ لەوە چاترە دوو جاران مێرد بکا. دایکی من مرد. من دایکی خۆمم نەدیوە... خوایە دەبێ دایک چۆن بێ!. ئەوەت لەبەر خۆتەوە دەگوت و سەیری پەنجە قوڕاوییەکانی پێی خۆت دەکرد. دڵت خۆش دەبوو کە هێشتا دڕکە پێکوڵو ڕەق نەببوون و بە پێتدا نەدەچەقین. هەستت بە ماندووبوونی ملت لە ژێر کڵاوەکەتدا دەکرد. گوڵەزەردە، تەڕ و ئاودار و قورس بوون و گرێی چنینیان، لێرە و لەوێ، بە ناوچەوانتدا دەچەقین و سووکە ئازارێکیان پێ دەگەیاندیت.

وەک هەر ڕووەک و گیاندارێکی ماڵی و کێوی، زەوی دەیژیاندی و پەروەردەی دەکردی و پێیدەگەیاندی. زەوی، هەموو شت و هەموو کەسێکت بوو. خۆ زەوی و بستۆکە پیرۆزەکانی نەبوونایەهەر دروستیش نەدەبووی. دایکت، ژنێکی نەزۆک بوو. تۆ، بە زەبری مەرقەدی پیاوچاکان پەڕیتە هەناوی دایکتەوە. (شامەغەریبە) و (باوەغولغول) و (خدرزندە) و باوەگوڕگوڕ لە خودا پاڕانەوە تا دایکت زگی پڕ بێ و تۆ دروست بی. لە بەر ئەوەی باوەگوڕگوڕ لە عاقاری بەر چاوت و لە ناو بازنەی دنیاکەی تۆدا نەبوو، بە لای تۆوە لە جیهانێکی دی بوو. دایکت، بەڕۆکی بەر نەدان و نەدان. تا زگی خۆی پێ پڕ نەکردن وازی لێ نەهێنان!.

وەک زالوو بە هەناوی دایکتەوە لکای. دروست بووی... پاشان، نرکەت لێ هەستاند و ترازای. دایکت، وەک زەوی بەپیت و خۆڕاگر نەبوو. دایکت هەر بەو نرکەیە مرد. نرکەی لێکدابڕان و جودابوونەوە کوشتی. بە کۆرپەیی، مەمکی ژنی هەموو ئاوایییەکەت دەمژی. هەموویانت کردن بە دایک و هیچیشیان دایکت نەبوو. مەمکی چرچولۆچت مژین. مەمکی گۆشتن و توند و پڕشیرت مژین. مەمکی وەک بەردەکەی ناو مشتت، ڕەق و بچکۆلەت مژین. ئاخر کچە عازەبێکی تازە پێگەیشتووش، وەک شەکەمەڕ، بە سەرتدا دەبانی و زوو زوو مەمکی لە زار دەنای... تەزووی سەیرت پێ دەبەخشی. پاش هەر مەمکمژینێکیش بەردی خۆڵاویت دەمژی... تۆ چ بووی؟!. نە تێر خاک دەبووی نە تێر مەمک. گردۆلکە دوور و نزیکەکان لە بەر چاوت وەک مەمک بوون. گۆیان هەبوو. خەمت لە گردەکان دەخوارد کە دەتزانی عەسکەر گۆپکە قوتەکانیان هەڵدەدڕین.
لە پڕێکدا، خۆشت نەتزانی چۆن زەوی دەسبەرداری سەرت بوو. خۆشت نەتزانی چۆن باڵات هەڵکشا و چۆن گەورە بووی. گەورە بوویت و ڕەگت زیاتر بە هەناوی ئەو خاکەدا ڕۆچوو. چاوت زیاتر بڕی دەکرد. ئەودیو دنیا بازنەییەکەش شارەزا بووی. پەییت بە گشت دۆڵ و تەلان و پاڵوپەسێوێکی ناوەوەی بازنەکە و دیوی ئەودیویشەوە دەبرد. دەتزانی لەودیو بازنەی وڵاتەکەت بازنەی دی هەن. دەتزانی لەوێش زەوی دەنرکێنێ و ئەوێش هەر ئەو خۆڵە خۆڵەمێشییە هەزار بار سووتاوەیە. گەورە بوویت و هۆشت فراوان بوو. تا خاڵخاڵان و هەیبەسوڵتان و پیرەمەگروون و ئەولاتریش بڕی دەکرد. بەڵام دەنکە زیخ و قنچکەبەردی ئاوایی لە بەر چاوت بچووک نەبوونەوە. لە بەر خۆتەوە دەتگوت: ـ ئەگەر قنچکە بەردێکی ئێرە ببەمە سەر پیرەمەگروون چ دەبێ؟!. بەردی ئەوێ ، دەیکەنە هاوڕێی خۆیان؟!. خاکی ئەوێ دەیگرێتە خۆی؟!. ئەدی لەوێ نارچێ؟!. نا... نا... بەدری ئێرە لەوێ هەڵناکا. هی ئەوێش لە بەر هەتاوی ئەم گەرمیانە هەڵناکا. بەردی ئێرە وەک گلێنەی چاو وایە و لە

جێی خۆی نەبێ نابینێ. هی ئەوێش وەک... وەک گوێیە بەو سەرەوە نەبێ ناژنەوێ. توخوا خوایە، با هەر شتە و لە جێی خۆی بێ... ئاوها، وەک هەیە چەند جوانە!.
گەورە بوویت و مەودای هۆشت فراوان بوو. خەتت دا. دڵت کرد. کەچی لە هەر کیژێ ڕادەمای سیمای دایکێکت دەدی. هەر کیژێکت وەک برکێک دەدی کە جووتێ مەمکی گوڵبەدەمی گرتبێ. دڵت وەک پشیلەی دەستەمۆ ئامادەی هەموو باوەشێ بوو. دڵت دا بە گشت کیژەکانی ئاوایی... بە کەسیشت نەدا. لە باوەشی هەموویاندا شیر و تیری خوشکی شیریت دەچروسکانەوە. هەموو ڕۆژێ مرخت لە سبەی خۆش دەکرد تا هێلانەیەک پەیدا کەیت و وەک زالوو بە هەناوی کێژێکەوە بلکێی. کەس نەیدەتاراندی... وەک سەردەمی کۆرپەییت باوەشی کیژت بۆ واڵا بوون. بەڵام کە سەرت دەخستە سەر سینگیان نەوسی منداڵیت دەبزوا. دەستت بۆ مەمک گڕ دەدا... دەتمژی و خەو دایدەگرتیت.
ساڵ سواری سەری یەک بوون. ڕۆژگار یەکیان شێلا... نە دایکێکت بۆ پەیدا بوو نە هێلانەیەک بۆ دڵت. لە هەموو شتێ دوودڵ بووی ئەوە نەبێ کە ئەو دێیە چەقی دنیایە، ئەو دێیە نەبێ زەوی دەمرێ... ئەو دێیە ناوکی دنیایە.
دەڵەدێوێ وەک هەوری ڕەش لێت پەیدا بوو. چنگی لە سینگت گیر کرد. ڕەگی پەنجەی گەیشتە دڵت. ڕایتەکاندی و کرتەی لە ڕەگت هەستاند. زەوی نرکەی لێوە کات. خاکە خۆڵەمێشییە هەزار جار سووتاوەکە زریکاندی... هەڵیکێشایت و بردتی. زەوی نەمرد. ئەگەر زەوی بەو نرکانە بمردبا هەر لە سەرەتاوە دروست نەدەبوو. تۆش نەمردی. ڕەگت لە سەرتەوە دەرکرد. لە چاوتەوە، لە گوێچکەکانتەوە، لە دەمتەوە و لە سینگتەوە ڕەگی وەک ڕەگی گوڵەزەردەت دەرکرد. هەر تاڵێکی، هەزاران دەنکە زیخی وردی پێوە بوو.

*** 

گەیشتیتە وڵاتێکی خاک نەسووتاوی بێ گرد و کەمە. وەک ئەو دەمەی کە لە دەنکە زیخ و قنچکە بەرد ورد دەبوویتەوە، لە جەستەی دەڵەدێوە هاوسەرە دایکانەکەت ورد دەبوویتەوە:
ئەم خاڵە لەویان ڕەشترە. ئەم خاڵە لەمیان خڕترە. سەری ئەم داوە قژە قەڵەشاوە. ئەم گۆ مەمکە، کونێکی بۆ شیر لەویتریان کەمترە. لێی ورد دەبوویتەوە. لە خەتەکانی ناولەپی، لە گەندەمووی مەچەکی و لە زیپکەی باسک و لاملی ورد دەبوویتەوە. نەتدەزانی لە چ دەگەڕێی. وێڵی دوای نهێنییەک بووی کە لە خۆشت نهێنی بوو. ئەوەی ویستت لە خاکی ئەو جەستەیەدا نەبوو. وەک قەوزە بە سەریەوە مای. بۆ ئەوەی بتنوێنێ دەبوو مەمکیت لە زار نێ.
بەرەو وڵاتێکی بێ گۆی دی و بەرەو باوەشێکی نادایک خۆت ڕاپسکاند. دەڵەدێوە هاوسەرەکەت نرکەی دابڕان تەزاندی. نرکەی دابڕان پەکی خست. وەک بنێشتەتاڵەی بەر خۆرەتاو داچۆڕایە ناو خاکەوە.
هیوای هێلانەی دڵت چکی کرد. چی دی بە دوای باوەشێکدا نەگەڕای کە بە باوەشی ئەو هەموو دایکە نەچێ. بە خەیاڵ، ژنێکت داڕشت ; قژی وەک قژی ڕەعنە بوو. دەمی وەک دەمی خەجێ بوو. چاوی وەک چاوی ئامە بوو. مەمکی!... هیچ ژنێکت وەبیردا نەهات کە سۆزی دایکێکی تێدا نەبێ. ئەو ژنەی کە داتڕشت، وێنەی بە دار تووەکەی دەم جۆگە ئاوەکەی ئاوایی دەچوو.
تۆ لە وڵاتی بێ گرد و گۆ و کەمەوە، دارتووەکەش لە خاکی شیرتێپەڕیوی بە ژیان ئاوسی ئاواییەکەتەوە، چاوبرکێتان دەکرد. ڕەگەکانی کەللـەسەرت، زیخەکانی هەڵوەرین. گەڵا و گۆپکەت سیس هەڵگەڕان. کز و سیس بووی. هێواش هێواش دازایتە ناو تاریکاییەکی بێ ئامان و بێ سەر و بنەوە. شتێکت، شڵپ بەربووەوە. جەستەت بوو و ڕما. وەک دیوارێکی ڕزیو. هەستت بە لەزەتی هەڵوەرینی جەستەت دەکرد. هەستی ترت بۆ پەیدا بوو. دەکشای. وەک بەردێکی پڕ بە مشتی منداڵیت کە بەرەو

بنی بیرێکی بێبن هەڵدرابێ، دەکشای. تیژ دەکشای بەڵام جەستەی داتەپیوی خۆتت دەدی کە ڕەگەکانی کەللـەسەری وشکەوەبووی، خۆیان لە ملی ئاڵاندبوو. جەستەکەت، وەک کەرتە دەرخۆنەیەک، وەک هەنگڵی ڕەقهەڵاتوی مەشکەیەک، وەک سەرەتەشییەکی بێ کەڵک یا هەر شتێکی لەکەڵک کەوتووی سەر زبڵدان دەهاتە بەرچاو. خەمت لێ نەدەخوارد. ئەو جەستەیە، چی دی خۆشەویستت نەبوو. جیهانەکەشت، وەک گۆ خڕ بوو. پەمەیی بوو و لە هێندێ جێوە پەڵەی سووری پێوە بوو. ڕەگ و دەماری وەک خوێنی تێدابوون. نە ئازارت هەبوو نە خەم. هەستت دەکرد لە نێوان دوو بەرداشی زەبەلاحدا دەهاڕدرێی. خرمەخرم و قرچەقرچی ئیسکەکانت هێند پێ خۆش بوو پێت وا بوو تەزووی حەزت پێدا دێ. داچۆڕای. بە ناسروشتی داچۆڕای. هەموو شتێ بەرەو زەوی دادەچۆڕێ کەچی تۆ بەرەو حەوا داچۆڕای. سووک سووک بەرەو حەوا کەڵکشای. دەستت لە جەستەت گێڕا و هیچت وەبەر دەست نەکەوت. هەستت کرد دەستیشت نیە. ڕوانیتە خوارێ: دنیا خڕ و بازنەیی بوو. هەزار بازنەی بچووک بچووک لە ناو بازنەیەکی گەورەدا پاڵەپەستۆیان بوو. یەکێکیان داگیرسابوو. دەستت لە جەستەت کوتا. نە لەش هەبوو نە دەست. لە خۆت و بازنە داگیرساوەکەت پرسی:

ـ هەی هەی!. کوا جەستەم؟!. هەی هەی!... من کوام؟!.

خۆت نەدەبزواند کەچی دەبزوای. بەدەم باوە دەهاتی و دەچووی. وەک بەوری بەر با بووی، قورساییت نەبوو. سووک سووک دەهاتی و دەچووی. نە دەتویست ببزوێی نە هەوڵی بزوانت دەدا. دەبزوایت و بەر پەنا و قوتەی گرد دەکەوتی. بە هیچ گردێکەوە نەدەگیرسایتەوە. بەرەو هەناوی شتێ دەبزووتی. چی بوو؟!. چ نەبوو؟!. ئەو شتە تاریکایی بوو یا ڕۆشنایی؟. نەتدەزانی. شنەی بایەک، سووک سووک یاڵە و یاڵی گردەکان دەیبردی و دەیهێنای. هەر لەخۆڕا دەخولایتەوە و هەر لەخۆڕا بە دووی هەناوێکدا دەگەڕای...

* * *

دارتووەکەی دەم جۆگاکە، هەموو ڕۆژێ، بەیانیان چاو دەبڕێتە کەمەی کەلی لای خۆرهەڵات:

ـ هاکە هاتیتەوە... هاکە هاتیتەوە بەر سێبەرەکەی و هەردوو قاچت خستنە ناو جۆگەئاوەکە... هاکە هاتیتەوە و ژیان بە دەمارە وردەکانتدا، بە ڕەگەکانی پەنجەتدا کشا.. هاکە بە خۆت و بەردێکی خڕەوە دانیشتیت و ڕەگی نادیارت لە پەنجەی پێتەوە داکوتا. هاکە لەگەڵ خۆری ڕۆژێکدا هەڵهاتی و گەڕایتەوە ناو خۆڵە هەزار جار سووتاوەکەی ئاوایی. هاکە هاتیتەوە و بووی بە دەنکە زیخی دەوری ڕەگی گوڵەزەردە و پێی هەزارپێ و قنچکە بەردی نێوان پەنجەی وردی منداڵی بێ داک و باب... هاکە هاتیتەوە و بووی بە گۆی گردێکی ئەو دنیا بازنەییە و کەس نەیتوانی هەڵتکۆڵێ.

سەرنج: هێندێ وشە و زاراوەی توێی ئەم چیرۆکە، تایبەتمەندی گوندی (حەساری گەورە)ن.

## ١٩٦٣

«بە دەستی خۆم... بەم دەستانە ڕزگارم کرد و گۆشم کرد. بەم دەستانەی خۆم گوێچکە بچکۆلانەکانیم هەڵقڵیشاند... کە دایکی بە لەرزەک مرد، ئیدی خۆم بەخێوم کرد. مەڕم بۆ دەدۆشی، بزنم بۆ دەدۆشی... شیرم لە ژێر سەلەشیرەکە دەدزی بە بەرخە شگێرم دەدا. بەرخە شگێر هۆگرم ببوو، یەک بست لێم دوور نەدەکەوتەوە و منی بە دایکی خۆی دەزانی. بە کۆرپەیی چۆن بوو، بە کاوڕیش هەر وا بوو... ئێستا شەکبەرانە و هەر وایە...»
محەد، دڵی بە کورە ڕێویلە ڕەشتاڵەکەی دەسووتا. دەیزانی زۆری ئازار داوە: «هەر چۆکی نەشکابێ!...»
وردە وردە بەرولای چوو. دەستێکی بە قژەکەیدا هێنا. قژی پڕ بوو لە کا و کۆتەڵ و وەک دڕکی ژیژک ڕەق بوو. دەستێکی بە چۆکیشیدا هێنا...
- کوڕەکەم ئاخر بۆ تووڕەم دەکەی؟!. ئێ من بڵێم چی؟!. دەسەڵاتم چییە؟!.
- بۆ... بۆ... بۆ...»!.

- بۆ بۆی چیتە؟!. هیچم پێ دەکرێ؟!.
- بۆ بەرانە شگێرت دا پێیان؟. هی خۆم بوو... خۆم ڕزگارم نەکرد؟. خۆم گۆشم نەکرد؟. خۆم بەخێوم نەکرد؟.نەمدەهێشت شەقڵداڵی پێوە بێ. نەمدەهێشت پێکوڵە و زەردەسیری و فەریکە چەودەر بە بەرگنەکەیەوە بێ، هەموو ڕۆژێ یەک حەمکەم لێ دەکردەوە... هی خۆم بوو خۆم...
- کوڕی خۆم خەمت نەبێ. بەرخەنێرێکی تر پەروەردە بکە بابۆ خۆت بێ. ئێ؟.
- نا... هیچم ناوێ... بۆ داتێ؟. خۆی کەمی هەیە؟. پێنجسەد سەر مەڕی هەیە...
- ڕۆڵە گیان چما نازانی زستانێ گەنممان ناما، ئارمان لێ برا؟!. ئەدی نازانی گەنممان لە مامە بایزت قەرز کرد؟. ئێ ئەو ئێستا پەڵپی گرت و بەرانەکەی لێ ویستین. خۆ تۆ وا گەورە و تەواوی... دەبێ ئەو شتانە بزانی، کوڕی خۆم.
- بەرانە شگێر هەر لە ناو ڕانەمەڕەکەی خۆیـان بوو... منیش بە هۆی بڕکە مەڕێکەوە ببووم بە دوا شوان و یارمەتی شوانەکەیانم دەدا. مەگەر بەرانە شگێر دووی مەڕی بەبەران کەوتبا دەنا قەت لێم دوور نەدەکەوتەوە. بابە گیان مب بەرانەکەم دەوێتەوە.
محەد، هەم دڵی پێ دەسووتا و هەم خۆی بە بێ دەسەڵات دەزانی. تووڕە بوو... زللـەیەکی پێدا ماڵی و لەگەڵیدا قیژاندی:
- دە بیبڕەوە!...
منداڵی تاین بە تکا چو. من دەڵێم دوو دەقیقە، تۆ بڵێ پێنج... دەموچاوی وەک خم شین هەڵگەڕا. باوکی بە دیاریەوە ئەبڵەق بوو. بە کزییەکەوە دانیشت و بە خۆیەوە نووساند و گەرووی پڕ بوو لە گریان:
- باوکەکەم!... کوڕە شیرینەکەم!... کاکە!... (کاکل) کەم!... دە بەسە...
ئیدی کاکل، ڕووی لە ماڵی مامی نەکرد و لەگەڵ شوانەکەیاندا نەدەچووە

دەشت و دەر. کاکل، غەنزلّی... مانی گرت، لەتوپەتت بکردبایە نەدەچووە بەر مەڕ. هەموو ڕۆژێ، دوو جاران بەرانەکەی دەدی. لەگەڵ یەکەم گزنگی هەتاودا دەچووە سەر کۆلەکە و چاوەڕوانی مەڕئاودانی دەکرد. کە ڕانەمەڕی ماڵی مامی ڕووی لە سەراو دەکرد، ئەمیش بەرانە چگێری هەر لو دووڕرا بەدی دەکرد... وەک کەڵەهێوی سەری بڵند ڕادەگرت، سینگی پان بوو. کە لە عاقاری کاکل نزیک دەکەوتەوە، وردە وردە لە ڕانەکە جودا دەبووەوە و خۆی پێ دەگەیاند. شاخەکانی پێدا دەسوو. ئەویش باوەشی بە سەریدا دەکرد و ماچی دەکرد. درِک و زەردەسیری و چیلکەوچواڵی لە تیسکی خورییەکەی دەکردەوە و بە پەنجە باریکەکانی پشتەک و ملەکی شانە دەکرد... ئەوجا بەرەو کۆلەکەی دەبرد. ئێوارانیش هەر بەو تەرحە سەر کۆلی دەگرت و تا بەرانە شگێری نەدیبا لە جێی خۆی نەدەبزووت. تێر و پڕی ماچ دەکرد و چیلکە و قەسەڵ و درکی لێ دەکردەوە و بەڕێی دەکرد. ئیدی بەم کارەی تەسکینی دەهات و وەک ئەویندار هەر لە دوای ژوان چاوەڕوانی ژوانی داهاتوو وبوو و هەر بۆ وەی دەژیا... لە بەر خۆیەوە جنێوی بە مامی دەدا و هێندێ جار، باوکیشی نەدەبوارد: «ئاخ بەرانە شگێر... من نەبوومایە نەبوومایە دایکت هەر بە سەر تۆوە دەچوو و تۆش دەمردی. کە بەرخ لەدایک دەبێ، لە پێشدا هەردوو سمی پێشەوە و لمۆزی دێن، بەڵام تۆ وانەبووی... تۆ لاملت هات... من نەبوومایە دەمردی... ئەم سەگبابە چ غەزەبێکە!. خۆ نەیگوت ئەمە هی کاکلە و دەبا بۆ وی بێ... بە قەدەر یەک جوولەکەی هەیە کەچی چاوی لە بەرانەکەی من بڕی!... بەیانی زوو دەیبینمەوە!...»

* * *

بەرەبەیان، گوندی نوستوو، لە قرمەی تفەنگ و خرمەی ڕەشاش و هوڕوهۆڕی تانک و زیل و ئیڤا وەئاگا هات... هەر وەئاگا هاتن و نەهاتن لە خوار و ژووری ئاواییەوە، تالانکەران وەک پێکوڕە خۆیان بە گوندەکەدا

کرد و کردیان به هاتوهاوار و گەلحەجگەلحەج و بەربوونە ناو دێ. گڕ لە خەرمان بەردرا... مەڕ و ماڵات ڕاپێچ کران... ئەوەی بەرگی غەزەبی سەربازی لە بەر نەبووتاڵانی دەکرد، دەغڵ و خەرمان و خانووی دەسووتاند، سەربازیش لە چەک و فیشەک و شتی قاچاغ دەگەڕان و پێناسەیان لە پیاوان دەویست.

کاکل، برکە مەڕی ڕاپێچکراوی خۆیانی بیر چوبۆوە. چاوی لە ڕانەمەڕی ماڵی مامی بڕیبوو کە چەند تاڵانکەرێک پێش خۆیان دابوو. ڕانەمەڕەکە، جمەی دەهات. بەرانە شعگێر، وەک پیشەی پێشووی سەری خۆی بڵند ڕاگرتبوو و باوەشێ دونگی با دەدا و وەک ئەوەی نە بای دیبێ و نە باران، ڕێی دەکرد... ویستی لە ڕانەکە جودا بێتەوە و بەرەو کاکل بڕوا، تاڵانکەرێک دارێکی پێدا کێشا و گێڕایەوە. کاکل دەمی بەش کردەوە.

چاوی دابچڕیبوو و بە حەپەدساوی لە بەرانە شگێری دەڕوانی...

خانوو، قرچەقرچ دەسووتان. خەرمان لە دامرکاندنەوەدا بوون. مەڕ و ماڵات، مانگا و کەر و هێستر ، مریشک و جوجەڵە و مراوی، هیزە ڕۆن و کوپەترشیات، گسک و پاتیلە و قابلەمە و کەوچکی هەورامی، سێڵ و دەرخۆنە و تیرۆک... هەموو شتێکی بەکەڵک و هێندێ شتی بێ کەڵکیشیان لە دێیەکە پێچایەوە و ماشییەوە و بردیانن. کاکل هەر چاوی لە بەرانەکە بوو تا لێی ون بوو. دایە کاڵەی گریان... گریا... هەنسکی دا... بەرەو ماڵەوە چوو. خانووەکەیان هێڵەهێڵ دەسووتا... ماڵەکەیان ببوو بە دۆزەخێکی ئاگر و هیچی دی. ئەم گوێی پێ نەدا و هەر بۆ بەرانەکە دەگریا...

گوێی لە دەنگی تفەنگ بوو. ڕیزێ... دوو... سێ و چوار ڕیز کلاشینکۆف لە ژوور ئاواییەوە بەر گوێی کەوت. سڵەمییەوە... هەتاو ڕمێ بڵند ببۆوە... بەرەو لای مزگەوتەکە چوو. «هەر لای مامم بوایە باشتر بوو. خۆ هەر نەبێ ڕۆژی دوو جارم دەدی. دڕکم لێ دەکردەوە و دەستم بە پشتەکیدا دێنا... ئیدی نایبینمەوە... ئای...»

گەیشتە لای مزگەوتی گوندی گڕگرتوو. ژنان، قژی خۆیان کەڵاف کەڵاف دەردێنا. گۆنای خۆیان دەڕنی شینیان دەگێڕا. کەس ئاوڕی لە بڵێسەی مزگەوتەکە و پەڕەقورعان نەدەدایەوە. کاکل بە بینینی مزگەوتەکە، موچڕکی پێدا هات. ئەمە چییە؟!. باوژنیشی شین دەگێڕێ!... چووە پێشتر... ئەە... یەک دوو... کورە چیی!!... دە دوانزە پیاوی گوندەکە لە ناو خوێنی خۆیان کەوتبوون.

ـ باوە!... ئاااي ... باوە!...

ئەمجارەیان کاکل لە تافی دڵەوە بۆ باوکی دەگریا. دەمێ بوو هەموو گریانێکی بۆ بەرانە شکێر بوو. ئەم گریانە بێ فرمێسکەی کە لە هەناویەوە سەری هەڵدەدا، وەک گوندەکە تورە و دوکەڵاوی بوو. سەیری تەرمەکەی باوکی دەکرد. ئاوڕی لای تەپوتۆزی تاڵانکەران دەدایەوە... سەیری گڕ و دوکەڵی مزگەوتەکەی دەکرد... گریان بوو بە ڕق و هێز و وزە... گەورە دەبوو و گەورەی دەکرد.

# ڕزگاربوون لە بەختەوەریی*

ساڵ لە دوای ساڵ بە دەوری یەک بازنەی داخراودا، کە چێوەکەی حەوت ڕۆژان بوو، دەخولایەوە. تاکە شتێک کە دەگۆڕا هەر سیمای بوو کە حەفتە دوای حەفتە پیرتر و پیرتر دەبوو. ئەو بەیانییەش وەک هەر بەیانییەکی دووشەممەی تر، بەرانبەر سەعاتی قەد دیوارەکەی بەرانبەری دانیشت و چاوی لە چرکەژمێرەکەی بڕی. چاوەڕوان بوو تا سەعات بووە نۆ. بە دەم چاوەڕوانییەوە لە بازنەکە هاتە دەرێ: «گەورەترین بەختەوەری ئەوەیە لە مەترسی دەرباز بیت. دەڵێی ژیانی خۆتت دۆڕاندووە و وەرتگرتۆتەوە. کە پۆلیسە نهێنییەکان نووسراوی ناو گۆرەوییەکەمیان نەدەدۆزییەوە، دەبووە یەکێ لە ساتە هەرە خۆشەکانی ژیانم. کە بۆمباران دەبوو و بەرنەدەکەوتم بۆ من بەختەوەری بوو با دەوروبەریشم ببوایەتە جەستەی لەتوپەتکراو. تاکە کەس کە بە زندوویی دەما هەر خۆم بووم. دەتگوت لە ناوەندی گۆڕستانێکدا کۆشکێکم بۆ دامەزراوە. کە لە نێوان تاوێرە بەردەکاندا خۆم حەشار دەدا و لەشکر بە خۆیان و تانکیانەوە بە لامدا ڕەت دەوون

و بۆیان ئاشکرا نەدەبووم، پێکەنین دەیگرتم. زۆر بەختەوەری تری لەو بابەتەم دیتن بەڵام گەورەترینیان دوابەختەوەریم بوو، ئەوەش ئەوە بوو کە مافی پەنابەریم پێ درا و لە مەترسی دوور کەوتمەوە... ئەمەش وای دەگەیان کە چی دی بەختەوەری ڕزگاربوونم نەمێنێ.
بیری پۆلیسە نەزانەکان دەکەمەوە کە بیریان بۆ بڕیاری مۆرکراوی مەرگم نەدەچوو کە لە ناو گۆرەویدا حەشارم دابوو. بیری ئەو خۆشی و پێکەنینە هیستیریایە دەکەم کە دوای بۆمباران دەیگرتم، بیری تاوێرە بەردەکان دەکەم، بیری خودی ئارەزووی ئەو پەنابەرییە دەکەم، کە وەک دیمەنی ڕووی ئاو لە ئاسۆی دیدەم دانەدەبڕا. بیری مەرگی ڕێکەوت و ژیانی ڕێکەوت دەکەم کە بە گەمەی (ڕۆلێت)[°°]ی ڕووسی دەچوو».
سەعات بوو بە نۆ. هەستی دەکرد میلی سەعاتەکە بە بۆمبێکەوە بەستراوە و هەر ئێستا نا نەختێکی تر تقینەوەیەک بەرپا دەکا.
ئەوە پیاسەی حەفتانە بوو و دەتگوت گەشتێکە و بە ناو بازنەکەیدا دەیکا تا خەڵک ببینێ و گوێی لە دەنگی زندوویان بێ. هەموو ڕێی بازاڕەکە، بە چوون و هاتنەوەوە سێسەد و حەفتاهەنگاو بوو... ئەوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان تیرەی بازنەکە بوو و بە پیتی (Z) دەچوو. پێداویستییەکانی حەفتەی داهاتووی کۆکردنەوە و چووە بەردەم ئەو تاکە قاسەیەی کە لێی نەنووسرابوو «تکایە قاسەکەی تر!». پیرەژنێک کە یەک تەماتە و یەک پاکەتە کەرە لە سەبەتەکەیدا بوو و گۆچانێکیش بە دەستەکەی تریەوە بوو، هەموو بوونی دوودڵیی بوو تا گۆچانەکەی لە جێیەکدا دانێ، لە پێشیەوە بوو. ئاخرێکەی بەڕێ خرا.
کیژی پشت کاونتەرەکە بە بزەیەکی شیرینەوە گوتی: «ڕۆژباش!»
- ڕۆژباش!
گوێی لە دەنگی خۆی بوو وای وەڵام دایەوە. دەنگی بە ڕاستی بیسترا. ئامێرەکانی ئاخاوتنی عەیبیان نەبوو. ئەوە «ڕۆژباش»ی ئەو حەفەتەیە بوو و دەبوو تا بەیانی شەممەی داهاتوو بەش بکات.

جووتێ سەد کرۆنیی لە بەردەمی دانا و باقییەکەی و بزەیەکی جوانی وەرگرتەوە.

کیژەکە گوتی: فەرموو!

ئەمیش وەڵامی دایەوە: سوپاس!

دیسان گوێی لە دەنگی خۆی بوو. دوودڵیی نەدەویست کە ئامێری ئاخاوتنی عەیبی نییە. چەند وشەیەکی تر لەو زارەوە، نەک تا شەممەی داهاتوو، بگرە تا ڕۆژی پەسڵانێ بەش دەکا.

چەندی توانی بە پەلە لە بازاڕەکە دەرکەوت. دەتگوت منداڵە کۆرپەیەکی لەماڵەوە جێهێشتووە یا فڕنەکەی نەکوژاندۆتەوە. بە پەرۆشی جێی دانیشتنەکەی خۆیەوە بوو کە بەرانبەر تەلەڤزیۆنەکە و سەعاتی قەد دیوارەکە هەڵکەوتبوو. کتوپڕ، وەک ئەوەی بارێکی گرانی بە سەر شانەوە بێ، لە ڕێکردن خاو بووەوە. بیری کردەوە: «ئەو کیژە وەک بنیادەمێک بزەی بۆ نەکردم، بەڵکو وەک کڕیارێک. بزەکردن بەشێکە لە کارەکەی و نرخی لە سەرە. دەبێ بە درێژایی ڕۆژ بزە بکا تا پڕ دەبێ لە بزەی دەستکرد. پاشان کە دەچێتەوە ماڵی خۆی، پڕە لە تووڕەیی و نەفرەت لە نزیکترین کەسی خۆی. ناخۆشترین شت ئەوەیە بزە بۆ کەسێک بکەیت کە ڕقت لێیەتی یا لێی دەترسیت. ئای بنیادەمی کلۆڵ! ئەو کیژەی ئەوێ، وەک هەر ڕزقێکی بازاڕەکە نرخی لە سەرە و ڕەنگە سەعاتی شەش دۆلار لە سەر بازاڕەکە بکەوێ. دەبێ هەر سەعاتە و بایی شەش دۆلار بزە بکات و ئەگەر نەیکا، ئێکسپایەر دەبێ و دەبێ لە بازاڕەکە دوور دەخرێتەوە».

گەیشتەوە ماڵێ. دەرگاکەی کردەوە و بەژوور کەوت. ژوورەوە بێدەنگ بوو و تاکە دەنگێک کە دەیبیست دەنگی پێڵاوەکانی خۆی بوو کە بە زەوییەکەیدا دەخشاندن. چووە حەمامەکەوە و لە ئاوێنەکە ڕاما. سیمای چرچ و باریکی بابی خۆی بیرکەوتەوە. لە بازنەکە دەرچوو:

«ها پیرەپیاو! ئەرێ تۆ بوونت هەیە؟! بە ڕاستی تۆ هەی؟ دەبێ

بوونەوەرێکی ڕاستی بێت و بۆشاییەکت پڕ کردبێتەوە کە لە هەمان کاتدا هیچ شتێکی تر پڕی ناکاتەوە یا بوونی جنۆکەئاسات هەر لە خەیاڵی مندا هەیە؟! ئایە دەتوانی نووسراوی نهێنی لە ناو گۆرەوییەکانتدا حەشار بدەیت؟ بیری ئەو پۆلیسە گێلانە دەکەم کە بە دوای بڕیاری مۆرکراوی مەرگمدا هەموو شتێکیان دەپشکنی گۆرەوییەکانم نەبێ. بیری ئەو تاوێرە بەردانە دەکەم کە وەک دایک بە خۆیانەوە دەیاننووساندم و دەیانپاراستم... لە هەموو مەترسییەک دەیانپاراستم. بیری گەمەی مەرگ و ژیان دەکەم کە بە گەمەی ڕۆلێتی ڕووسی دەچوو. پۆلیسی ئێرە هەر گۆرەوی ناگەڕێن بەڵکو کونەکانی جەستەش دەگەڕێن و بەرانبەر کامیرا بزە دەکەن و وێنە دەگرن و... ئێهـ چ کارێکی قێزەونە! بەڵام تازە تێپەڕی پیرەپیاو! بۆ هەمیشە تێپەڕی. چی دی ناتوانی خۆت لە نێوان تاوێرە بەرددا حەشار بدەیت. دووربینی وا داکەوتووە کە بە دوای گەرمایی جەستەتدا دەگەڕێ. تا نەمریت و وەک تاوێرە بەرد سارد نەبیت ناخەلەسێیت! پۆلیسە مەدەنیپۆشەکان فێر کراون بە دوای بڕیاری مەرگتدا، گۆرەوییەکانت بگەڕێن. تازە تێپەڕی پیرەپیاو! نێزیکترین پاشەڕۆژت ئاوهایە: دوو پیاوی پۆشتەی قاتڕەش بە سیمای جددییەوە لە دەرگای ماڵی کیژەکەت دەدەن، کە کەس نازانێ لە کوێیە. کیژەکەت دەرگا دەکاتەوە و پیاوێکی قژدرێژ بە شووشە شەرابی دەستیەوە لە پشتیەوە ڕاوێستاوە. بۆنی کەسکوونی کحوولیان لە شوقەکەوە بۆ دێ. کیژەکەت، بە سەرسوڕمانەوە دەڕوانێ. یەکێکیان گۆزەیەکی بە دەستەوەیە: ڕۆژباش خانم! ئەمە باوکتە!... ببوورە مەبەستمە بڵێ، ئەمە خۆڵەمێشی باوکتە. خودا دۆ... بەهەشتی بە نسیب بکا. کیژەکەت دەقیژێنێ: نا، نابێ! بابم نابێ بمرێ!

بە هەرحاڵ دوای ماوەیەک، کیژەکەت، گۆزەکەی لە جێیەکدا بیر دەچێ. ڕەنگە لە پەنای تەختەخەوە دوو نەفەرییەکە، یا لە بنی یا لە پەنای کورسی ئاودەستەکە بیری بچێ... ڕەنگە لە تەنیشت سندووقی

پێڵاوەکان، لای دەرگاکەی دانێ و بیری بچێ. سەگەکە، کە ئەویش بۆنی کحوولی لێ دێ، بە جێیەکی لەباری دەزانێ و پێیدا دەمیزێ. بەیانیان سەعات پێنج پێیدا دەمیزێ، پیرەپیاو! ئەوجا بۆنی تۆ دەگرێ پیرەپیاو!...»

بە ڕاکردن دەهات و دەچوو. لە حەمامەکەوە بۆ ژووری دانیشتن. لەوێوە بۆ مەتبەخەکە و لەوێشەوە بۆ حەمامەکە. هاواری دەکرد: ئەوجا بۆنی تۆی لێ دێ پیرەپیاو! تۆ تێکەڵەیەکی لە میز و خۆڵەمێش، پیرەپیاو! هەموو ئەو ڕۆژە هەر ڕایکرد و هاواری کرد. سەعات هەشتی ئێوارێ لە دەرگا درا. پێی وابوو پیاوە پۆشتەکانن و خۆڵەمێشەکەی ئەویان هێناوەتەوە: لە گۆزەیەکدایە و بۆنی میزی لێ دێ!

دەرگای نەکردەوە.

- کوڕە هۆو! ئێمە پۆلیسین دەرگامان لێکەوە!

- لە چ دەگەڕێن؟ من گۆرەویم لە پێدا نییە. ڕێنادەم کونی جەستەم بپشکنن و بە دوای بڕیاری مۆرکراوی مەرگمدا بگەڕێن. نا... نایکەمەوە!

دەرگا کرایەوە. دوو پۆلیسی زەبەلاح بە ژوور کەوتن و لە چاوترووکانێکدا لوولیان دا. تەکنیکی لوولدانیان دەزانی و دەیانتوانی کێ بڵێی لوولی بدەن و هەموو جێ و کون و کەلەبەری جەستەی بە دوای قەدەغەکاندا بگەڕێن.

دەترسا و هاواری بۆ فریاڕەس دەکرد، بەڵام ئەوەی کە دەبوو فریاڕەس بێ، پۆلیسەکان خۆیان بوون.

سەرقاپی بیری ئاخاوتنی لابردبوو و هەر قسەی دەکرد. وەک چۆن سووتەنی دەگاتە خاڵی داگیرسان، ئەویش گەیشتبووە خاڵی قسەکردن. بێدەنگی چەندین ساڵی هەڵهێنایەوە. هەر قسەی کرد و قسەی کرد.

ئێستاش قسە دەکا. بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتی قسە دەکا کە هیچ ناژنەوێ.

باسی ڕۆڵێتی ڕووسی دەکا کە دەیەوێ تیایدا بەشدار بێت. دەنگێک لە

ژووری ٢٢ هوه دێت... ڕهنه له ژووری (٢٢٠٠)هوه بێ:
تۆ که بۆنی میزت لێ دێ خۆت حهشارده! خۆت لهوانه بشارهوه که به دواتدا دهگهڕێن! ئهو دووربینانهی تاقیبی گهرمایی جهستهت دهکهن، ههر وهها مین و پۆلیس و سهربازیش تاقیبت دهکهن! خۆت حهشارده پیرهپیاو!

---

* ئهم چیرۆکهم به سویدی نووسیوه و له ڕۆژنامهی (GD)ی ٢٦ی ٩ی ١٩٩٩دا بڵاو کراوهتهوه.
** ڕۆلێتی ڕووسی قومارێکه به دهمانچهی تۆپلی دهکرێ و یهک فیشهک له تۆپهکهیدا دههێڵدرێتهوه و قومارچی دوای ئهوهی چهند جارێک تۆپهکهی دهسووڕێنێ، به سهری خۆیدا دهچرکێنێ. جا ئهگهر نهتهقی براوهیه و تهقیش دۆڕاوه!

# بەرەواژ

ئێستا، بە سەر سەری ئەو خەڵکەوەیە. بە ڕێزەوە بەرەو گۆڕستانەکەی دەبەن. ئەو خەڵکە، لە سەر سەری خۆیان هەڵیانگرتووە و تۆرە دەکەن. تا دەیگەیەننە گۆڕستانەکە هەموو کەسێک، بۆ ماوەی چرکەیەکیش بێ دەچێتە بن دارەمەیتەکەیەوە. کەس ناگرێ و کەس خەفەتی پێوە دیار نییە. نا، خەفەتی چی؟! هەموویان بەختەوەرن! هەموویان، وەک ئەوەی بۆیان ڕێکرابێ، گورج ڕێ دەکەن. هەر کەسێک بۆ ناشتنی مردوو بڕوا، لەگەڵیاندا دەرنابا. کەس نازانێ مردووی داهاتوو کێیان دەبێ و کامیان دەخرێتە بان سەران. من؟ تۆ بڵێی تۆرەی من نەبێ؟! بۆچی نا؟! من خاو ڕێ دەکەم تا درەنگ بگەم، بەڵام هەر دەبێ بگەم. چەند درەنگتر بگەمە گۆڕستانەکە باشترە. هەموو کەسێک، لە سەرەتاوە خاو دەبێ، ئەوجا دەخرێتە سەر دارەمەیت و بان سەران. شتێک کە خودا بۆ گەشەکردن و کوژاندنەوەی من دروستی کردبوو کۆتایی هات. منیش کۆتاییم هاتووە! بۆ گەشەکردنی من؟! نا، نا! بۆ گەشەکردنی ڕووەک دروستی کردبوو. ڕاستە بۆ من و هەموو ئەوانەی بن دارەمەیتەکە

دڵبەر و دینبەر بوو و هەمیشە چاومان لە دوای بوو، بەڵام کارگەیەکی بەردەوامیش بوو بۆ ڕووەک. کاهوو و تۆڵەکە و... کە لە بەرهەمهێنانیش کەوت، خۆی بە هەموو جەستەوە دەبێتە خۆراکی کاهوو و تۆڵەکە و سلق و ئەم بازنەی بەرهەمهێنان و بە بەرهەمبوونەش خواپەرستییە. خزمەتی سروشتە. بزانە کەس دەتوانێ لەو بازنە ئەزەلییە دەرچێ!

بەر لەوەی بیخەنە سەر دارەمەیتەکە، شوشتیان. مردووشۆر، کە لە ڕاستیدا مردووترێنە، دەست بە زگی مردوودا دێنێ تا چ بژوبایەک لە زگیدا هەیە دەرچێ. ئەوجا کفنی دەکەن و بۆ ئەوەی هەتا دەینێژن دەستنوێژی نەشکێ، بە پەلەپرووزێ دەیگەیەننە گۆڕستانەکە. دەستیان بڕوا دوو ڕکات نوێژیشی پێ دەکەن، بەڵام خۆشیان بکوژن نایکا.

دەیبەن. لە ڕۆیشتن و ناشتنیدا پەلەیانە! دوای ئەوەی لە ناو ئەلحەدی گۆڕەکە درێژی دەکەن، مەنفەزبڕی دەکەن. ئیدی لەو ساتەوە: سڕی خۆی و تڕی خۆی! پاش ماوەیەکیش دەستنوێژەکەی لە هەزار لاوە دەشکێ. جەستە بێدەستنوێژەکەی دەئاوسێ و دەئاوسێ تا ئەلحەدەکە پڕ دەکاتەوە. ئەلحەدەکە، لە سەر شێوەی قاڵبە سەهۆڵە و جەستەی ئەویش شێوەی قاڵبەسەهۆڵ وەردەگرێ و تەوژم دەخاتە سەر هەموو لایەکی ئەلحەدەکە. ئەلحەدەکە یەک بێتەوە یا لاشەکە پڕی بکاتەوە، ئەنجام هەر یەکێکە! ئەنجام پاڵەپەستۆی جێبوونەوەیە. هەر کونێک لە بەهەشتەوە بای فێنکی پێدا بێ یا لە دۆزەخەوە هەڵاوی ئاگر بێنێ، هەندێ لە جەستە ئاوساوەکە توند دەیگرێ. جەستەکە هەر دەئاوسێ و دەئاوسێ... لە ئەنجامدا کرتەکرتی لێوە دێ و هەر جارە و لە لایەکەوە درزی تێ دەکەوێ و دەتەقێ. ئەوجا ئەلحەدەکە وەک چووپ پڕ دەبێ لە غاز و هەوا و بۆگەنی...

ئێستا بە بان سەریانەوەیە. بەر لەوەی مردووشۆر بیترێنێ، لە گیانەڵادا بوو. لە ئاستی پێڵاوی ئەو خەڵکە درێژ کرابوو. هەرچییەک پەکی بکەوێ، ئەگەر مرۆڤ بێ دەگاتە ئاستی پێڵاو و ئەگەر مەڕ بێ گورگ

دەیخوا و چۆلەکە بێ پشیلە دەیبا. نابێ پەکت بکەوێ! دەبێ لەگەڵ ڕەوتی ئەو خەڵکەدا دەربەریت! چار نییە دەبێ دەست بە چاوتەوە بگریت! ئەویش پەکی کەوتبوو بۆیە دەوری بە پێڵاو گیرابوو. هەر لە داخی ئەو هەموو پێڵاوەی دەوری گیانی لە دەست دا. دەتگوت لە سەر ئەوەی دەستی بە چاوەوە نەگرتبوو، بە پێڵاو «ڕەجم» کراوە... پێڵاوباران کوشتی. ئەو کە هەمیشە لە سەر دڵان بوو، چۆن بەوە نامرێ دابەزێتە ئاستی پێڵاو؟!

پێڵاو: کڵاشی کوردی، بنی تاکێکیان تەڕ ببوو و لمۆزی بەرەو چەنەگەی خاوەنەکەی هەڵگەڕابۆوە. پێڵاوی چینی لە پێستی سەگی ڕەش... ڕەشی بریقەدار... سووری مەیلەو پەمەیی، پێستی سەگی بازگ. نەعلی عارەبی... قۆندەرەی پەنجەرەداری پێی نەخۆشێکی شەکرە... شەکرە، خۆشترین ناوە بۆ نەخۆشییەکی ناخۆش. نەخۆشەکان لە بەریان گرانە ناوی نەخۆشییەکە بکەنە ژەهرە! دڵی خۆیان بە شیرینییەکەی خۆش دەکەن! وەک دەردە پاشا کە لە دڵ دەدا، نەخۆشییەکی باڵایە با کوشندەش بێ! ئەو هەموو پێڵاوە دەوریان دابوو. ڕیزێ سەری بێجەستەش لە ئاستێکی بەرزتردا لە مۆلەق وەستابوون و بە چاوی ئەبەڵەقەوە لێیان دەڕوانی. سەرە لە مۆلەق وەستاوەکان، جاروبار بزر دەبوون و چاوەکان دەمانەوە. چاوی خڕی وەک بەردە هەڵمات، چاوی ڕەش، چاوی شین... بە دەوری خۆیاندا دەخولانەوە و هەموویان بە دەوری جەستە ڕاکشاوەکەی ئەویشدا دەخولانەوە. چاوەکان، بە چاوی گوێرەکە دەچوون. بە چاوی مەڕی سەربڕاویش دەچوون. چاوی مەڕی سەربڕاویش بە چاوی مرۆڤی مەست دەچێ! دیققەتتان داوە؟! چاوی کەللـەی سەرووپێ لە کەللـەکان دەرهاتبوون و دەسووڕانەوە. هەندێ جار چاوەکان، دیدی خۆیان ئاراستەی سەر سینگی دەکرد. پەتووەکەیان دەسمی و ئاوێزانی مەمکەکانی دەبوون. مەمکی سپی گۆپکە پەمەیی دەمبەگوڵی هێندەی سێوێکی بە قەدەر گونێکی قۆڕ!

ئەوە کێ بوو لە ئاستی پێڵاوەکانتاندا بوو؟! ئەوە کێ بوو تڕانتان؟ ئەوە کێیە لە سەر دارەمەیتە و لە ئاستی سەری هەمووتان بەرزترە؟! ئەوە هەر ئەو ژنە بوو کە بە کراسێکی تەنکی ڕوونی سوورەوە، کە مەمکەکانی لێوە دەبیندران، تووشی یووسف بوو. کراسەکەی یوسفی لە بەرۆکەوە دڕاند و یوسفیش کە گوێی لە ترپەی پێی پاشا بوو، گورج دەرپەڕی و بە دەم ڕاکردنەوە، سیاسەتبازانە، کراسەکەی بەروپشت کرد. نەخێر خەتای ژنەکەیە! ئەوەتا کراسەکەی کاکە یوسف لە پاشەوە دڕاوە! خوایە لە گوناهم خۆش بە لێکدانەوەم هەیە! نەباڕاندن و بیرکردنەوە و لێکدانەوە لە گوناهە گەورەکانی مەڕەکانن.... بااااع!

ئەوە کێیە کردووتانەتە تاجی بان سەرتان و بۆ هەڵگرتنی نۆرە دەکەن؟! ئەوە هەر ئەو ژنە بوو مێشکی بە قەدەر مەمکێکی بوو و مەمکی بە قەدەر سێوێک بوو و سێوەکەش بە قەدەر گونێکی قۆڕە و بڕینی مردنە! ئەوە هەر ئەو ژنە بوو مارێکی لە بن زمانی خۆی شاردبۆوە و مارەکەش شەیتانی لە بن زمانی خۆیدا شاردبۆوە... ئەو ژنە بوو کە بە مار و شەیتانەوە هات و لە دەوری گون و دڵ و زمانی هەمووتان ئاڵا و بۆ گەورەگوناهان دنەی دان... لە زمانی منیش ئاڵا و منیش بە دزییەوە گەیاندمە ناو نوێن... گەیاندمە دووڕێیانی ژیان و مەرگ... گەیاندمە ئاستی پێڵاوەکان... زمانم هەر دەزانێ بڵێ: ژن واتە مار... واتە سێو... واتە مەمک... واتە بەهەشت. کۆی دۆزەخ و بەهەشت و هەموو بوون، بە جەنگ و ئاشتی و هەموو تاوانەکانیشەوە، دەکاتە ژن! دۆزەخ ئەندامێکە لە ئەندامەکانی جەستەی ژن! بەهەشتیش بەشێکە لە جەستەی! سەیر نییە ئەشکەنجەدان و ئیعدامکردن و شەڕی بەرەیی و پارتیزانی، ئەندامەکانی جەستەی ژن بن؟! سەیر نییە تاوانێکی وەک ئەنفال لەبەر تیشکی بزەی ژن ئەنجام درابێ؟ هەواڵی کیمیاباران بەشێ بێ لە دەنگی ژن؟! سەیر نییە دیمەنی قەنارە بەشێ بێ لە گەردەنی ژن؟! فایل، فایل! سەیر نییە فایلیش بەشێ بێ لە ئامێزی ژن و

لەگەڵتدا بچێتە ناو نوێنەوە؟!
مێشکێک هێندەی مەمکێک... مەمکێک هێندەی سێوێکی بە قەدەر گونێکی قۆڕ، ئەو هەموو کارەساتە لەخۆ دەگرێ! ئەو هەموو خۆشییە دەبەخشێ! ئەو هەموو داچەمین و خۆدۆڕاندن و ڕاپەڕین و دەرپەڕینە لە بن سەری ژندان! هەی ئۆینباز! کارەساتی هێنانی مار و شەیتان لە بن زمانی ژندا بۆ ناو بەهەشتی پیاوی قەومی لووت! ئەو بوونەوەرە کە خۆی گونی قۆڕە و مێشکی هێندەی گونێکی قۆڕە، بە بێ ئەوەی هیچ بکا ئەو هەموو ئازارەت پێ دەگەیەنێ! بزەکەی کوشندەیە و لە هەمان کاتیشدا ژیانبەخشە! چییە؟! کێ سەر لە مەتەڵی ژن دەردەکا؟! ڕەق بی نەرمە و نەرم بی ڕەقە، ڕابکەی دێ و بچی ڕادەکا... گورج بیت خاوە، خاو بیت گورجە... ڕاوێژکارە گاوانە دەرگاوانە، نانکەرە مامۆستایە ماستاوچییە، هارە خوێندەوارە، هەرچییەکە ژنە... ژنە ئەو هەموو ئۆینباز و قومارباز و خوێنبەخش و جاش و باشەی لێ کەوتوونەتەوە!
ئەوە هەر ئەو ژنە بوو لە ناو گلێنەی چاوتاندا هەڵتاندەگرت؟ هەر ئەو بوو کە جەوهەری خەنجەرتان بوو؟ جوانییەکەی وەک بەز بان دڵی گرتبوون.
هەر ئەو ژنەی کە مێشکی بە قەدەر مەمکی بوو و مەمکی بە قەدەر سێوێک بوو، کراسی یووسفی ئازیزی بابی خۆی بەرووپشت کرد. ئەدی ئەگەر مێشکی لە مەمکی خۆی گەورەتر بوایە چی دەکرد؟ یووسف... یووسفی بابی خۆی، کە خۆر و مانگ و ئەستێرە کڕنۆشیان بۆی برد، لە دەست مێشکێکی هێندەی مەمکێکی هێندەی سێوێکی هێندەی گونێکی قۆڕ کراسەکەی بەرووپشت لەبەر کرد. گونێکی قۆڕ کراسی پێ بەرووپشت کرد! بەو یووسفە نازدارەی بەرووپشت کرد کە خۆر کڕنۆشی بۆ دەبرد... بەوی بکا بە منی ناکا؟! بە تۆی ناکا؟! لەو بازاڕانە، هەزاران کراس بەرووپشت لەبەر کراون! هەمووشیان، بێ ئەوەی خۆر کڕنۆشیان بۆ ببا، لە خێڵی بەرزەکی بانانن و دەمی خۆیان دەلێسنەوە! ئەو هەموو

سیاسەتمەدارە ساختەکارەی کراسیان بەروپشت کردووە، لە کونی کام ئاودەستەوە هەڵقوڵاون؟
ئەوە کێیە ناوتانەتە بان سەرتانەوە؟ ئەوە ئەو ژنەیە لە بان سەرتان نەبێ کەستان نابێتە پاشا. هەر ئەویش بوو لە بنی هەر کامتان بوایە دەیکردە پاشای پاشایان. ئەو نەبێ، دەبنە مێگەلە مەڕێکی بێبەران و لە بەرەوە دەخورێن و دەبڕێن و دەدزرێن تا دواتان دەبڕێتەوە. بیخەنە بان سەرتانەوە. بە پێڵاو مرانتان... بە مەبەستی پاککردنەوە و دەستنوێژ و نوێژ تڕانتان... بەڵام ئەو، بە چاوداگرتنێک هەزارتانی بە دوانتان بە کوشت دەدا. ئەو، مار و شەیتانی پێ بوو و دەروازەی هەموو بەهەشتێکی بۆ واڵا بوو. دەروازەی وەزیر و مودیری بۆ لە سەر پشت بوون... دەروازەی دۆست و دوژمن بۆی بێ چاودێر بوون. دەروازەی دڵی پیاوانی کراس بەروپشت وەک دەمی ماکەر بۆی دەقەوچی! ژنێک شوشتی و دەستی بە زگیدا هێنا. جاروبارێ بە لاچاو تەماشای ئامێری زاوزێی دەکرد. بە مردووییش بەخێلی پێدا دەهات! وەی کە جوان بوو! ئەو ژنە نازدارەی کە مێشکی بە قەدەر مەمکی بوو و مەمکی بە قەدەر سێوێکی هێندەی گونێکی قۆڕ بوو بۆ کوێ دەبەن؟! تا پێتان کرا لە ناوەڕاستی پێڵاوەکانتاندا کردتان بە چەق، ئەوجا تڕانتان. هەر ئەویش بوو کە ئێستا لە بان سەرتانە، بۆ ئەوەی بیخەنە بنتان، سەری بابی خۆتان بە کڵاو و جامانەوە بۆی بە ڕەهن دەدا. بە ڕەهنتان نەدا و سەریتان کۆت نەکرد؟! ها؟! وەک جاشک بۆی کەوتنە سەر چوارپەل! ئەو مێشکەی هێندەی مەمکێکی هێندەی سێوێک بوو. مێشکە زلەکەی ئێوەی لەکار دەخست و وای لێ دەکردن بزەڕن. بۆ کوێی دەبەن؟! مێشکی ئەو ئیسفەنجێکی گوشراو بوو و هی ئێوە نەگوشراو! کێوەی دەبەن؟!
تەلیسمێک بە دەوری ئەو مەمکانەوە بوو. دوو مەمک کە هەموو وزە موگناتیزییەکەی گۆی زەوییان بۆ خۆیان قۆرخ کردبوو، زەلامیان بە

مێشکێکی گەورەوە وەک وشتر یخ دەدا. چاوی، چ تەلیسمێکیان تێدابوو. چاوی، ئاوێنەیەک بوو و ڕەنگی حەزی بێبڕانەوەی دەدایەوە، یا زەنگی جەنگی لێدەدا. ژن، بەو مێشکەوە کە بە قەدەر سێوێکە، دەبێتە نووسەر و داهێنەر و ئەکتەر و وەزیر و مامۆستای بیرکاری! ئەوە توانای مێشکی نییە، بەڵکو ئیرادەی چاو و مەمکێتی داهێنانی پێ دەکا. هەموو جەستەی ژن مێشکە و لەکاردایە... پەنجە تووەی مێشکە. مەچەکی... دەمی... لێوی... هەموویان لە کاری پەکخستنی هەموو مێشکێکی نێردان بە مێشکی ئەنیشتاینیشەوە. بیخەنە بان سەرتان! ئەو ژنە بخەنە بان سەرتان کە هەموو جەستە نەرمونۆڵەکەی مێشک بوو. بیکەنە تاجی سەرتان! ئەو ژنە مێشکی لە دەرەوەی بوونی فیزیکیشەوە هەبوو و لە دوورەوە وزەی نێرایەتی لێ دەمژین! ئەو لە ماڵی خۆی بوو، ئاژاوەی لە ماڵان بە پیاو دەگێڕا و کۆبوونەوەی بێبڕانەوەی بە نێرینە بۆن تەگەورەکان ئەنجام دەدا. ئاخر مار بە شەیتانی بن زمانیەوە چووبووە بن زمانیەوە. ئەویش لە زمانی هەمووتان ئاڵابوو... لە زمانی منیش ئاڵابوو... باسی مێیاتی ئەو بە سەر هەموو باسێکدا زاڵ بوو. لە ئێستا بە دواوە چ دەکەن؟! خۆتان سەرقاڵی چی دەکەن؟! پەلەتانە دایپۆشن تا هەموو حەزەکانتان لەگەڵیدا. لە چاوی یەکتر بشارنەوە. هەمووتان بە هەموو کەتنێکی یەکتر دەزانن بەڵام دەشیشارنەوە. لە ناو ئەلحەدێکی لادڕدا بیشارنەوە نەوەک یەکێکتان لە نیوەشەودا، ئەو دەمەی بۆن تەگەوری زیاد دەکا، بێتە سەری و هەڵیکۆڵێ. بیشارنەوە تا ئابڕووتانی نەبردووە! ئەلحەدی ژن لە ترسی دەستدێژیکردنی ئێوە لادڕە! ئەوەش هەر بیرۆکەی ئەوانەی بن دارەمەیتەکەیە، دەنا کێ بیر لە هەڵکۆڵینی گۆڕ دەکاتەوە؟!

ئێستاکە وا بە بان سەرتانەوە ئۆغر دەکا، تا جێ بۆ کەسێکی تر چۆڵ بکا مێشکی هێندەی مەمکی بێ و مەمکی هێندەی نارنجۆکێک بێ و لە ناوگەڵتانەوە دابڕژێتە ناو سەنگەرەوە... نارنجۆکیش هێندەی گونێکی

قۆڕە و نەیبڕی بەڵایە و بیبڕی دەمریت! بیبەن بە بان سەرتانەوە ئەو چاوگەشە گەردن درێژە مەمک سێوە ببەن کە هەموو جەستەی مێشکێک بوو و وزەی ماگنەتیکی گۆی زەوی لەخۆ دەگرت... و... بە داماڵاندنی لەچکەکەی نەبوایە هەرگیز سیحرەکەی بەتاڵ نەدەبوو.
منیش وەک هەمووتان دە ساڵ چاوەڕوانی داماڵاندنی لەچکەکەی بووم، بەڵام کە دایماڵاند سیحرەکەی بەتاڵ بووەوە و یەک خولەک چاوەڕوانی ئیزن نەبووم. هەموو تەمەنی چاوەڕوانیم لە پێنج خولەکدا بەتاڵ بووەوە! کات چڕ چڕ ببۆوە! حەز چڕ چڕ ببۆوە! هەموو شتێک لە دەمی تەقینەوەدا بوو و تەقییەوە!
کەچی بە سەر شانی منەوە نییە! بە سەر شانی ئێوەوەیە! وا دەیبەن... هەر جارە و یەکێ دەکەوێتە بان سەران و ئێستا نۆرەی ئەوە بە بان سەرتانەوە بێ. بە بان سەرتانەوە دەیبەن تا ڕێ بۆ گەشێکی لە خۆی گەشتر چۆڵ بکا. دەیبەن، تا یووسفێکتان پەلاماری نازدارێکی تر بدا و کراسەکەی بەروپشت لەبەر بکا. دەیبەن تا ناپلیۆن کەرایەتییەکی تر بکا... بیبەن! با فایلێک وەک فایلەکەی یوسف لە پێناوی ئامێزی کەسێکی لەو نازدارتر دروست بکرێ و ئاشکرا بێ!
کێ دیویەتی ئەو مردووە ترێندراوەی بان سەرتان لەچکەکەی داماڵێنێ؟!
زمانی ئاگرتان دیوە چۆن هۆن هۆن بەرەو ئاسمان تەکان دەدا؟!
پرچەکەی ئەویش ئاوها تەکانی دەدا. ئەو خۆی دەڕوا تا لە جێی ئەو کەسێکی نازدارتر کراسێکی تەنک و ڕوونی سوور لەبەر بکا، کە گۆی مەمکی لێوە دیار بن و یووسف لە حەژمەتدا کراسی خۆی بەروپشت بکا.
ئاخر ئەگەر ئەو نەڕوا، شوێن نامێنێ کچەکەی نوێنی خۆی لێ ڕابخا...
ئەو دەڕوا تا ببێتە خۆراکی تۆڵەکە و کاهوو... وای لەو بازنە نەفرەتییە!

# بزە

دەرگای حەوشەکەیان چینکۆیەکی ڕێڕێی سپی درەوشەدار بوو و لە یەکدوو شوێنەوە بە تەنەکەی ژەنگن پینە کرابوو. لە زۆر شوێنەوە قوپابوو و لە زۆر شوێنی ترەوە کونکون بوو و کونەکان بە جێی گوللـە دەچوون کە لە دەرەوەڕا پێوەی نرابن. دەرگاکە قفڵ و کلیل و چوارچێوەی نەبوو، با دەیهێنا و تەق بە دیوارەکەیدا دەدا. بای پایز تاقەسوار بوو و تەپوتۆزی بەرپا کردبوو... بای پایز ڕێبوارێکی لادەیی بێشەرم و بە پەلە بوو. وەک ئەوەی شتێکی لێ قەومابێ و فریادڕەسی بوێ، پەیتا پەیتا دەرگای دەکوتا. تەقەی دەرگا نە با و پایزی ماندوو دەکرد، نە دانیشتوانی ماڵەکەی بێزار دەکرد. دەرگاکە و پایز و ئەو ماڵە ئولفەتیان بە یەکەوە گرتبوو.

چوار پشیلەش، دوانیان لەملای دەرگاکەوە پاڵکەوتبوون، دوانیان لەولای دەرگاکەوە. ئەوانەی لای دەستەڕاست یەکێکیان ڕەش بوو و ئەوی تریان بۆر. ئەوانەی لای دەستەچەپ هەردووکیان سپیوازی چڵکن بوون. پاڵ کەوتبوون، بەڵام لە چاویشیاندا دیار بوو ئامادەی

ڕاکردنن. دەوروبەری پشیلەکان و بەر دەرگاکە و پێشتریش پڕ بوون لە هێڕکەبەرد. پشیلەکان چاوەچاوی ئەوەیان بوو دەست بدەیتە بەردێک تا تێیتەقێنن.

«ئەم ماڵە لەگەڵ تەقەتەقی دەرگا و گڤەگڤی بادا ڕاهاتوون. با هەبێ یا نەبێ ئەم دەرگایە تەقەتەقی دێ. لە کەشوهەوای ئارامدا منداڵان بەردبارانی دەکەن. منداڵ سەرەڕۆن و لە چی بترسن پەلاماری دەدەن. تۆ بزانە بزانە! پەلاماری ماریش دەدەن! خوا شایەدە مەچیر بە کلکی دووپشکەوە دەبەستن و دووپشکەی تریان پێ ڕاو دەکەن. پێشتریش، جارێ جاش دەهاتن و ئەم دەرگایەیان دەکوتا، جارێ سوپا و جارێ ڕێکخراوی شیمال. دوای ئەوانیش جارێ چەکدارانی ئەم حیزب دەهاتن و دەیانکوتا، جارێ چەکدارانی ئەو حیزب. ئەم دەرگایە چارەنووسی وایە. دەبێ ئەم دەرگایە تەقەی بێ. ئەگەر باران بێ، لە ئاستی ئەم دەرگایەدا دەیکاتە تەزرە. هەر لەم دەرگایە دوور بکەویتەوە، با دەیخا. وەرزیش... بڵێم چی! دوور نییە لەم دەرگایە دوور بکەویتەوە، وەرزی پایز نەمێنێ. ڕەنگە بەهار بێ».

پیرەژنێکی گۆچانبەدەست ئەو قسانەی کرد و بە دەم شەپەشەپی کراسە ڕەشەکەیەوە بە نێوان من و دەرگاکەدا تێپەڕی. کە ڕەتیش بوو، هەر دوو هەنگاو جارێ ئاوڕێکی دەدایەوە و بە گومانەوە، جارێ لە منی دەڕوانی، جارێ لە دەرگا چینکۆکە. دەرگاکەش جاروبارێ خۆی بە دیوارەکەدا دەدا.

دەرگاکە دەکرایەوە و تەق پێوەدەدرا. نە کەس دەهاتە دەرێ نە کەس دەچووە ژوورەوە. چەند هەنگاوێک بە ناو هێڕکە بەردەکاندا چوومە بەرەوە. پشیلەکان، هەر دوانیان و بە لایەکدا تێیانتەقاند. بە پشتی پەنجەکانم سێ جاران لە دەرگام دا و بای پایزیش کردی بە چوار و دیسان کردیەوە و بە دیوارەکەیدا کێشا. چاوەڕوان بووم ئەحمەد بێت و دەرگا بکاتەوە.

ئەحمەد، خودا بۆ بزەکردن خولقاندبووی. هەمیشە بزەی دەکرد. بێ ئەوەی مەبەستی بێ بزە بکا، بزەی دەکرد. جارێکیان لە شەڕدا بریندار ببوو و خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو، کەچی هەر بزەی دەکرد. لێوەکانی، خۆیان باریک و بە بزە بوون. چاوەکانی، خۆیان وا ڕسکابوون بزەیان پێوە دیار بێ.

بەر لەوەی بگەمە ئەو جێیە پرسیبووم: ئەحمەد حوسێن ڕەمەزان، پێشتر بە ئەحمەد گرینۆف بەناوبانگ بوو. ناوی ژنەکەی هەنارە. نازانم چەند منداڵی هەیە. زانیومە لەم ئۆردوگایە نیشتەجێ بووە. کێ دەیناسێ؟

- ئەوەی...

منداڵێک ئەوەی گوت و پێکەنینێکی ئیبلیسانەی کرد. یەکێکی تر هەڵیدایێ:

- ماڵە کەرکووکییەکە؟

- بەڵێ، بەڵێ کەرکووکین.

- خزمی تۆن؟

- ئمم... نا، ناسیاومن. پێکەوە پێشمەرگە بووین. ئەحمەد. هەنار ژنێتی. منداڵ... نازانم چەندیان هەیە.

- ئەوەتانێ هۆ لەوێ. ماڵەکەیان ڕووی لە دەشتەکەیە. سێ قەیرەکچ و خرتەکوڕێکیان هەیە. تەواو نین، هەر چواریان شێتن. شتێک بەردەوام لە دەرگاکەیان دەدا. یەکێ دەڵێ پشیلەیە و یەکێ دەڵێ بایەکەیە. ئەوانیش قەت نایەنە دەرگا. بە خوا نازانم، بەڵام دەڵێن ئەوەی بچێتە ئەوێ، پشیلەکان هانی دەدەن بەرد لە دەرگاکە بدا... ئەوەشی بە قسەیان نەکا تێکدەچێ. وەڵڵا خۆ ئەوەش دەڵێن ئەوەی بەرد نەهاوێ دەبێتە پشیلە. تا ئێستا چوار کەس بوونەتە پشیلە.

سەرم بادا و بەرەو ئەو شوێنە چووم کە گوتیان. کە گەیشتم، بەر دەرگاکەیان ئەوە بوو کە دیتم. بایەکە دەرگاکەی دەهێنا و دەیبرد.

دەتگوت ئەو دەرگایە هەر بۆ ئەوە هەیە تەقەی لێوە بێ. تۆ بڵێی ئەو پشیلانە ئەو بەردانەیان هاویشتبێ؟! تۆ بڵێی ئەوانە، ڕۆژێ لە ڕۆژان وەک من بەشەر بووبن؟. نا، شتی وا چۆن دەبێ؟! جارێ سەیری بەردەکانم دەکرد و جارێ دەرگاکە و جارێکیش پشیلەکان. لەمسەر و ئەوسەری دەرگاکەوە پشیلەکان سەریان دەرهێنابوو. نە دەهاتنە پێشەوە نە دوور دەکەوتنەوە.
جارێکی تریش بە پشتی پەنجە لە دەرگام دایەوە. ئەمجارەیان قایمتر لێمدا و هەستم بە سووکە ئازارێک لە پشتی پەنجەکانمدا کرد. سێ جارانم لێدا و بایەکە کردی بە چوار. لەگەڵ گەڕانەوەی دەرگاکەدا ناو حەوشەکەم دیت. دەمەبێڵێکی بێکلک و خەرماشەیەکی جووت لەو گۆڕە کەوتبوون. دەوروبەری خەرماشەکە زیوزبڵ بوو.
دوو هەنگاو گەڕامەوە دواوە و چاوەڕوان بووم. دەوروبەرم هەمووی هێڕکەبەرد بوو. دەتگوت من بەردباران کراوم نەک دەرگاکە. دەبێ من لەسەر چی بەردباران بکرێم؟! نا، من نا. دەرگایماڵی ئەحمەد بەردباران کرابوو.
چاووم بە ناو بەردەکاندا گێڕا. هەوەسێک لە ناخمدا بەرپا بوو... بووە مەراقم هەندێ لەو بەردانە هەڵگرم و نەختێ دوور بکەومەوە و دەرگاکە بەردباران بکەم. داچەمیم و دوو بەردم گرتە دەستمەوە. دوو بەرد، هەر یەکەیان پڕ بە مشتم بوو. نەختێ کشامەوە تا دەستی خۆم بوەشێنم. تارماییەک گەیشتە پشت دەرگاکە. جووتێ نەعلی لاستیکی پیاوانە... پێ دەچوو ژمارەیان ٤٤ بێ. دوو پێی ناسک و بچکۆلەیان تێدابوون. پێدەچوو ژمارەی پێیەکان ٣٧ بێ. ئەو پێیانە لە بن دەرگاکەوە دەدرەوشانەوە. دەستوپەنجەیەکی ژنانەی ناسک لێواری دەرگاکەی گرت. سەروسیمایەکی ناسک لە درزی دەرگاکەوە، کە بەردەوام کەمی دەکرد و زیادی دەکرد، بە دەم بزەوە لێم ڕاما. شۆخەژنێک بوو و سەرسامی کردم. دوو چاوی ڕەش و گەش و ڕێژراوی لە چاووم بڕی. بە

بێدەنگی بزەی دەکرد و هیچی نەدەگوت. منیش هیچم پێ نەدەگوترا. خەیاڵم خۆی لەو ڕوخسارە نازدارە ڕاپسکاند: هەمان بزەی باوکی، بەڵام ئەمەیان مێیانە. کەس دەرگایان بەردباران ناکا، ئەو بزەیە بەردباران دەکەن. چەکداران ڕوویان لە دەرگایان نەکردووە، ڕوویان لەو بزەیە کردووە.

چووە ژوورەوە. چاوەڕوان بووم و کەس نەهات. بەردەکانی ناو دەستم هەوادانە بەر پێم و بەرەو دەرگاکە هەنگاوم نا. ئەمجارەیان دەرگاکەم دایە بەر مشت. کەس بە دەنگمەوە نەهات. بە تووڕەیی گەڕامەوە ناو بەردەکان. دەتگوت لە سەر ئەو بزەیە بەردباران کراوم. دوو بەردم هەڵگرت. کردم بە چوار و چوار پێنج هەنگاو کشامەوە و بە حرسەوە بەردەکانم هاویشتن. یەک بە دوای یەکدا. دوای ئەوەی هەر چوار بەردەکەم وەشاند، بایەکەش دەرگاکەی کردەوە و کێشایەوە بە دیوارەکەدا. پشیلەکان، بە کلکەلەقێ بەرەو بەر دەرگاکە گەڕانەوە.

# مەملەكەتی سەگەكان

لەگەڵ دوو دڵۆپە فرمێسكی گەرمدا، پێشكەشە بە گیانی پاكی (لۆخە)ی برام...

پێش ئەو ڕۆژەی بچمە مەملەكەتی سەگەكانەوە، یا ئەوان ڕێم لێ بگرن، جاروبار لە خۆمم پرسیبوو: «ئەگەر مرۆ نەبێ سەگ دەبێ بە چی؟» هەمیشە وەڵامی خۆمم دەدایەوە كە ئادەمیزاد نەبێ سەگ دەبێ بە گورگ و گورگیش نەختێ لەوەی هەیە هێورتر دەبێ و لە ئەنجامدا لێك نزیك دەبنەوە! وەنەبێ هەر پرسیاری چارەنووسی سەگم لە خۆم كردبێ. باسی چارەنووسی مەڕ و بزن و كەر و مانگاشم كردووە... ئیدی ئەو گیاندارەماڵییانەی بەرگەی ژیانێك دەگرن كە مرۆڤی تێدا نەبێ، سروشتیان دەگۆڕێ و بە پێی خۆگونجاندن دەمێنن. بەڵام ئەو ئێوارەیە زانیم سەگ، ئەگەر بشبن بە گورگ شەهامەتیان هەر دەمێنێ... سەگ كەسایەتی خۆیان هەیە... تەنانەت نەریتی خۆشیان هەیە. تاكە شتێك كە سەگ لێی بترسێ ئەوەیە كە سەری لێ دەرنەكا... لە دەنگی بڵندگۆی مزگەوت و تۆپی دوورهاوێژ و كۆپتەر و هەورەتریشقە دەترسن، چونكە نازانن سەرچاوەیان لە كوێوەیە.

تازە گوندەكان ئەنفال كرابوون، من ڕێم كەوتە گوندێكی وێرانكراو،

که جگه له سه‌گ که‌سی تێدا نه‌مابوو. ئارد و ساوه‌ر و پێخه‌ف و جلوبه‌رگی خه‌ڵکه‌که‌ش، هه‌رچی تالآنیش نه‌کرابوو، که‌وتبووه بن خۆڵ و داروپه‌ردووی خانووه‌کانه‌وه و دووره‌ده‌ست بوو. سه‌گه‌کان، برسی بوون و برسێتیش ڕه‌گی هاربوونی به ده‌مه‌وه‌یه. که منیشیان بینی، بۆ ئه‌وان تۆپه‌ڵێ گۆشت بووم و بۆ خواردن به‌که‌ڵکیان ده‌هاتم... نا، هه‌ر ئه‌وه نا! ڕه‌نگه وایان لێکدابێته‌وه من ده‌ستدرێژیکه‌ری سه‌ر مه‌مله‌که‌ته‌که‌یانم. ڕه‌نگه منیان به هۆکاری وێرانکردنی گونده‌که‌یان زانیبێ. ئه‌ی منیش وه‌ک ئه‌نفالچییه‌کان به‌شه‌ر نیم؟! به‌ڵام له ئه‌نجامدا زانیم که سه‌گ، به برسێتیش که‌رامه‌تی سه‌گبوون و یاسای دۆستایه‌تی خۆیان له ده‌ست ناده‌ن و دڵسۆزانه ئاماده‌ی هاوده‌مێتی مرۆڤن، به‌ڵام مرۆڤێک له زمانیان بزانێ و مه‌مله‌که‌تیان وێران نه‌کا.

ڕێیه‌که، وه‌ک پیتی (ر) به لای گردۆلکه‌یه‌کدا سه‌ره‌وخوار لار ده‌بووه‌وه و یه‌کسه‌ر ده‌گه‌یشته یه‌که‌م خانووی داته‌پیوی گونده‌که، که ته‌نها لا[illegible] [illegible] مابوو. که من له دیواره‌که نزیک بوومه‌وه، له دوو لاوه، له دامێنی گونده‌[illegible] سه‌گم بۆ هاتن. هه‌شت نۆ سه‌گ بوون... ڕه‌نگه زیاتریش بووبن. که ده‌هاتن، هه‌ندێ جار ده‌که‌وتنه په‌نا دیوار و کۆمه‌ڵه خشته‌کانه‌وه و له چاو بزر ده‌بوون. [illegible] یه‌ک به دوای یه‌کدا ده‌رده‌که‌وتن. [illegible]یرم بۆ ئه‌وه ده‌چوو [illegible] برسی بن هه‌م تووڕه بن... ئه‌مانه زه‌نگی جه‌نگیان لێده‌دا و پێیان وابوو هه‌موو به‌شه‌رێک ئه‌نفالچییه و ئه‌وه‌ی ڕێی بکه‌وێته گونده‌که‌یانه‌وه، که مه‌مله‌که‌تی خۆیان بوو، خانووه‌کان ده‌ڕووخێنێ و خه‌ڵکه‌که ده‌کوژێ... منیش بۆ ئه‌وان ئه‌بفالچی بووم. یا هه‌ر پێیان ناخۆش بوو چوومه‌ته گونده‌که‌یانه‌وه و هیچی تر. پێ ده‌چوو پێیان خۆش نه‌بێ سنووریان ببه‌زێنم و خۆم به مه‌مله‌که‌ته‌که‌یاندا بکه‌م.

فریا که‌وتم به‌ردێک هه‌ڵگرم. به‌ڵام وه‌ک ئه‌وه‌ی پێشتریش ئه‌وه پیشه‌یان بووبێ، ده‌وریان گرتم. له لای ڕاسته‌وه و لای چه‌په‌وه و به‌ره‌وڕوو.

پشتم بە دیوارەکەوە بوو. نیوەبازنەیەکیان بە دەورمدا پێک هێنابوو و چرکە بە چرکە نیوەتیرەی نیوەبازنەکەیان کورت دەکردەوە. وای بۆ دەچووم بە تەما بن، کە چاک نزیک کەوتنەوە، پێکەوە پەلامارم بدەن. «کە سەگت بۆ هاتن، لە جێی خۆت دانیشە!». ئەوە دەنگێک بوو لە زاری باپیرمەوە، لەودیو بوونەوە، لە غەیبەوە هات. من منداڵ بووم و لە سەگ دەترسام. ئەویش ئەو تەمێیەی کردم. «لە جێی خۆت دانیشە! ئیتر وازت لێ دێنن» نەمکرد بپرسم: «ئەی ئەگەر سەگەکان ماڵیان لێ تێکچووبوو و کولانەیان ڕووخابوو و منیان بە سەبەبکار زانی؟! ئەی ئەگەر بە بێ پرس و بێ پاسپۆرت خۆم بە مەملەکەتیاندا کرد؟. بەڵام ئەو پرسیارانەم نەکردبوو. باپیرم، سەری لە سروشت و بوونەوەری ناو سروشت دەردەکرد. دەیزانی کەی باران دەبارێ و چۆن خۆی لە ناو بەفردا تەقەت دەکا و کەی دەچێتە ڕاو و چ خاکێک دومەڵان دێنێ و بیابانییەکان کەی تاڵان دەکەن و کەی دەپارێنەوە... دەیزانی بۆ خاکەلێوە چەندی ماوە یا کەنگێ پەڵە دەدا. ئەو خۆی بەشێک بوو لە سروشت... «مەترسە کوڕم! ئەگەر سەگت بۆ هاتن، لە جێی خۆت دانیشە! مەترسە چونکە سەگ بۆنی ترس بە دوژمنایەتی دەزانن! ئەوەی پەلامارت دەدا سەگ نییە، ترسی خۆتە!».

باشە! بە ئەسپایی بەردەکەم فڕەدایە بەردەمم. یەک بەرد چی بەو هەموو سەگە دەکا؟ دەمزانی ئەگەر بۆ بەردی دووەم داچەمێم، دێنە کۆڵم و یەکێکاین پشتەملم، یا ناقرگەم بە دەمەوە دەکا و ڕەگی خوێنم دەبڕێ و یەکێ نەرمایی ڕانم دەگرێ و یەکێکی تریان، گوڵمەی پاشەڵم و بە یەک تەکان تەختی زەوییەکەم دەکەن. سەگ مەراقیانە نێوانە هەردوو ڕانی نێچیر بە دەمەوە بکەن و لەوێوە ڕەفیسکی بپسێنن. کەڵبەیان گڕ کردبۆوە و وەک گورگ چەقەی شەویلەیان دەهات. ئەوەندەی دەیانمڕاندەوە نەدەوەڕین. وردە وردە دەهاتنە پێشەوە و کەڵبەیان سپی دەچوونەوە. خوێن بەر چاوی گرتبوون. کەللـەزلێکیان،

دیار بوو زۆر خزمەت کرابوو، یەکەم هەڕەشە بوو لە سەرم. ئەمەیان لیکاو لە دەمی دەهات. خاڵێکی ڕەش بە دەوری چاوی چەپیەوە بوو و هەردوو گوێچکەی بڕابوون. ئەو کەللە زلە، پێ دەچوو فەرمانڕەوای مەملەکەتی سەگەکان بێ. دوو دەڵ، یەکێکیان گوانی شۆڕ ببوونەوە و پێدەچوو زۆر نەبێ تەرەکیبێ، لە پشتەوەی سەگە کەللەزلەکەوە بە کەڵبەی گڕ و چاوی هەڕەشە ئامێزەوە ئامادەی پەلاماردان بوون. ئەگەرچی خەیاڵم تەنها لای سەروکەللە و کەڵبەیان بوو، بەڵام لە ماوەی یەک چرکەدا، خەسڵەتیانم دەخوێندەوە.

«ئەگەر سەگت بۆ هاتن، لە جێی خۆت دانیشە». بەڵام نەمدەوێرا کتوپڕ دانیشم. چۆن دانیشم و خۆم بخەمە بەر بەزەیی ئەو هەموو کەڵبە تیژ و سپییانە؟! داشنەنیشم، مردن وەک سەگەکان دەوری تەنیوم. «دانیشە، کوڕم دانیشە! ڕەنگە میزیشت پێدا بکەن، بەڵام لەوە باشترە بتکوژن!»

دەبوو بزانم کەی بەرد دەوەشێنم و کەی دادەنیشم و قەبووڵ دەکەم سەگ پێمدا بمیزن. ئەو ساتە، ساتی دانیشتن بوو. خۆ مرۆ لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆشیدا تووشی بارودۆخی وا دەبێ، کەچی گلەیی لە بیاباننشین دەکا گوایە دەستی بڕوا چی دەکا و دەستی نەڕوا چۆن دەکا. بێدەسەڵاتانە هەردوو باسکم شۆڕ کردنەوە و بە کزییەوە گوتم: «چیتان لێم دەوێ؟ ئێ خۆ منیش وەک ئێوە خانەوێرانم! خۆ منیش وەک ئێوە سەگێکی بێخاوەنم! ئێوە، خاوەنتان ئەنفال کراوە بەڵام من خاوەنم جێیهێشتووم! خاوەنم، منی هەواداوەتە بەردەمی ئێوە بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بێ!» ئەوانەم بە دەنگێکی نەوی گوت. بەکاوەخۆ، بە دەم قسانەوە پشتم بە دیوارەکەدا دەخشاند... پێمدا دەخشاند و نەختێ ئەژنۆم دەنوشتاندەوە... بەردەوام بووم تا دانیشتم. لە سەرەتاوە، لە سەر چنچکان دانیشتم و دوایی کردم بە چوارمشقی. «ئێ! ئێستا چیتان لێم دەوێ؟ منیش وەک ئێوە لێقەوماوم! منیش

وەک ئێوە کوردێکی بەجێماوم!... ناوەڵا هێندەی ئێوە کورد نیم، بەڵام کوردم!». ئەو قسانەم بە دەنگی نەوی دەکردن. هەستم کرد قسەکردنم کاریگەری خۆی هەیە. گەماڵە چاوڕەشەکە نەختێ نەرم بوو. جارێ شەویلەی دادەخست و جارێ کەڵبەی دەردەخست و مڕەمڕەکانیشی، تا دەهات کورتتر دەبوونەوە. من حەکایەتم بۆ دەکردن. سەرم مات کردبوو و جاروبار سەرم هەڵدەبڕی: «ئێ! ئێستا تەگبیرمان چییە؟ بۆ نایەن پشتی یەک بگرین؟ دەی با لە دژی بەعس پشتی یەک بگرین و لە کۆنەوە گوتوویانە برا لە پشت برا بێ مەگەر قەزا لای خوا بێ! من برای ئێوەم!» مڕەمڕی سەگەکان کەم بووەوە. یەکێکیان هەستا و نەختێ دوور کەوتەوە و دوو سێ جار لووراندی. ئەوە گوان شۆڕەکە بوو لووراندی. بە خەیاڵمدا هات ناوی «داکی منداڵان» بێ. هەر دەتگوت دەڵێ: «من ئەوەتام ها لەیرە! خەمتان نەبێ دێمەوە لاتان!».
منیش وەک ئەوەی لەگەڵ دۆستێک یا کەسێکی خۆمدا قسە بکەم، بە سەگەکەم گوت: «واز بێنە با کەشف نەبین! خۆ منیش وەکوو تۆ بەچکەم هەیە و ناشلوورێنم». ئەوەم بە دەنگێکی بەرز گوت.
سەگ شەهامەتیان هەیە. ئەگەر لە زمانیان بزانیت، نەک هەر زەرەریان بۆت نابێ، بەڵکو بۆت دەبن بە پشتوپەنا. ئا، ئەوەم لە بیر چوو. باپیرم دەیگوت: «کە سەگت بۆ هاتن، چاو لە چاویان مەبڕە! هەوڵ بدە تەماشای چاویان نەکەیت. ئەگەر تەماشای چاویان بکەیت، وا دەزانن شەڕانیت و هەڕەشەیان لێ دەکەیت!» وای دەگوت. دەشیگوت: «هەوڵ بدە ددانت دەرنەخەیت، چونکە ئەوان لە دەرخستنی ددان و چاوزەقکردنەوە نیشانەی شەڕ دەخوێننەوە!». دیارە هەندێ مرۆڤیش خەسڵەتی سەگیان هەیە. تەماشای چاویان بکەیت تێکدەچن و دوور نییە چەقۆکەی باخەڵیان دەربێنن و بتدەنە بەر چەقۆ... چەقۆ، لە بری کەڵبە! سەگ و مرۆڤ، لە هەندێ ڕووەوە لە یەک دەچن. بەڵام سەگ سەر لە خیانەت دەرناکات. جیاوازییە گەورەکەیان ئەوەیە.

لە دانیشتن ماندوو ببووم بەڵام نەمدەزانی چۆن هەستم. نەمدەزانی ئەگەر هەستم سەگەکان کاردانەوەیان چۆن دەبێ! باپیرە سەگناسەکەم ئەو تەگبیرەی بۆ نەکردبووم. لە بری ئەوەی هەستم، شانم دادایەوە و پشتم لە دیوارەکە قایم کرد. هەوڵم دەدا تەماشای سەگەکان نەکەم، بەڵام بەردەوام قسەم دەکرد. دڵنیا بووم، ئەگەر بەردەوام قسە بکەم، ئاشنایەتی لەگەڵ دەنگمدا پەیدا دەکەن. هەرچۆنێ بوو، لە مەترسییە گەورەکە دەرچووبووم و تا ڕادەیەک دڵم خۆش بوو. بەر لەوەی تووشی سەگەکان بم، دڵم زۆر تەنگ بوو. بیرم لە حاڵی ئەو خەڵکە دەکردەوە کە بەر ئەنفال کەوتبوون. منداڵ و کچی جوان و کوڕی قۆز و پیرەژن و پیرەپیاو، هەموو چووبوون بە گەرووی ئەنفالدا. بیرم لە سەرگەردانی خۆم دەکردەوە. زۆرم بیر لە چارەنووسی خۆم نەدەکردەوە. گرنگ ئەوە بوو ئەو ساتەی تێیدا دەژیام، مەترسیم لە سەر نەبێ. بەڵام لە کاتی هەڵمەتی سەگەکاندا، هەموو خەمم گۆڕان و بوون بە ترس، کە ترسیش نەما، ئیتر دڵم خۆش بوو و دەشمزانی ئەو دڵخۆشییەم زۆر ناخایەنێ. ماووم. نەخوراووم. ئەها ئەوەتام پاڵم داوەتەوە! ئەوەتا بە زندوویی لە مەجلیسی دیوانی سەگەکاندا، وەک ئاغای سەگان، بەرەو ڕووی هەموویان دانیشتووم و چاویان لە زار و ڕەفتاری منە. کار وا بڕوات، من دەبم بە فەرماندەی ئەوان و سەگە چاوڕەشە گەللـەزلەکەش دەکەم بە جێگری خۆم. چۆنە خیتابیان بۆ بدەم... ئەی سەگە دڕە وەفادارەکان...

هەناسەیەکی ئاسوودەییم هەڵکێشا. نەختێ تەماشای ئەملاوئەولای خۆمم کرد. لەبەر خۆمەوە، بایی ئەوەی سەگەکان گوێیان لێم بێ، گوتم: «تۆ بڵێی ئەم گوندە نانی تێدا نەبێ! ئەی پێخەف؟ ئەگەر ئێوە ڕێم نەدەن بڕۆم، ئەمشەو چۆنی بگوزەرێنین، ها؟! خۆ منیش وەک ئێوە برسیمە و شەویش وەک ئێوە سەرمام دەبێ. تەگبیرمان چییە؟» خۆزگە وەڵامێکیان دەدامەوە. وەڵام نادەنەوە. گەورەیی سەگ لەوەدایە

هەزاران ساڵە لەگەڵ مرۆڤدا دەژی و نەبوو بە مرۆڤ. مرۆ فێرە وەڕین بوو و بیەوێ دەشڵووڕێنێ، بەڵام سەگ یەک وشە فێر نەبوو. ئەگەر سەگ لێویشی هەبا، ڕەنگە فێرە قسە نەبا. سەگ بە هۆی بێلێوییەوە، فیکەش لێنادا... باپیرم دەیگوت: «فیکە بە برای بێلێو مەکە!» سەگ برای بێلێوی مرۆڤە!
تا ڕادەیەک ترسم شکابوو و جاروبار تەماشای گەماڵە سەرزلەکەم دەکرد. چی دی نەیدەمڕاندەوە. تەنانەت دەمیشی دابچڕی و باوێشکێکی دا و زمانی کەوانەیەکی نیوەبازنەیی پێکهێنا. دەمی هێند گەورە بوو، جێی سەرمی تێدا دەبووەوە. ئیتر تەواو دڵنیا بووم. نا، ئەم سەگانە زەرەریان بۆم نابێ.
وەک ئەوەی فیلمی بەرەواژ بم و بە پێی پلان لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتا لێبدرێمەوە، ڕاستبوومەوە و چوارمشقی دانیشتم. ئەوجا کەوتمە سەر چنچکان. پشتم بە دیوارەکەدا خشاند. بە کاوەخۆ پشتم پێیدا خشاند. وردە وردە ئەژنۆم ڕاست دەکردنەوە تا قیت بەرانبەر سەگەکان ڕاوەستام. لە ماوەی بەسەرچوونی فیلمە بەرەواژەکەدا، بەردەوام قسەم دەکرد. گوێم لە سێ مڕەمڕ بوو بەڵام ترسناک نەبوون و چ کەڵبەم پیشان نەدرا. گورج دانیشتمەوە. دیسان هەستامەوە. هیچ مڕەمڕ نەبوو. بە دەنگی بەرز پێکەنیم. هەندێ لە سەگەکان لمۆزیان خستبووە سەر دەستیان. سەرزلەکە، لە سەر زگ کەوتبوو و سەری قیت ڕاگرتبوو بەڵام جاروبار چاوی دەنووقاند. بە هۆی ئەو خاڵە ڕەشەی دەوری چاوی چەپیەوە، لە بەر چاووم بە مۆشی دایان دەچوو... خۆزگە هەزار (مۆشی)مان دەبوو! ئەم (مۆشی)یە مەملەکەتی خۆی جێ ناهێڵێ و مۆشییەکەی تر سەرباز و خەڵکەکەی خۆی جێنەدەهێشت.
بەرەو لای چەپ هەنگاوێکم نا و بە باوەڕبەخۆبوونەوە گوتم: «کوچ کوچ کوچ... وەرن دەی! کوچ کوچ کوچ جەرگەکانم وەرن دەی!». ئاوڕم دایەوە. هەموو سەگەکان تەماشایان دەکردم، بەڵام دوودڵ

بوون. تەماشایان دەکرم و ڕاست نەدەبوونەوە. دیسان بانگم کردن. چ نەبزوان، بەڵام یەک دوو مرەمرەیان کرد. لە چاویان بزر بووم. نەختێ ترسام دیسان بێنەوە سەرم. لە ترسان، لە شوێنە نادیارەکەمەوە بانگم کردن... بە دەنگی بەرز بانگم کردن. دەتگوت لێیان بێمنەتم و ئەوان کاریان بە منە. بانگم کرد: کوچ کوچ کوچ!...» کە ئاوڕی دواوەم دایەوە، سەگە چاوڕەشە سەرزلەکەم بە دواوە بوو. نەخێر، یەک یەک و دوو دوو، ئەوانی تریش هاتن. گەیشتنە نزیکم و کەوتنە کلکەلەقێ. لای شانی چەپمەوە، دیواری حەوشەی ماڵێک ڕووخابوو و دەرگا چینکۆکەش تێکشکابوو و کەوتبووە بن خشتەکانەوە. بە سەر خشتەکاندا چوومە دیوی حەوشەوە. یەکێ لە سەگەکان، بە دوودڵییەوە مراندییەوە. بیرم بۆ ئەوە چوو کە ئەو سەگە نانی ئەو ماڵەی خواردبێ... یا سەگی ئەو ماڵە بێ. بەڵام هەڕەشەکەی بە ساردییەوە بوو. منیش کوچ کوچم لێ کردنەوە. سەگەکان، یەک یەک و دوو دوو بە دوامدا هاتن. سەگە سەر زلەکە، کە لە خەیاڵی خۆمدا بە سەگێکی خانەدانم دەزانی، پێشم کەوت و کەوتە هەڵکۆڵینی بنی هەندێ خشت. گوتم: «دە وا بڵێ ماڵوێران! ئێرە نانی لێیە! لێرە بژێو هەیە، بژێو!». ئەوەم گوت و دەستم بە سەری سەگەکەدا هێنا. هیچ کاردانەوەی نەبوو. لەولاترەوە، دیرەگێک، سەرێکی بە بان دیوارەکەوە بوو و سەرەکەی تری، لە بن خۆڵ و بەردەوە، لە سەر زەوی بوو. هەوڵم دا لای بەرم. جێی سەرم لە نێوان دیوارەکە و دیرەگەکەدا کردەوە و ڕوانیمە ژوورەوە: هەشت نۆ دیرەگی تر سەریان لە زەوی بوو. تاخمی چایە و نان و سینی و سەرین و لباد... هەر یەکە و چمکێکی یا نەختێکی دیار بوو. سینییەکە پڕ بوو لە خۆڵ و خاشاک. هەرچۆنێ بوو، خۆڵ و خاشاکی سەر دیرەگەکەم بە ئاسانی لادا و خۆم پێدا کرد. نان بەشی هەموومانی دەکرد. کە دەستم بۆ نانەکە برد، چوار پێنج مشک، هەر یەکە و بە لایەکدا دەرپەڕی. لە کەلەبەرەکەوە، نانم بۆ سەگەکان دەهاویشتە دەرەوە. نانەکان ڕەق

بوون و زۆری ورد ببوو. سەگەکان نانەکانیان بە خرمەخرم دەخوارد. منیش کەوتمە خرمەخرمی نانخوارد. بەرماوەی مشکەکانمان دەخوارد... نا، من و سەگەکان پاشماوەی ئەنفالمان دەخوارد. من و سەگەکان، نانی ماڵێکمان دەخوارد بە گەرووی ئەنفالدا چووبوون. جێپەنجەی کەیبانۆی ماڵەکە بە هەندێ لە نانەکانەوە دیار بوون. جێپەنجەکان نەختێ زیاتر برژابوون. هەندێ نانم لەگەڵ خۆمدا دەرکردە دەرەوە و چوومە لای سەگەکان. هەر جارە و کەرتێکم دەدایە یەکێکیان و خۆشم بەردەوام دەمخوارد. سەگ نانی بدەیتێ لە بیرت ناکا. وەک مرۆڤ نییە کە چاکەت لەگەڵیدا کرد، پێتەوە بدا. نانم دەخوارد و بیرم لە پەنجەی کەیبانۆکە دەکردەوە: پەنجەی درێژ و باریک و بەخەنە... کچێکی شەرمنی باریکەلە و کەڵەگەت. چاوێکی لە تەنوورەکەیە و چاوێکی لە دەرگای حەوشەیە! ڕوخساری لە بەر هەڵاوی ئاگری تەنوورەکە، سوور هەڵگەڕاوە.

ترس نەما. برسێتی نەما. پشوویەکی باشم دا. خۆر، وردە وردە بەرەو ئاوابوون دادەکشا. هەستم بە ماندوێتی دەکرد و کە ترسم نەما، خەریک بوو خەو دامگرێ. نەختێ سووڕامەوە، شوێنێکم بەر چاو نەکەوت لەو خانووەی نانەکەیانم خوارد، بۆ حەسانەوە گونجاو تر بێ. خۆم پێدا کرد. هەرچۆنێ بێ جێیەکم بۆ خۆم کردەوە. جێیەکی پاشایانە. ڕایەخ و سەرین و جاجم. لێی ڕاکشام. زۆری نەبرد، یەکێ لە سەگەکان خۆی پێداکرد. نەخێر یەکێکی تر و یەکێ کی تر. هەموویان لە دەورم گرد بوونەوە. پێ دەچوو من تاکە پشت و پەنایان بم. منیش بە بێترس ڕاکشام.. یەکێ لە سەگەکان، سەری خستە سەر ڕانم. زۆری نەبرد، یەکێکی تریان سەری خستە سەر زگم. لە ئەنجامدا، دەورووبەرم بە سەگ تەندرا. ئەو سەگانەی دەیانویست لەتوپەتم بکەن، گەرمیان دەکردمەوە. بێباکانە دەستم بە سەریاندا دەهێنا و دەمدواندن. دەتگوت من تاکە بەشەری دنیام و لە من بەولاوە کەسیان دەست ناکەوێ بیکەن

بە سەرکردەی خۆیان. نازانم کەی و چۆن خەوم لێ کەوت، بەڵام خەوێکی خۆش لەگەڵ سەگەکاندا، تا بەرەبەیان خەوتم.

* * *

لە گەڕانەوەدا، ڕێگام هەر بەو گوندەدا دەهاتەوە کە ببوو بە مەملەکەتی سەگ. ئەو ڕێیەی لە خوار دێیەکەشەوە دەهاتە گوندەکەوە، هەر وەکو ڕێیەکەی سەرەوە بە پێچ بوو، بەڵام بە سەر جۆگە ئاوێکدا و بە ناو هەندێ شۆڕەبیدا تێدەپەڕی و بە دەوری گردۆلگەیەکدا، بەرەو سەرەوە لار دەبووەوە. هێشتا زۆرم مابوو بگەم، گوێم لە حەپەی سەگەکان بوو. نەختێ ترس دایگرتم بەڵام دڵنیاییم زیاتر بوو. بە گورجی بەرەو پێشەوە هەنگاوم دەنا و بە سەر بەردەبازێکی گەورەدا، کە لە ناوەڕاستی جۆگەکە داندرابوو، بازم دا. سەگەکان بەرەو ڕووم دەهاتن بەڵام زۆر بەکاوەخۆ بوون. جاروبارێ دەحەپین و یەک دوو جاریش مڕاندیانەوە. ئیدی بە کلکلەقاندن ڕووی دۆستایەتییان دەردەخست. سەگ بە کلکیشی دەریدەخا دۆستتە یا دوژمن.

سەرنجم دا، سەگەکان لمۆزیان خوێناوی بوو. بەرەو لایان چووم و ئەوانیش کەوتنە کلکەلەقێ. هیچ نەوەڕین. دەڵێکیان هات و نەختێ خۆی لێم هەڵسوو. سەرم لەو خوێنە سوڕمابوو... وای بۆ دەچووم کەرێکی بەرەڵا یا مانگایەکیان کوشتبێ. ئەوە هەنگاوی یەکەمیان بوو بەرەو دڕندایەتی. بە دەم ڕێیەکەوە، لەگەڵمدا بەرەو ناو دێیە ڕووخاوەکە، بە پێچەکەدا سەرکەوتن. هێشتا نەگەیشتبوومە یەکەم خانووی ڕووخاوی خوار دێیەکە، زەلامێکی زگهەڵدڕاووم بینی، هەر لە دەم ڕێیەکە پاڵ کەوتبوو و دوو سەگیش سەریان تێ ژەنیبوو. وەک ئەوەی لە بیرم چووبێ ئەو سەگانە بوونەتە دڕندە، دەستم دایە بەردێک و بۆ دوو سەگەکەم هاویشت و بۆیان چووم. ئەوانیش زەلامەکەیان بەجێ هێشت و دوور کەوتنەوە. ڕێخەڵۆک و ناوزگی پیاوەکە هێشتا هەڵاوی لێ هەڵدەستا و هەندێکی هەڵڕژابووە ناوگەڵیەوە. پیاوێک بوو،

تەمەنی لە دەورووبەری شەستساڵیدا دەبوو... کەمێ زیاتر یا کەمتر. لاملی هەڵبڕابوو و لە هەندێ شوێنی باسکی، ئێسکە سپییەکەی بە دەرەوە بوو. ویستم تەرمەکە دوور بخەمەوە. بەڵام لە هەرکوێی ڕادەمام دەتگوت مینێکە و هەر دەستم پێی بگا دەتەقێتەوە. تەماشای هەردوو دەستی خۆمم کرد: ئەم دوو دەستە، نە خاکەنازن نە قازمە و نە دەمی شۆڤڵ. چۆن گۆڕێکی بۆ هەڵکەنم؟ لە ناخی بێئاگاییەوە بڕیارم دا وازی لێ بێنم. سەگەکان ئەو زەلامەیان ڕووت کردبۆوە. ئەوەی بە بەریەوە مابوو پزووی شەرواڵەکەی بوو بە دەوری کەمەریەوە... سەرم لێ شێوا بوو... لە بەر خۆمەوە دەمگوت: ئەمە لە زمانی سەگی نەزانیوە! لە ترساندا چاوی زەق بوونەتەوە و سەگەکانیش بە هەڕەشەیان زانیوە. هاواری کردووە و ئەمانیش بە وەڕین تێگەیشتوون. ئەمە، نە خۆی سەگناس بووە، نە باپیرێکی سەگناسی هەبووە!

من بە دیار تەرمەکەوە سەرسام وەستابووم، سەگەکان کەوتنە نووزە نووز و هەموویان گوێقوڵاغ بوونەوە. دەمزانی سەگ گوێی سووکە و دەنگەکان لێک جیادەکاتەوە... دەنگێ دڵیان خۆش بکا، وەڕینێکی کورت دەوەڕن و کلک بادەدەن. دەنگێکیش مەترسی تێدا بێ، وایان لێ دەکا بقروسکێنن و نەختێ بە دەوری خۆیاندا بخولێنەوە، ئەوجا ڕێی دەربازبوون بگرنە بەر. ئەمانە دەیانقروسکاند. کتوپڕ، بەرەو ناو شیوەکە تێیانتەقاند. منیش، بێ ئەوەی هیچم بیستبێ، بەرەو ناو دێیەکە بە پەلە ڕۆیشتم و خۆم کرد بە یەکەم خانووی ڕووخاودا. نەختێ چاووم گێڕا. شتێکی وەک کولانە، یا کوندەڵانم بەرچاو کەوت کە لادیوارێکی بە سەردا ڕووخابوو. خۆم پێیدا کرد. کولانەی مریشک نەبوو... کولانەی سەگیش نەبوو. کولانەی مریشک، مەگەر بە یەک ساڵ دەنا بۆنی نابڕێ. بۆنی تایبەتی مریشک بەری نادا. من بیرم لەو جێیە دەکردەوە، گورەگورێک پەیدابوو... گورەگورەکە، تا دەهات ئاشکراتر دەبیسترا... کۆپتەر بوو و پێدەچوو گوندە ڕووخاوەکان بەسەر بکاتەوە. ڕەنگە بۆ

ڕاوەمامر هاتبێ، ئەگەرچی سەگ مامریان نەهێشتبوو... لەو ماوەیەدا، سەگ ببوونەوە بە گۆشتخۆر و گەڕابوونەوە سەر خەسڵەتی دڕندەیی... ببوونەوە بە گورگی مەترسیدار. جاران، سەگ بە لەتەنانێک دادەکەوت. هەندێ ماڵی مەڕدار سەپکیان بۆ سەگەکانیان دەکرد. سەپک، هەر بە سەموونی سەربازی دەچوو... سەگ وایان لێ هاتبوو، دوور نەبوو تەڕەش بخۆن. نان و برنجی بەرماوە و تەماتەوبامیەشیان دەخوارد. ئێستا سەگی ئەو گوندە چۆڵانە ببوونەوە بە گۆشتخۆر... گۆشتی کاڵ. ئەو سەگانە، تامی گۆشتی کاڵ و خوێنی گەرمیان کردبوو و ئاسان نەبوو دەستبەرداری بن. چۆن دەبنەوە بە سەگەکانی جاران؟! چۆن جارێکی تر بە سەپک و بەرماوەی خاوەنیان دادەکەون؟! بۆنی خوێنی گەرم و گۆشتی کاڵ، غەریزەی هازاران ساڵی پێشتری لێ زندوو کردبوونەوە.

کۆپتەرەکە نزیک بووەوە. نەخێر، هاتە سەر گوندەکە، بەڵام لە منەوە دیار نەبوو. بە بیرمدا هات: نامبینن، بەڵام نەکا سەگیان بۆ دۆزینەوەی بەشەر هێنابێ و بێتە بەر کونەکە و ئاشکرام بکا. سەگ چ مەتەڵێکە! هەستم دەکرد، کۆپتەرەکە بە بان سەرمەوەیە، بەڵام جووڵەم لە خۆم بڕیبوو. ماوەی سیی چرکە دەبوو بە دیارمەوە بوو، بەڵام هەر چرکەیەکم لێ ببوو بە ساڵێک. سیی ساڵ بە دیار سەرمەوە بوو... دەنگێکی ناخۆش و بایەکی بەهێز و ترسێکی کوشندە! ئەمە ڕاوە بەشەرە... نا، ڕاوی منیان دەکرد. دوور نەبوو بمگرن و بمبەنە ئاسمان و لەوێوە تووڕم بدەنە خوارەوە. کە مرۆ بوو بە نێچیر ئیتر قەڵەمی دەستوپێی دەشکێ. لە بنی بنەوە خۆم تەقەت کردبوو و ناوی خوام دەهێنا و دەترسام ئەوانیش بۆ دۆزینەوەم ناوی خوا بێنن. نەمدەزانی لە ئەنجامدا خوا لەگەڵ مندا دەبێ یا ئەوان؟ گرەگری باڵەکانی و هاژە و وژەی بایەکە و تەپوتۆز نەدەبڕانەوە. ناو کولانەکەش، کە پێم وابێ کۆنەکوندەلان بوو، بۆنی خۆڵ و تۆزی پێ دەگەیشت. نازانم چی لەو گوندەدا مابوو وێرانی

بکەن. ئەوەی مابوو ئەو کولانەیە و هەندێ لادیوار بوو و کولانەکەش کەوتبووە بن خشت و خۆڵەوە و لێیانەوە دیار نەبوو. هیچی تر بە پێوە نەمابوو. ئای چەندم پێ خۆش بوو بێمنەت لە کونەکە بچمە دەرێ و پێیان بڵێم: خۆتان ماندوو مەکەن، هیچ نەماوە وێرانی بکەن! پێم خۆش بوو پێیان بڵێم: تەماشای ئەو زەلامە زگدڕاوە بکەن، ئیتر دەزانن کەس لەم گوندە ناحەوێتەوە!

بەڵام ئەوانە هی ئەوە نەبوون ڕێنمایی بکرێن... خۆیان بە هەق و ڕاست و عاقڵ و زانا و لێهاتوو دەزانی و خۆیان لە سەرووی بەشەرەوە دەدیت و هەڵبژاردەی خوا بوون. کەڵکیان نەبوو. هەر ئەم داروودەستەیە، سەرۆکی زانکۆیەکیان بەند کردبوو و ئەشکەنجەیان دەدا. وەک ولاغ خستبوویانە سەر چوارپەل و بۆینباغەکەیان بۆ کردبوو بە ڕێشمە و سواری پشتی دەبوون و هەتەهەتەیان لێی دەکرد. لە ماوەی دوو سێ مانگدا، شێتیان کرد، ئەوجا کوشتیان... دەیانویست ئاوها جەماوەرێک دروست بکەن جوولەکە بهاوێتە زەریاوە و فەلەستینێکی وەک خۆیان پێکبێنن، فەلەستینێک بەشەر تیایدا لە سەر چوارپەل بڕوا. خۆ هەموو کەس لە بواری زانستدا هەڵناکەوێ ببێ بە سەرۆکی زانکۆ، بەڵام هەموو ناکەسێک بۆی هەیە ببێ بە پیاوکوژ و بە کۆپتەرەوە ڕاوی مرۆ بکا. ئەمانە، ئەم فەلسەفەیەیان تفاندۆتە ناو دەمی بەرهەڵستکارانی خۆشیانەوە. بەرهەڵستکارەکانیشیان وەک ئەوانیان لێ هاتووە و بەهای بەرزیان گوللەیە. گرنگ ئەوەیە گوللەکانیان گۆشتی مرۆ بسمێ و چزە لە هەناوی هەستێنێ... وەک کەڵبەی سەگەکان، لە گۆشت و خوێن بچەقێ...

گرەگرِ هەر نەدەبڕایەوە. دەتوانین یەک سەعات بە سەر شەست دەقیقەدا دابەش بکەین. دەتوانین یەک دەقیقە بە سەر شەست چرکەدا دابەش بکەین. دەتوانین چرکەش بە سەر شەست شتی تردا دابەش بکەین و ئەو شتەش بە سەر شەست شتی تری لەخۆی بچووکتردا دابەش بکەین،

تا کات بێکۆتایی بێ و منیش لەو کونە دەرنەچم و چاوەڕوانی مەرگی خۆم بم. ئەو چرکانە بۆ وا درێژ دەبوونەوە؟! ئەم ڕۆحەی من بۆچی جەستەی جێنەدەهێشتم؟. ئەو سەگانە، بۆ وەک ئەو کابرا پزوولەبەرە زگدڕاوەیان لێ نەکردم؟ من باجی مانەوەم دەدا و باجەکەش زۆر گران بوو، زۆر. ئاخر ترسی مەرگ زۆر لە مەرگ ناخۆشترە!
لە ناو گورەگوڕ و وڕەی بادا گوێم لە دەنگی بنیادەم دەبوو بەڵام نەمزانی چی دەگوت. نەمزانی بە چ زمانێک دەدوا. ئەو دەنگە بکوژی من بوو و لە مڕەمڕەی سەگەکان ترسناکتر بوو. ئەو فەرمانی مۆرکراوی کوشتنی منی پێ بوو، ئیتر هەرکێ دەبێ با بێ! خۆ سەگەکانیش وەکو ئەو فەرمانی کوشتنی منیان پێ بوو بەڵام ئەوان بوون بە هاوڕێم...
سەگ کەسایەتی خۆی هەیە و دەزانێ لەگەڵ کێدا ڕووبەڕووە، بەڵام ئەمانە نازانن.
لە ئەنجامدا کۆپتەرەکە دوور کەوتەوە. کتوپڕ وەها دەنگی بڕا، دەتگوت کوژاوەتەوە. نا، من وام هەست دەکرد کتوپڕ بوو. کە دەوروبەرم کپ بوو، گوێم هەڵخست... دەترسام چەکداری دابەزاندبێ. من هەر لە کونەکە مامەوە. ماوەیەکی زۆر مامەوە و چینێ عارەقەم دەردابوو. ڕەنگە جواناوی مەرگ بووبێ نەک عارەقە. دنیا ئەوەندە کپ و خامۆش بوو، گوێم لە خوێنبەرەکانی ناو سەرم دەبوو.. وژژژ... وژژژ... وژژژ....
کتوپڕ گوێم لە حەپەی سەگ بوو. ئیتر هەستم بە ئاوەدانی کرد. گیانلەبەرێ ترم لەگەڵدابوون... ئەو گیاندارانە، کاتی خۆی بە سەپک دەژیان کەچی ئێستا بوونەتەوە بە گۆشتخۆر. گەماڵە سەرزلەکە، هاتە بەر کونەکە. هەر دەتگوت پێم دەڵێ: وەرە دەرەوە ڕۆیشتن! مڕەمڕەکەی وای دەگەیاند. نووکی لمۆزە ڕەشەکەی دەسووڕاند. دەتگوت تێمدەگەیەنێ کە بە بۆن شوێنەکەمی دۆزیوەتەوە. من کە دەرنەچووم، ئەویش سەرە زلەکەی و دەمولەوسە خوێناویەکەی لە سەر دەستی دانا و بەرانبەر کونەکە وەرکەوت. دە تۆ سەیری ئەو سەگە! هەر ئەمڕۆ

زەلامێکی لەتوپەت کردووە و ویژدانیشی ئازاری نادا! هەر دەڵێی هیچ نەقەوماوە!! تۆ بڵێی بەشەری مرۆکوژیش وا نەبێ؟!
دوای ئەوەی دڵنیابووم کەس لەو ناوە نەماوە و ئەگەر هەبوایە ئەو سەگە نەدەهات، منیش بە زگەخشکێ، بەڵام پاشەوپاش هاتمە دەرێ و نەختێ خۆم تەکاند. چاووم لە چاوی سەگەکە بڕی و گوتم: «ها... سەلامەت بوون؟! ئا ئا سەلامەتن. خۆ تەقە نەکرا. ئەی پێم بڵێ بۆچی واتان لەو پیاوە کرد؟! جا هەر ئەوە مابوو ئەوەی لە دەستی ئەوان دەرباز دەبێ، ئێوە ورگی بدڕن! لە ئاسمان کۆپتەر و لە زەوی سەگ!».
ئەو سەگە مرۆخۆرانە، ببوون بە هۆی سوکنایی من. کۆپتەر بهاتبا، ئەوان زۆر لە پێش مندا هەستیان پێ دەکرد و ڕاستەوخۆ ئاگاداریان دەکردمەوە. لە ڕاستیدا، پاسەوانگەلێ بوون کە نەیاندەزانی خیانەت چییە. پارەی دنیا ڕەوشتی تێکنەدەدان. بەڵام هەر دەبوو جێیان بهێڵم و بڕۆم. بڕۆم بۆ ناو ئەو بەشەرانەی کە هەندێکیان بۆ دەربازبوونی خۆیان، نەک هەر هاوڕێی خۆیان، بەڵکو بابی خۆشیان بە دەستەوە دەدا. دەبوو بڕۆم بۆ ململانێی خیانەتکردن... نەیخۆم دەمخوا... نەیکوژم دەمکوژێ... نەیدەم بە دەستەوە، دەمدا بە دەستەوە... با بڕۆم... با بڕۆم بەرەو گلاوبوون... من چۆن لە مەملکەتی سەگەکاندا، لەگەڵ (مۆشی)یەکی دڵسۆزدا هەڵدەکەم؟! من فێرم دەستخەڕۆ بکرێم..

# پاشماوەی گرانی

دوای بەسەرچوونی گرانی، بووژابۆوە، بەڵام دێوەزمەی برسێتی، هەمیشە بە دیار سەریەوە بوو. ڕەنجبەرەکەی، لە برساندا نەخۆش کەوت و شوانەکەی دەرکرد، چونکە فەریکە جۆی خواردبوو. پێی گوت: «ئەو زەرەرەی تۆ لە جۆیەکەت داوە، یەک گاگەل لێی نادا... ئەو جۆیە خوراوە دەخەمە بەر شەرتە شوانییەکەت!. کڵاشەکان و فەرەنجییەکەش دانێ... شوانەتی بە نەهەنگی وەکو تۆ ناکرێ!». قادر پاشماوەی گرانی بوو:

چەند ڕۆژ بوو؟... خۆشی نەیدەزانی چەند ڕۆژ بوو زاد بە قورگیدا ئاودیو نەببوو. ئەو جۆگایەی بەرەو ئاوایی دەهات و جاران کووزەڵە و پونگە هەردوو لایان داپۆشیبوو، بەینێ بوو تا سەرچاوەکەی ڕووت ببۆوە و قرژاڵ و بۆق، کەوتبوونە ئەو گۆڕە و ببوون بە نێچیری برسییەکانی گرانی. پەلک و ڕەگی گیاوگۆڵ نەمابوو تاقی نەکاتەوە، بەڵام برسێتی، تا دەهات دەبوو بە دێو و بە دار و بەردیدا دەدا. برسێتی، لە مرۆڤایەتی ڕووتی دەکردەوە. برسێتی ئاراستەی دەکرد و ئاراستەی دەگۆڕی و هێنابوویە بەر دەرگاکەی بایز. کەنگر و تۆڵەکە و هەپڵۆک و پیشۆک،

برسێتییان زیاتر دەکرد. چەندی لێ دەخواردن، برسیتر دەبوو. ئەو، نانی دەویست، نان!. ئەو، شتێکی دەویست، پێیان دەگوت زاد!. کولێرەی گەرم، لەودیوی خەیاڵەوە بوو. بیرکردنەوە لە کولێرە، هێندەی ماچ و راموسینی ژنان حەرام بوو، بەڵام قادر سنووری دەبەزاند: بە دەستی خانمێکی دووکەڵاوی، لە تەنوورەکە دێتە دەرێ... یەکسەر و بێ دواکەوتن و بێ ئەوەی سەیری چاوە برسییە بێشەرمەکانت بکا، بەرەو ڕووت بەرز دەبێتەوە و پێش ئەوەی دەستت پێی بگا، بۆنەکەی مەستت دەکا. یەکەم تیکە، نەختێ دەمت دەسووتێنێ. دووەم تیکە، سووتاوەکە تیمار دەکا. سێیەم تیکە، دەتکاتەوە بە بەشەرێکی ئابڕوومەند و پیاوی ناو پیاوان. لە چوارەم تیکەیاندا، پاشای سەر تەختیت و کەس شان لە شانت نادا!.
ئەو کولێرەیە لە کوێ حەشار دراوە؟!. تورکە تێکشکاوەکان بردیان. ئەوان، کاتێ لە قەنتەرەکەوە بەژوور کەوتن، شیشێکیان کرد بە بنی دیوارەکەدا. چۆن زانییان ئەو جێیە چاڵەگەنمە؟. داتەپیبوو؟!. سواخ ..ەی تازە بوو؟!. پێیان گوتبوون یا وەک سەگ بۆنیان کرد؟! شیشەکە، وەک ئەوەی بە گۆشتدا بچێ، خرزەی هات. ئەو خرزەیە، دەنگێکی جەرگبڕ بوو... هەواڵی مەرگ بوو. بەو خرزەیە، زەوی تووشی خوێنبەربوونی گەنم بوو. دەبوو زەوی بەو خوێنبەربوونە بمردبا. هاواری لە هاوڕێکانی کرد: «گیەلن.. بوردە بوغدە وار!»... ڕاستی کرد. ئەوێ گەنمی لێبوو!. لەوێ، چوار جەواڵ گەنم خرابووە چاڵەوە و بە کا، یاپی کرابوو.
وای لەو هەواڵە! بۆ تورکە تێکشکاوەکان، دۆزینەوەی سامانێ بوو. بۆ ماڵی قادر، ناشتنی تەرمی خۆیان و ئەو منداڵانە بوو، کە دواتر، یەک بە دوای یەکدا مردن.
برسێتی، کە دەگەیشتە ئەوەی بیانکوژێ، ئیدی سەری خۆی هەڵدەگرت و وازی لێ دەهێنان. لە دەمەدەمی مەرگدا، ئەوەی لە بیریان نەبوو نان بوو. خەوێکی قورس دایدەگرتن و حەزیان لە ئامێزی دایکیان دەبوو... ئەگەر بۆ نانخواردنیش بانگ کرابان، نەیاندەویست سەر هەڵبڕن. نەک بۆنکڕووز،

بۆنی کولێرەش بەئاگای نەدەهێنانەوە. تەنانەت مەلای گوندەکەش نەیدەزانی خوا پاڵپشتی کێیە! تورکە برسییە نێزەبەدەستە تێکشکاوەکان، یا برسییەکانی گوندەکە!. جارێکیان لە داخاندا گوتی: «خوا لەگەڵ نێزەبەدەستە، نەک منداڵ و ژنی برسی و خاوەنی چاڵەگەنم!».

لە بەر دەرگاکە چاوەڕوان بوو. نە ڕووی هەبوو ئاودیو بێ، نە برسێتی ڕێی گەڕانەوەی دەدا. وەک سنگ، لە نێوان دێوی برسێتی و شکۆی ئابڕوویدا چەقیبوو. بەڵام ئابڕوو، لە بەر هەڵاوی برسێتی، وەک بەفر، لەبەرەوە دەتوایەوە و بە تەوێڵیدا چۆڕاوگەی دەبەست. لە پەنجەی پێی خۆی ڕامابوو. پێی چڵکن و پان بوون. حەزی دەکرد لەو پەنجە پیسانەوە ڕەگ دەربکا و خۆراک لە زەوییەوە هەڵمژێ. وەک درەخت. دەتگوت پێی، دوو شەپکەدارن و بە جەستەیەوە داکوتراوون. بە ئاستەم هەستی بە بوونیان دەکرد. گەدەی، پاشای بێ ڕکابەری جەستە و هۆشی بوو. گەدەی، قیبلەنومای ئاینی بوو. کولێرە، کەعبەی بوو... بەینێ بوو کولێرە، پەڕەیەکی لە قورعان زیاتر بوو. ماوەیەک بوو نان، شتێ بوو، حوری نەیخواردبا حیز دەبوو. کولێرە... ساوەر... دانەوێڵە... برۆێش... ئەوانە بێچووی حەڵاڵزادەی گەنم بوون. ئەوانە مەزەب بوون و سوێندیان پێ دەخورا و تەڵاقیان پێ دەکەوت و چاک دەکرایەوە. برسێتی، خەڵکی ناوچەکەی دروێنە دەکرد... برسێتی، ئاگرێک بوو و لە ژیانی خەڵکەکە بەر ببوو و بێ ماندووبوون، گەورە و بچووکی دەسووتاند.

هەر وا، لە بەر دەرگاکە وەستابوو. بایزۆکی جاران و بایز بەگی تازە، هاتە دەرەوە و بەرانبەری وەستا: سپێنەی چاوی سوور بوون. برۆکانی بژ و درێژ بوون و هەر یەکە و یەک دوو تاڵی سپییان تێکەوتبوو. ڕدێنە قەڵەمکراوەکەی ماشوبرنج بوو. کیسە تووتنەکەی لە بەر پشتی کردەوە و وەک ئەوەی تازە لە خواردنی تێگوشەی سەروپێ بووبێتەوە، لایەکی کیسەکەی بە سمێڵ و لێویدا هێنا. تەماشایەکی کرد و بزە بە چاویەوە دیار بوو: بزەی چاو، وەک بزەی لێو نییە. بزەی چاو، هەزار فێڵ و تەڵە

و داو و کەمینی تێدان. بزەی چاوی سووری بن جووتە برۆی بژی پیاوی تێرخواردە، وەک ئەوەیە دوای ژەمێکی چەور، میزی بە بەرماوەکەیدا کردبێ. کە توانای خواردنی نەمێنێ، وای بشێوێنێ، بە هیچ سەگێکی برسی نەخورێ!.

- ها قادر! خێرە؟!. ئەوە بۆچ تۆش وەک ئەو عالەمە نەچوویتەتە دەشتودەر؟! بچۆ بەڵکو کەنگرێ، پیشۆکێ یا هەر خۆراکێک ئەو خاکە دەیدا، کۆی کەیتەوە!.

لە بری وەڵام، نووزەیەکی لێوە هات. خۆشی نەیزانی چ دەڵێ. برسێتی ڕێی گەڕانەوەی بدابا، یەکسەر دەگەڕایەوە. بایز، کە وەڵامی نەدرایەوە، گوتی:

- بچۆ، تۆش بچۆ!... سەری بێڕزق لە بن گڵەوەیە.

ئەوەی گوت و پشتی تێکرد. دوو سێ هەنگاوی نا و ئاوڕێکی دایەوە. گوتی: «ئەمرۆ کەس نەمردووە؟».

بە دەنگێکی نەوی، هەر ئەوە بوو دەبیسترا، گوتی: با. منداڵێکی ئێمە مرد. فاتەی حەوت ساڵەمان مرد. پوورە هەمینیش مرد و کەس نییە بینێژێ. مام ڕەحمان، ئەوەندەی ناشت، پەکی گەوتووە. ئەویش برسی و ماندووە...

مام ڕەحمان، لەملاوە زەوییەکەی نووکەڕووشە دەکرد و مردووی دەناشتن، لەولاوە سەگ تەرمەکانی دەردەهێنانەوە. ئاخر ئەویش هیچی نەمابوو بیخوا.

بزە فێڵاوییەکەی چاوی بایز بەگ، پەڕییە سەر لێوی. بەرەو لای گەڕایەوە. بە کاوەخۆ گوتی: «سێ کولێرە. خاتەی خوشکت بنێرە، با پەچەی مەڕەکان بماڵێ و کولێرەکان لەگەڵ خۆیدا ببا».

خاتە، هەر خوا خۆی چاوی بۆ دەڕشت. برسێتی، نەختێ گەردنی درێژتر و چاوەکانی گەورەتر و پرچەکەی پرتر کردبوو. گرانی و برسێتی، تەنها بۆ خاتە ببوون بە بەربووک و بۆ زاوایەکی نادیاریان دەڕازاندەوە. گرانی

و برسێتی، بۆ کەس نا، هەر بۆ ئەو کەرەسەی جوانکاری بوون. بەڵام برسێتی، ڕێی بە کێ دەدا ئەو جوانییە ببینێ؟. خاتە چەند نازدار بووبێ، نەدەگەیشتە نازداریی کولێرەیەک. تەنها تێرخۆرەکان جوانییەکەیان دەبینی و ئەوانیش یەک دوو چاوچنۆکی بەتەمەنی وەک بایز بوون.

کە گوێی لە ناوی خاتە بوو، قرچە لە دڵیەوە هات. ناوی خاتە لە دەمی بایزەوە، واتای تایبەتی هەبوو. لە دەمی ئەوەوە، پشکۆیەک بوو و بە دڵیدا چزا، بەڵام یەکسەر ناوی کولێرەی دوای ناوی خاتە، پشکۆکەی کوژاندەوە. سێ کولێرە؟!!... یەک خاتە؟!.

هیچی نەگوت. وەرچەرخا تا بە کوێدا هاتووە، هەر بەوێدا بگەڕێتەوە. بایز لێی پرسی: «چیت گوت، قادرۆک؟؟». دیسان وەڵامی نەبوو. دەبوو نەختێکی تر برسی بێ ئەوجا وەڵام بداتەوە. دەبوو نەختێ بیر لە سێ کولێرەکە بکاتەوە، ئەوجا بڵێ: «باشە. ئێوارە دەینێرم... شەو دەینێرم، تا کەس نەیبینێ و کەس نەزانێ خۆی بە نان داوە... نا، با کەس نەزانێ من ئەو خوشکەی خۆمم بە نان دا». کولێرەی گەنمی قەندەهاری!. گەرم بێ و گوڵی کردبێ، نەک هەر خوشک، نیشتیمانێک ڕاپێچ دەکا و بە بەرۆکی خاوەن گەنمەوە هەڵیدەواسێ!.

خاتەی گەردنبەرز، کە خوا خۆی چاوی دەرشت، پێیەکی لەماڵی خۆیان بوو، پێیەکی لە ماڵی بایز بەگ. بە دەستی بەتاڵ دەڕۆیشت و بە باوەشێ نانی گەرمەوە دەگەڕایەوە. هەندێ جار بزنێکیشی لەگەڵ خۆیدا دەبردەوە. بزن بە کارەوە. بزنی گوانشۆڕی پڕ لە شیری ماڵی بایز. خاتە، بە هەر جێیەکدا دەڕۆیشت، سەگی برسی و منداڵی نیوەگیانی دوو دەکەوتن. هەمیشە بۆنی نانی لێ دەهات. بەڵام ئەوەندەی بە برسێتی نازدار بوو، بە تێری.وا نەبوو. هەرگیز لەبیری نەدەچوو چ باجێکی داوە. دوای بەسەرچوونی گرانیش هەر لە بیری بوو: ئەو، پەلاماری نانی دەدا و

بە هەردوو دەست دەیپەستایە دەمیەوە، بایزیش دەنیشتە بەریەوە. خاتە و بایز، وەکو یەک برسییان بوون... یەک لەوی تر پەلەتری بوو تا ئاگری خۆی دامرکێنێتەوە.
قادر بووژایەوە. قەڵەشی پێی چاک ببوونەوە و کڵاشی لە پێ دەکرد. خاتە، چەند ناوقەدی ئەستوورتر دەبوو، چاوی بچووکتر و گەردنی کورتر دەبوو و ماڵەکەی قادریش، پتر پیتی تێدەکەوت. نان گۆڕا و بوو بە پاشۆلە ساوەر و داندۆک. ئەوجا بوو بە گەنم . ناوقەدی خاتەش، لەوە دەرچوو باریک بێ. خوا، دەستبەرداری ڕشتنی چاوی ببوو. قەڵەشەکانی پێی قادریش، گوازرانەوە بۆ ڕووحی و لە تەوێڵیدا ڕەنگیان دەدایەوە.
لە کاتی برسێتیدا، هەمیشە بیری لە ژیان و مانەوە دەکردەوە، بەڵام کە تێر بوو، زوو زوو بیری لە خۆکوشتن دەکردەوە. هەر کە چاوی بە خاتە دەکەوت، مەرگ بەرانبەری دەوەستا و بە دەنگی بەرز پێی دەگوت: «ئەوەتام!... من نەجاتدەری تۆم!»،
قادر ڕووی لە زەوی بوو و بەرانبەر بایز بەگ دانیشتبوو. بە شەرمێکەوە، وەک کۆیلەیەک چاکەی ئاغای لە چاو بێ، گوتی: «بایز بەگ!. ئەو خوشکەم... ئاخر خۆت دەزانی زمانی خەڵک خەنجەرە...». ئەوەی گوت و بیری .کردەوە: «خەنجەری برسێتی لە زمانی خەڵک بڕندەترە. بڕندەتر نەبوایە، خوشکم بە نان نەدەدا...».
«دە بیبڕەوە، تۆش!. ئەو خەڵکەی دەیانبینیت، دەمی نانخواردنیان هەیە نەک قسەکردن. وەک سەگ زمانیان بە لالغاویاندا شۆڕ بۆتەوە. جگە لەوەش، ئەوە مەلا و ئەوەش شەرع و مارەیی. چی ترت دەوێ؟! تێر بوویت، ها؟! لەگەڵ ئەوەشدا، باشە... دەچینە لای مەلا».
مەلا، لاکەی سەری دەهات. کەنگر ببوو بە ڕنک و بۆق قرِی تیکەوتبوو. هاودەمەکانی مەلا، کەوتبوونە خواردنی گۆشتی کەر و پشیلە. مام ڕەحمان، هێزی مردووناشتنی نەمابوو و لەگەڵ برسییەکانی تردا، دەچووە ڕاوە هەر زندەوەرێک خۆی پیشان دابا. کولێرە، دنیای بە شایەد دەگرت

و خاتەی بۆ چوار — پێنج مانگ پێشتر دەگێڕایەوە و لە بایزی مارە دەکرد. ئەگەر ئایەتی قورعان نەبوایە، مەلا لەو گرانییە دەرنەدەچوو... ملباریکی وا چۆن دەردەچوو! خوا بیکا بە قوربانی ناوقەدی خاتە و ئەو چەند ئایەت و فسکەفسکەی کە دەیزانین!.
مەلا گوتی: هەر ئێستا چوار کولێرە... دواییش یەک قزناغ گەنم. کەمتر نابێ. من لایەکی دینی خۆم بۆ داپۆشینی عەیبی ئێوە دەسووتێنم. بەوە کەمتر بێ، لێتی مارە نابڕم. شایەدیش، بە دوو کولێرە کڕەیان دەکراد. یەک «وەڵڵاهی وە بیللاهی وە تیللاهی» بە دوو کولێرە!... یەک بە دوو.



قادر ببوو بە خاوەنی بڕکەیەک مەڕ و بزن. ببوو بە خاوەنی شیر و ماست... قادر خاوەنی گەنم بوو. پەنیر و داندۆکی هەبوون. هەوری ڕەشی برسێتی، لەگەڵ بزربوونی تورک و پەیدابوونی دەمی داس و شەغرە و گێرەدا ڕەوایەوە. لە باشوورەوە، خورما و قەسپ وەک با هەڵیانکرد. لە ڕۆژهەڵاتەوە گوێز و مێوژ و بەڕوو. گەنم و خوری و مووی بزن، بەرەو باشوور دەچوون. تورک، لە ناوچەکەدا بوون بە هەڵم. کەس نەیزانی تورکە شیشبەدەستەکان کێوە چوون...
قادر، بوو بە یەکێ لە خواپێداوەکان و شانی لە شانی بایز بەگی چاوسوور دەدا. شوان و ڕەنجبەری هەبوون. گەنم و جۆی بە سوود دەدا. یەک بە دوو و هەندێ جار بە سێی دەدا، بەڵام هەرچی دەکرد، هەر پاشماوەی گرانی بوو و ترسی برسێتی بەرینەدەدا. ترسی شیشی دەستی جەندرمە لە کۆڵی نەدەبووەوە... ترسی ئەو ڕۆژانەی لە بەر دەرگاکەی بایزە چاوسوور هەڵدەتروشکا، لە دڵی دەرنەدەچوو. هەر لەبەر ئەوە بوو ڕەنجەبەر و شوانەکەی وەها برسی دەکرد، چاوی گرانییان لێ بزر نەدەبوو. شوانێکی دەرکرد، چونکە فەریکە جۆی خواردبوو. پێی گوت: «ئەگەر گاگەلێک بەرەڵای ناو جۆیەکە بوایە، ئەوەندەی زەرەر نەدەدا».
خۆی و خاتە، ئەگەرچی دەربازبووی دەستی بایز بوون، بەڵام برایندری

دەستی ئەویش بوون. چاکە و خراپەی بایز لە دوو تای تەرازوودا بوون و پێش ژەمی خواردن، تای چاکەی گران دەبوو و پاش ژەمیش، تای خراپەی قورس دەبوو. بێ ئەوەی لە لای یەکتر بیدرکێنن، بیریان لە هەمان شت دەکردەوە: چۆن برسێتیی ئەو خەڵکەی دەقۆستەوە و زەلیلی دەکردن!.

قادر بیری لەوە دەکردەوە کە برسێتی وای لێ کرد چاوپۆشی لە ناموسی خوشکەکەی بکا. خاتەش، ئەمسەر و ئەوسەری بیرکردنەوەی، هەر ئەمە بوو: «من چۆن لە برساندا پەلاماری کولیرەم دەدا، ئەویش بە هەمان برسێتی پەلاماری منی دەدا... من سەری نانم هەڵدەدایەوە، ئەو کۆشی من. کە من دادەکەوتم، ئەویش دادەکەوت... هەمیشە پێکەوە تێر دەبووین... لە گەڵ مندا دەستی پێ دەکرد و لەگەڵ مندا دەستی لێ هەڵدەگرت!».

«خوشکم. با سفڵە نەبین. ئەو پیاوە ئێمەی لە گرانییەکە دەرباز کرد».
هەر جارێ خاتە ڕقی بەرانبەر بایز دەربڕیبا، ئەگەر پێش نانخواردن بوایە، ئەوەی دەگوت. ئەگەر دوای نانخواردنیش بوایە، دەیگوت: «ئەو چاوچنۆکە برسێتی ئێمەی قۆستەوە!. بە هەموو مەزەبێک، کوشتنی حەڵاڵە». خاتە بەرانبەر هەردوو هەڵوێستەکە، بە لاچاو تەماشایەکی براکەی دەکرد و هیچی نەدەگوت. تەماشاکردنەکەی خاتە، بارانی سووکایەتی بوو و بە سەر براکەیدا دایدەکرد. خاتە، سەرقاڵی سارێژکردنەوەی برینی خۆی بوو...

بەڵام چۆن؟!... برینی خاتە بە چی سارێژ دەبوو؟!.

# ناوەرۆک